# ڕەشەبای مەرگ

## هێرشی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی

نووسینی

**سەرباز محمد حسن**

چاپی یەکەم ٢٠٢٠

کتێبی : ڕەشەبای مەرگ
هێرشی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی

نووسینی : سەرباز محمد حسن
بابەت : مێژوویی
تایپ : عبدالسلام هەولێری
نەخشەسازی بەرگ : ڕەوشت محەمەد
نەخشەسازی ناوەڕۆك : جمعه صديق كاكه
چاپی یەکەم ٢٠٢٠

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی (٨٩٣)ی ٢٠١٩ی پێدراوە.

بسم الله الرحمن الرحيم

# بەشی یەکەم

## پێشەکی

خـوای گەورە ئـێمەی مرۆڤـی دروسـت کـردوە و بەچەنـد قۆنـاغێکی تێپەڕانـدوین، ڕەوانەی سـەر زەوی کـردوین خـودی ئەو زەویەو هەمـوو ئەو گەردونەش بەچەنـد قۆناغێـك تێپەڕیـوە، هەر قۆناغێـك لەو قۆناغـانەی ئێمەی مرۆڤی پێتێپەڕیوە مەحکوم بووە بەچەند یاسایەك، هیچ کاتێکیش خوای گەورە ئەو یاسایانەی بۆ هیچ کەسێك نەشکاندوە تەنها لە کاتی مـوعجیزە بـۆ پێغەمبەرەکـانی ئەو یاسـایانەی شـکاندوە، هەروەکـو ئـاگر (ابراهیم) پێغەمبەری (على نبينا وعليه الصلاة والسلام) نەسوتاند، خوای گەورە دەفەرمێ: {وَالشَّمْسُ تَجْرِي لِمُسْتَقَرٍّ لَهَا ذَلِكَ تَقْدِيرُ الْعَزِيزِ الْعَلِيمِ (٣٨) وَالْقَمَرَ قَدَّرْنَاهُ مَنَازِلَ حَتَّى عَادَ كَالْعُرْجُونِ الْقَدِيمِ (٣٩) لَا الشَّمْسُ يَنْبَغِي لَهَا أَنْ تُدْرِكَ الْقَمَرَ وَلَا اللَّيْلُ سَابِقُ النَّهَارِ وَكُلٌّ فِي فَلَكٍ

يَسْبَحُونَ (٤٠)}[١]. خۆر دەڕوا بۆ ئەو شوێنەی فەرمانی پێکراوە تێیدا قەرار بگرێ و مانگیش هەنگاو بەهەنگاو مەنزڵێك جێدەهێڵێ بۆ مەنزڵێکی تر ڕێدەکا، نەخۆر بۆی هەیە بگا بەمانگ و نە شەویش پێش ڕۆژ دەکەوێ هەرهەموو لەو گەردوونە دەخولێنەوە.

ئینجا دەربارەی ئێمەی مرۆڤ دەفەرمێ:

{يَاأَيُّهَا النَّاسُ إِنْ كُنْتُمْ فِي رَيْبٍ مِنَ الْبَعْثِ فَإِنَّا خَلَقْنَاكُمْ مِنْ تُرَابٍ ثُمَّ مِنْ نُطْفَةٍ ثُمَّ مِنْ عَلَقَةٍ ثُمَّ مِنْ مُضْغَةٍ مُخَلَّقَةٍ وَغَيْرِ مُخَلَّقَةٍ لِنُبَيِّنَ لَكُمْ وَنُقِرُّ فِي الْأَرْحَامِ مَا نَشَاءُ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى ثُمَّ نُخْرِجُكُمْ طِفْلًا ثُمَّ لِتَبْلُغُوا أَشُدَّكُمْ وَمِنْكُمْ مَنْ يُتَوَفَّى وَمِنْكُمْ مَنْ يُرَدُّ إِلَى أَرْذَلِ الْعُمُرِ لِكَيْلَا يَعْلَمَ مِنْ بَعْدِ عِلْمٍ شَيْئًا وَتَرَى الْأَرْضَ هَامِدَةً فَإِذَا أَنْزَلْنَا عَلَيْهَا الْمَاءَ اهْتَزَّتْ وَرَبَتْ وَأَنْبَتَتْ مِنْ كُلِّ زَوْجٍ بَهِيجٍ(٥) }[٢].

هەروەها سبحانه وتعالی دەفەرمێ:

{وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنْسَانَ مِنْ سُلَالَةٍ مِنْ طِينٍ (١٢) ثُمَّ جَعَلْنَاهُ نُطْفَةً فِي قَرَارٍ مَكِينٍ (١٣) ثُمَّ خَلَقْنَا النُّطْفَةَ عَلَقَةً فَخَلَقْنَا الْعَلَقَةَ مُضْغَةً

---

[١] يس: ٣٨ — ٤٠

[٢] الحج: ٥.

فَخَلَقْنَا الْمُضْغَةَ عِظَامًا فَكَسَوْنَا الْعِظَامَ لَحْمًا ثُمَّ أَنْشَأْنَاهُ خَلْقًا آخَرَ فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ(١٤)}[1].

هەموو ئەو ئایەتانە ئاماژە بەوە دەکەن کە ئێمەی مرۆڤ بمانەوێ نەمانەوێ بەدەر لە ئیرادەو ویستی خۆمان، دەبێ بەو قۆناغانەدا تێپەڕین کە خوای گەورە جەستەی ئێمەی پێ مەحکوم کردوە، بۆیە دەتوانین بڵێن ئێمەی مرۆڤ لە ژێر دوو بازنەداین (بازنەی یەکەم) بازنەیەك کە پەیوەستە بە بوون و نەبونی ئێمە و هاتنمان بۆ سەر ئەو زەویە و قۆناغی جەستەیی کە پێی تێدەپەڕین هەر لە پشتی پیاوەوە تاوەکو ڕەحمی ئافرەت و کۆرپەلە بوون و ساوایی و گەنجێتی و جوامێری و بەتەمەن بوون و مردن و بەجێهێشتنی ئەو دونیایە هەر هەموی مەحکومی چەند یاسایەکە بەدەرن لەتوانای ئێمەی مرۆڤ، هەر لەبەر ئەوەشە خوای گەورە لێپێچینەوە لەگەڵ ئێمەی مرۆڤ ناکات لەسەر ئەوەی لەبەر چی هاتینەتە بوون و لە پشتی فلانە کەس و ڕەحمی فلانە ئافرەت چاومان بەو دونیایە هەڵێناوە، خوای گەورە لێپێچینەوەمان لەگەڵ ناکات لەسەر ڕەنگی پێست و شكڵ و سیماو جەستەمان لەبەر ئەوەی هەموو ئەوانە لەچوارچێوەی ئەو بازنەیەدان کە ئێمەی مرۆڤ تێدا هیچ دەسەلاتێکمان نەبوە، هەموو ئەوانەی باسمان کرد ئەو بازنەیەیە کە ئیرادەو ویستی ئێمەی بەسەردا نییە.

---

[1] المؤمنون: ١٢ — ١٤

(بـازنەی دووەم) ئەو بـازنەیەیە کە تێیـدا (هەڵبـژاردن) بەدەسـتخۆمانەو بەتەواوی ئـازادین خـوای گەورە لێپێچینـەوە لەگەڵ کەسێك دەکا کە زیـان بەخۆی بگەیەنێ یان زیان بە کەسێکی تر بگەیەنێ لەبەرئەوەی عەقڵێکی زۆر گەورەی بەو مرۆڤە بەخشیوە نیعمەتێکی هەندە گەورەیە ئەگەر خراپ بەکاری بێنی لێپێچینەوەت لەگەڵ دەکا، ئینجا دیسان بەتەمای ئەو عەقڵە جێـێ نەهێشـتوی، بەڵکـو پێغەمبەرانیشـی ڕەوانە کـردوە (وەحـی) ئەو پێغەمـبەرانە (صـەڵات و سـەلامی خوایـان لەسـەربێ) وەکـو تیشـکی ئەو چرایەیە کە ژوری تاریك ڕوناك دەکا و تا چاوەکان بەدروستی و تەواوی ڕەنگەکـان ببینـین، وەحی ڕۆڵـی ئەو چرایە بـۆ عەقـڵ دەبینـێ (وەحی) پێغەمبەران (صەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ) چوار چێوەیان بۆ عەقڵ دانەناوە، بەڵکو ئاڕاستەیان کردوە، ئینجا خوای گەورە چەند ئـامرازێکی بەئێمەی مـرۆڤ بەخشـیوە، کە دەتـوانین لەڕێـی دروست بەکارهێنـانی ئەو (ئامرازانە) خۆمان بپارێزین لە (جەهل، نەزانین) بۆیە دەفەرمـێ عزوجل: {وَاللَّهُ أَخْرَجَكُمْ مِنْ بُطُونِ أُمَّهَاتِكُمْ لَا تَعْلَمُونَ شَيْئًا وَجَعَلَ لَكُمُ السَّمْعَ وَالْأَبْصَارَ وَالْأَفْئِدَةَ لَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ(٧٨)}.[١]

(بیسـتن و بینـین و عەقـڵ و دڵ) ئـامرازی زۆر وردن بـۆ ڕەوانـدنەوەی جەهل و خۆپاراستن لێی.

---

[١] النحل: ٧٨

(دروست بەکارهێنانی عەقڵ) بەبێ هیچ گومانێك لەگەڵ شەریعەتی خوای گەورە ڕوو بەڕوو نابێتەوە، بەڵکو عەقڵ و شەریعەت دەبن بەو دوو باڵەی دەتبەن بەرەو ڕەزامەندی خوای گەورە و گەڕانەوە بۆ ئەو بەهەشتەی کە سەرەتا لێی هاتویین.

بڵاوبوونەوی ئێمەی مرۆڤ لەسەر ئەو زەوییە لەڕێی یاسایەکە خوای گەورە دایناوە ئەویش گەیشتنی (پیاو و ئافرەتە بەیەك) واتە: نە پیاو بەتەنها وە نە ئافرەت بەتەنها ناتوانن مرۆڤ بهێننە بوون، بەڵکو دەبێ هەردوکیان تێیدا بەشدار بن ئینجا بونی کەسێکی تری لێدەکەوێتەوە، بەڵێ خوای گەورە مرۆڤی بەبێ دایك و باوك دروست کردوە وەکو (ئادەم) علیه السلام، هەروەها مرۆڤی تەنها لەپیاو دروستکردوە وەکو (حەوا) علیها السلام هەروەها، مرۆڤی تەنها لە ئافرەتیش دروستکردوە وەکو (عیسى) على نبينا وعليه الصلاة والسلام ئەو سێ حاڵەتەش بۆئەوەیەکە هیچ کەس بەخەیاڵی دانەیێ کە تواناو قودرەتی خوای گەورە سنور دارە، بەڵکو چۆنی ئیرادەو مەشیئەت لەسەر بێ ئاوا فەرمانەکانی جێبەجێ دەکا، بەڵام حاڵەتی ئاسایی بۆ ئێمەی مرۆڤ حاڵەتی چوارەمە واتە مرۆڤ لە (دایك و باوك) دروست دەبێ و چاو بەو دونیایە هەڵدێنێ .

خوای گەورە کە مرۆڤی دروست کردوە لە پێکهاتەی ئەو مرۆڤە حەزکردنی ژیان و ئاوەدان کردنەوەی ئەو زەویەی لەگەڵ (مرۆڤ) داناوە، بۆیە هیچ چشتێك لەو بوونەوەرە ناتوانێ لەدڵ و فیکری ئێمەی (مرۆڤ)

شـوێنی (مـرۆڤ) بگـرێتەوە، ئەگەر کەسـێك بخـرێتە دورگەیەکـی دوور لەمرۆڤ هەرچی خۆشی هەیە بۆی دابین بکەی ئەوکەسە ناتوانێ دور لەکۆمەڵگەی مرۆڤایەتی بژی، ئینجا کە ژن و پیاو دەگەنەیەك (خێزان) پێك دێنن چەند (خێزانێکیش) پێکەوە کۆمەڵگا پێك دێنن و ئینجا ئەو کۆمەڵگـایەش پێویست بە سیستـەم و یاسـایەك دەکـا ژیـانی ئەو خەڵـکە بپارێزی و (ئەمانی) بۆدابین بکا لەو قۆناغەوەش (دەوڵەت) دورست دەبێ.

چـۆن (مـرۆڤ) بەچەنـد قۆناغێـك دا تێـدەپەڕێ بەهەمـان شـێوە ئەو دەوڵەتەش کە دێتە بوون بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێ (ساوایی و گەنجی و بەتەمەن بـوون و لاوازی و مـردن) بەخـۆوە دەبینـی واتە چـۆن مـرۆڤ دەمـرێ ئاوا دەوڵەتیش دەمـرێ، چۆن مـرۆڤ نەساغ دەبێ زۆر جار دەرد دەیگرێ ئەگەر زوو چارەی نەکات دەیکوژێ بەهەمان شێوە دەوڵەتیش دوو چاری دەرد دەبێ ئەگەر زوو چارەی نەکا دەوڵەتەکەش وەکو ئەو مـرۆڤ ئاسایە دەمرێ.

بەڵێ (مرۆڤ) لە ژن و پیاوەوە دێتە بـوون (دەوڵەتیش) لە (مـوعتەقەد یان باوەڕ یان یاسا) و (دەسـەڵات) دێتە بوون، واتە ئەو کۆمەڵگایەی کە پێکهاتوە لە چەند خێزانێك لەسەر (مـوعتەقەد و باوەڕ و چەند یاسایەك) کـۆدەبنەوە ئینجـا (دەسـەڵاتێك) دروسـت دەبـێ ئەو (مـوعتەقەد و یاسـاو باوەڕە) دەپارێزێ.

هەر لەسەرەتای مرۆڤایەتیەوە دەسەڵاتێك هەبووە بۆ یەكلای كردنەوەی كێشەكان، واتە مرۆڤایەتی بەخۆوەی نەبینەوە خەڵكانێك پێكەوە ژیابن بەبێ ئەوەی دەسەڵاتێك هەبێ بگەڕێنەوە لای و كێشەكانیان یەكلایی بكاتەوە. ئەلێرەوە زانایانی ئەو ئوممەتە باسیان لەوە كردوە كە (ئیمامەت) ئایا عەقڵ واجیبی كردوە یان شەرع؟ لەسەردەمی پێغەمبەران سەلات و سەلامی خوایان لەسەر بێ، ئەوان مەرجەع بوینەو ئەو كێشانەیان چارەسەركردوە كە ڕوی لەكۆمەڵگا كردوە، تا ئەو كاتەی سەران و خەڵكانی تر بەدەر كەوتون و دەسەڵاتیان گرتۆتە دەست، بەڵام شەرعی ئاسمانیان لێ دابڕیوە، یاساو هەوەسی خۆیان كردۆتە بەدیلی شەرعی خوا.

كەوا بوو ئەو قەوارەیەی ناو دەنرێ (حكومەت) یان (دەوڵەت) پێكهاتەكەی (خەڵك و خاك و دەسەڵاتە) ئەو سێ بەشەش هەرسێكیان مەحكومن بە چەند یاسایەك كەخوای پەروەردگار لەو بوونەوەرەی داناوە خودی ئەو یاسایانەش پەیوەست نییە بەكەسێكی باوەڕدار یان كەسێكی كافر، بەڵكو ئەو یاسایانە پەیوەندی بەمرۆڤ هەیە دور لەو باوەڕەی كەهەیەتی، لەڕێی ئەو یاسایانە و بەپێی ئەو یاسایانە دەكرێ (صاغ و ناصاغی) دەوڵەت بخوێندریتەوە، یان تەمەن و ئەو قۆناغەی دیاری بكرێ كە پێی تێدەپەڕێ.

دەوڵەت (نەخۆش دەبێ، لاواز دەبێ، هەژار دەبێ، دەوڵەمەند دەبێ، بەتەمەن دەبێ، پەكیشی دەكەوێ) حاڵی ئەو حاڵی مرۆڤە، هەموو

ئەوانەی بەسەردا دێ، بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە لێرە ئاماژەی پێبکەین (مرۆڤ) خوای گەورە ڕۆحی دەکاتە بەر و هەر ئەویش ڕۆحی لێدەسەنێتەوە، بەڵام دەوڵەت (هۆشیاری خەڵك و حیکمەتی دەسەڵات) ڕۆحی دەکەنە بەرو بەردەوامی پێدەدەن، خوای گەورە تەمەنی مرۆڤی دیاری کردوە ئەگەر زۆر بژی سەد ساڵە تێپەڕ کا دوای ئەوە هەر دەبێ بمرێ، بەڵام مەرج نییە دەوڵەت تەمەنێکی دیاری کراوی بۆ دانرابێ، بەڵکو هۆشیاری خەڵك و (حیکمەتی دەسەڵاتەکە) تەمەنەکە دیاری دەکەن.

یەکێك لەو خاڵە هەرە گرنگانەی کەتەمەنی (دەوڵەت) دەپارێزێ (عەدالەت) داد پەروەریە، چۆن جەستەی مرۆڤ ئەگەر ڕۆحی لێدەرچی دەبێتە جەستەیەکی ساردو سڕ و وردە وردە گەنی دەبێ ئابەو شێوەیەش ڕۆحی دەوڵەت عەدالەتە، دەوڵەت ئەگەر عەدالەتی هەبوو زیندووە عەدالەتی نەما، دەبێتە جەستەیەکی مردوو وردە وردە بۆگەن دەبێ، وە یەکێکش لەو خاڵە سەرەکیانەی دەوڵەت دەروخێنێ (زوڵم) ستەمکردنە، دەوڵەت تا داد پەروەربێ پارێزراوە لە ڕوخان جاگرنگ نییە (هەڵگری) چ باوەڕێکە، نیشانەی ڕوخان و لەناوچونیشی ستەم (زوڵمە) ئەگەر ئەو دەوڵەتە بیرو بۆ چۆنێکی ئیسلامیشی هەبێ، هەر بۆیە (نظام الملك) لەکتێبی (سیر الملوك) دەفەرمێ: زانایان فەرمویانە موڵك و دەسەڵات لەگەڵ کوفر دەمێنێ، بەڵام لەگەڵ ستەم (زوڵم) نامێنێ (الملك یبقی مع

الكفر ولايبقى مع الظلم).[١] هەر هەمان ماناشە كە شێخی ئیسلام ئاماژەی پێكردوە و دەفەرمێ: وأمور الناس تستقيم في الدنيا مع العدل الذي فيه الاشتراك في أنواع الإثم أكثر مما تستقيم مع الظلم في الحقوق وإن لم تشترك في إثم، ولهذا قيل: إن الله يقيم الدولة العادلة وإن كانت كافرة، ولا يقيم الظالمة وإن كانت مسلمة. ويقال: الدنيا تدوم مع العدل والكفر، ولا تدوم مع الظلم والإسلام[٢].

لێرە گرنگە چەند خاڵێك بوروژێنین لەبەر ڕۆشنایی ئەو خاڵانە ڕووداوی هێرشەكەی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی بخوێنینەوە.

یەكەم: ئیمام (ابن خلدون) ڕەحمەتی خوای لێبێ خاوەنی بیردۆزەی تەمەنی دەوڵەتە، واتە چۆن مرۆڤ تەمەنی هەیە و سەرەتا لاوازەو دواتر بەهێز دەبێ و دیسان بەرەو لاوازی دەڕوات ئاواش دەوڵەتەكان لەتەمەنیاندا بەو قۆناغانە تێدەپەڕن، گرنگە ئەو پرسیارە بكەین ئایا دەتوانین بڵێین دەوڵەتی ئیسلامی بەتەمەن ببوو توانای خۆڕاگرتنی نەبوو بەرامبەر بە دەوڵەتەكەی تەتار كە دەوڵەتێكی گەنج و سەرەتای هێزی بوو بۆیە هەر بۆیە ئەو ڕووخانەی بە خۆوە بینی؟ بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە، دەبێت لەڕوانگەی قورئانەوە سەیری هۆكاری ڕووخان و

(١) سير الملوك / سیاسەت نامە . لاپەڕە ٥٢

(٢) الأمر بالمعروف والنهي عن المنكر لابن تيمية (ص: ٢٩).

سەرکەوتن بکەین و ئەو هۆکارانە بخوێنینەوە کە دەوڵەت دەڕوخێنن و ئەو خاڵانەش لەخۆ بێنینە دی کە هۆکاری بونیاتنان و سەرکەوتنن.

خوای پەروەردگار سبحانە وتعالی دەفەرموێ: { يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنْ تَنْصُرُوا اللَّهَ يَنْصُرْكُمْ وَيُثَبِّتْ أَقْدَامَكُمْ (٧) وَالَّذِينَ كَفَرُوا فَتَعْسًا لَهُمْ وَأَضَلَّ أَعْمَالَهُمْ (٨) ذَلِكَ بِأَنَّهُمْ كَرِهُوا مَا أَنْزَلَ اللَّهُ فَأَحْبَطَ أَعْمَالَهُمْ (٩)} ئەی ئەوانەی ئیمان و باوەڕتان هێناوە دڵنیا بن ئەگەر ئێوە یارمەتی ئایینەکەی خوا بدەن، ئەوا بێگومان خوا یارمەتی ئێوە دەداو، بەسەر دوژمنتاندا سەرتان ئەخات، و هەنگاوەکانتان لە جەنگدا بەسەرکەوتن و تەمکین جێگیر دەکات، واتە: بەپێی نزیك بوونەوەی ئێمە لەسەرخستنی ئیسلام ئەوەندەش لە سەرکەوتن نزیك دەبینەوە، بەقەد دوورکەوتنەوەشمان لەو ئیسلامە ئەوەندە لە شکەست نزیك دەبینەوە. خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٩٦)}.[١] ئەگەر خەڵکی گوندو شارەکان باوەڕیان هێناباو لەخوا ترسابان دەرگای ئاسمانمان لەڕوو والا دەکردن و بەرەکەتیان بۆ دادەبەزی، بەڵام کوفریان کرد بەکردەوە خراپەکانی خۆیان لەناویانمان

---

[١] الاعراف/٩٦

برد، واتە کردەوەی موسڵمانە دوا ڕۆژو حاڵەتی ئێستای دیاری دەکات، خوای پەروەردگار کە باسی (سبأ) دەکا دەفەرموێ: {لَقَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ (١٥) فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُمْ بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِنْ سِدْرٍ قَلِيلٍ (١٦) ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ (١٧)}[١] خەڵکی (سبأ) لە نازو نیعمەتی زۆردا دەژیان، ژیانێکی خۆش و ڕزقێکی زۆری بۆ دابین کردبوون، پشتیان لە دین کرد، ئەوپشتتێکردنە تۆڵەی بەدوادا هات و خۆشی ژیانیان لێتێك چوو خاك و وڵاتیان نوقمی ژێر ئاو کەوت، ڕەز و باخەکانیان لە دارو درەختی بەردار گۆڕدرا بۆ داری دڕکدار و بێبەر ئەوە ئاکامی تاوان و دوور کەوتنەوەیان بوو لەڕەزامەندی خوای گەورە.

نوح پێغەمبەر (علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام) دەفەرموێتە قەومەکەی: {ثُمَّ إِنِّي أَعْلَنْتُ لَهُمْ وَأَسْرَرْتُ لَهُمْ إِسْرَارًا (٩) فَقُلْتُ اسْتَغْفِرُوا رَبَّكُمْ إِنَّهُ كَانَ غَفَّارًا (١٠) يُرْسِلِ السَّمَاءَ

---

[١] سبأ: ١٥-١٧

عَلَيْكُمْ مِدْرَارًا (١١) وَيُمْدِدْكُمْ بِأَمْوَالٍ وَبَنِينَ وَيَجْعَلْ لَكُمْ جَنَّاتٍ وَيَجْعَلْ لَكُمْ أَنْهَارًا (١٢)}.[١] بەئاشكراو بەنهێنی بەقەومەكەی وت: داوای لێبوردن لەخوای گەورە بكەن خوای پەروەردگار لێبوردەیە، دەروی ئاسمانتان بۆ دەكاتەوەو بەرەكەت دەخاتە ماڵ و منداڵتان و دەتان كات بەخاوەن باغ و كانیاو، ئەوەو دەیان بەڵگەی تر لەقورئانی پیرۆزو فەرمودەكانی پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم)، هاتووە لەسەر ئەوەی كە پابەند بوون بە ئیسلام و هەوڵدان بۆی دەبێتە مایەی بردنەوەی دوارۆژوو، خۆشی و سەركەوتن لەو دونیایە، ئەو مژدانەش تایبەت نییە بەنەوەیەك، بەڵكو بۆ موسڵمانە تا ڕۆژی دوایی، ئینجا گەر هات و لە چوارچێوەی دەوڵەت پابەند بوون بە ئەحكامی شەرع لەئارا دابوو، خەڵكی (حاكم و مەحكوم) غەمی ئەو ئیسلامەیان لەبەردابوو بێگومان تەمەنی ئەو دەوڵەتە بەرەكەتی تێدەكەوێ و نەوە بەنەوە تەمەنی درێژ دەبێ، تاكەكانی لەجیلێكدا تەمەنی خۆیان بەسەر دەبەن و دەمرن، بەڵام تەمەنی دەوڵەتەكە بەردەوام دەبێت بەتەمەنی نەوەی دوای ئەوان، بۆیە تەمەنی دەوڵەت گەر بەو شێوەیە بێ، ناكرێ بەراوورد بكرێت لەگەڵ تەمەنی مرۆڤ، جەستەی مرۆڤ زەمەن كاری تێدەكات موسڵمان بێ یا كافر هەر دەبێ بمرێ، بەڵام دەوڵەت گەر موسڵمان بێ پێكەوە

---

[١] نوح: ٩-١٢.

هەموو بۆ خوا بصولْحێن و ستەمیان لەنێودا نەبێ ئەگەری درێژ بوونەوەی تەمەنی ئەو دەوڵەتە لە ئارا دایە تا ئەو کاتەی لەو ڕێیە لادەدەن، ئەوەیان خاڵێکە ڕۆڵی سەرەکی دەبینێ لە سەرکەوتن و شکەست هێنان.

دووەم: خاڵێکی تریش دەکرێ بەکورتی تیشکی بخەینە سەر، هێرشی تەتارەکان ژیاری ئیسلامیان نەڕووخاند، بەڵکو دەوڵەتی ئیسلامیان ڕووخاند، ژیاری ئیسلامی لە خودی دەقەکانە و هەڵقوڵاوی فیکری بەشەر نین، دەقەکانی قورئانی پیرۆز و فەرموودەکانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) بەشێوەیەکی هەندە کامڵ و تەواو پەیوەندییەکانی نێوان مرۆڤ ڕێك دەخەن و ئەرك و مافەکانی بۆ دیاری دەکا، کەهیچ بەرنامەیەکی هەڵقوڵاوی فیکری بەشەر ناتوانێ ئەو هەدەفانە بپێکێ، بۆیە دەکرێ دەوڵەتی ئیسلامی بڕوخێ، بەڵام ژیاری ئیسلامی قەت ناڕووخێ. هەڵەین گەر پێشکەوتنی زانستی و (ژیار) لەیەك جودانەکەینەوە دەشێ خەڵکانێك لەڕووی زانستییەوە پێش کەوتووبن لەهەمان کاتدا دڕندەو ناشارستانی بن، هەروەکو دەشێ خەڵکانێکی شارستانی دوا کەوتوو لەزانست بن. کە ئەوەش بابەتێکی جودایە لەشوێنی تر بەپشتیوانی خوای گەورە تیشکی دەخەینە سەر، کەوابوو هەڵەیە کەسێك بڵێ تەتارەکان ژیاری ئیسلامیان ڕووخاند، بەڵکو ئەوان دەوڵەتی ئیسلامی یان ڕووخاند.

سێیەم: خوێندنەوەی مێژووی ئیسلامی و وردبوونەوە لێی دەتگەێنیتە ئەو ڕاستییەی کە هەموو شکستێك مەرج نییە هۆکارەکەی گەورەیی هێزی دوژمن بێت، بەڵکو زۆرجار گوناهەکانمان ڕۆڵی سەرەکی لە شکستهێنان دەبینن و بێ فەرمانی خوای گەورە ترسناك تر دەبێ لەهێزی دوژمن. قورئانی پیرۆزیش زۆر بەڕوونی ئاماژەی بەو ڕاستییە کردووە خوای پەروەردگار کە باسی جەنگی ئوحود دەکا دەفەرموێ: {أَوَلَمَّا أَصَابَتْكُمْ مُصِيبَةٌ قَدْ أَصَبْتُمْ مِثْلَيْهَا قُلْتُمْ أَنَّى هَذَا قُلْ هُوَ مِنْ عِنْدِ أَنْفُسِكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ (١٦٥)} .ال عمران واتە: ئەوەی بەسەر موسڵمانان داهات هەڵەی موسڵمانان بوو، سیرەش باس لەوە دەکا هەندێك لە هاوەڵەکان سەری شاخەکەیان چۆڵکرد و فەرمانی پێغەمبەریان(صلی اللهعلیهوسلم) شکاند ، کەوابوو (فشار و پیلانی دوژمن و هەڵەو لاوازی خۆمان) هەردووك بەشدار دەبن لە شکست، زانینی ئەو ڕاستییەش موسڵمان لەو قەیرانە دەردێنێ کە زۆرجار سەرنەکەوتنی خۆی بداتە پاڵ پیلانی دوژمن، جا لێرەدا دەڵێین کتێبی (٤٤ ساڵ لەئامێزی غەفلەت) بەتەنها گێرانەوەی چیرۆکی (هاتنی مەغۆل و کەوتنی بەغدا) نییە، بەڵکو خوێندنەوەیەکی واقیعی جیهانی ئیسلامی ئەو کاتە و قسەکردنە لەسەر هۆکارەکانی کەوتن و تەسلیم بوونی دەوڵەتێکی تەمەن (٥٠٠) ساڵەیە، زۆربەمان وادەزانین هاتنی مەغۆل

و كەوتنـی بەغـدا لەمـاوەیەكی كـورتی چەنـد ڕۆژێـك بـووە! بەڵام ئاگامـان لەوە نییـە مەغۆلەكـان لە (٦١٢) كـۆچی بەفیعلـی هـاتنە مەیدانەكەو لە (٦٥٦) كۆچی دەوڵەتی عەبباسییان ڕوخاندو بەغدایان گـرت، واتە سـەرەتای سـەرهەڵدانی مەغـۆل و گرتنـی (بغـدا) ٤٤ ساڵی خایانـدوە، جـا گـرنگە بـزانین چ غەفڵەتێك بـوو ئەو ئـوممەتە تێیكەوتـوە بە ٤٤ ساڵ بەخۆ نەهاتۆتەوە؟ چ هەوەسێك بـوە خەلـیفەو دەسەڵاتی سیاسی سەرقاڵ كردوە و ئاگادرای هەنگاوەكانی مەغـۆڵ نەبـووینە؟ خەلـیفەو دەسـەڵاتی سیاسـی لەو كـاتە خەریكـی چـی بـووینە؟ زانایـانی ئـوممەت و گەورە سـەركردەكانی سـەربازی بەچـی خەریـك بـووینە؟ (مـیللەت شـەقامی ئیسـلامی خەڵـك) لەو زەمەنە چۆن ژیاون؟ هەوڵمان داوە وەڵامی ئەم پرسیارانە و چەند پرسیارێكی تـر بدەینەوە، بەڵـی (٨٧٤) سـاڵ تێپەڕیـوە بەسـەر هـاتنی مەغـۆڵ و كەوتنـــی بەغـــدا، بەڵام خوێنـــدنەوەی ئەو ڕووداوە ئەو شـــەپۆڵە سەرشێتەی ئەو ئوممەتەی داپۆشـی لە سـەرچاوە مێژووییەكـان هەنـدە ئـازار بەخشـە هەمـان قسـەی (ئیمـام ابـن الاثیـر) دووبـارە دەكەینـەوە، كەلە ساڵی (٦١٧) كۆچی كردویەتـی ئیمام (ابن الاثیر) تامـاوەیەك دەستی لەقەڵەم هەڵگرت و لەبەر گەورەیی تاوانەكـان نەیتـوانی هـیچ لەوبـوارە بنوسێتەوە، بەڵام دواتـر ناچـار دەبـێ دەسـتدەكات بە تۆمـار كردنی تاوانەكـانی مەغـۆل ئەوە لەكاتێك ئەو ئیمـامە بەڕێزە كەوتنـی

بەغدای نەبینیوە لەبەر ئەوەی لەساڵی (٦٣٠) کۆچی وەفاتی کردوە ئەی ئەگەر کەوتنـــی بەغـــدای ببینیبـــا ئـــاخۆ ئەوکـــات چـــی دەفەرمــوو![1] بــۆیە ئـێمەش هەر وەکـو ئەو دەڵێـین: خۆزیـا چاومـان بەدونیا هەڵنەهێناباو ئەو واقیعە تاڵەی ئەو کاتمان نەزانیبا...

**سەرباز محمد حسن**

**٢٣/ سەفەری ١٤٤٠ کۆچی**

بەرامبەر بە

**٢٠١٨/١١/٢ زایینی**

هەولێر

تێبنی:

ڕەشەبای مەرگ پێکهاتوە لەدوو بەش:

بەشی یەکەم باسی هێرشی مەغۆل دەکات بۆ سەر جیهانی ئیسلامی و ٤٤ ساڵ لەئامێزی غەفڵەت.

بەشی دووەم: باسی سەرەتای دروست بونی دەوڵەتی ئێلیخانییەکان و هێرشی مەغـۆل بـۆ سـەر وڵاتـی شـام و جەنگـی عەیـن جـالوت و شکەستەکانی مەغۆل دەکات.

---

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٣٣٣).

# گرنگی خوێندنەوەی مێژوو

## (تاريخ) مێژوو یانی چی ؟

هەندێ لەزانایان لەمانای تاریخ لەڕوی زمانەوانییەوە دەڵێن: مێژوو پێناسەی (کاتە) ئەو ناوە (تاریخ) ناوێکی عەرەبی نییە، مەبەست لێی پێناسەی کاتە، [1] بەڵام مێژوو وەکو زاراوە: دەتوانین بڵێن مێژوو گێرانەوەی بەسەر هاتی مرۆڤەکانە، چۆن ژیاون و چیان دوای خۆیان جێهێشتوە، جا مێژووی (کەس) بێت، یان (کۆمەڵگا) بۆیە کتێبەکانی مێژووش لەئیسلام دوو جۆرن هەندێکیان باسی کەسەکانە وەکو (سير اعلام النبلاء) هەندێکیشی باسی کەس و کۆمەڵگاو بەسەر هاتەکانە وەکو مێژووەکەی (ئیمامی تەبەری و تجارب الامم و البدايه والنهايه)و سەرچاوەکانی تر.

لێرە پێم خۆشە سەرنجی بەڕێزتان بۆ خاڵێك ڕاکێشم لام گرنگە خوێنەر بەهەندی وەرگرێ، ئەویش ئەوەیە: مێژوو زۆر جار دەستکاری کراوە، ئەڵمانەکان دەڵێن: (Geschichte wird von Siegern geschrieben) مێژوو لەلایەن سەرکەوتوەکان نوسراوەتەوە، ئەوەش بێگومان دەشێ بۆ عەقڵییەت و

---

(١) (الصحاح تاج اللغة وصحاح العربية (١/ ٤١٨) وە مقاييس اللغة (١/ ٩٤) مختار الصحاح (ص: ١٦) وە (لسان العرب (٣/ ٤).

مێژووی خۆرئاوا ڕاستبێ، بۆیە زۆر بەکەمی متمانە بەو کتێبە مێژووییانە دەکرێ کە خۆرهەڵاتناسەکان دەربارەی مێژووی ئیسلام نوسیویانە، ئەوان مامەڵەیان لەگەڵ (کەس و ڕووداوەکان) وەکو خۆی نەکردوە، بەڵکو نوسینەکانیان بۆ مێژوو نوسینەوەیەکی تۆڵەییە، واتە هاتوون تۆڵە لەئوممەی ئیسلامی و پێغەمبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) بکەنەوە، بە ڕقێکی زۆرەوە قسەیان لەسەر مێژووی ئیسلام کردوە، هەر بۆنمونە ئەگەر سەیری نوسینی (کارل بروکمان و گوڵد تسیهەر و جورجی زێدان) زۆری تر بکەین دەزانی قەڵەمی ئەوان تەنها بەشێوە قەڵەم بووە ئەگەر نا چەقۆیەکی ژەهراوی بووە وهەوڵیان تەنها بۆ شێواندنی مێژوە پاك و جوانەکەی ئیسلام بووە، لەبەرامبەر ئەوە بۆنموونە مێژووەکەی (ئیمام ابن کثیر البداية والنهاية) کە دەیخوێنتەوە هەستدەکەی کەسێکی مونصیف و لەخواترس ڕووداوەکانی تۆمار کردوە، لەڕوانگەی ئەو ئایەتە پیرۆزە {يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (٨)}[١]. ڕق لێبونەوەتان لە خەڵکێکی تر قەت بەرەو ستەمتان نەبات داد وەربن، دادوەری بەرەو خواتان دەباو و لەوتان نزیك دەکاتەوە، خۆر هەڵاتناسەکان هیچ هەستێکی لەخوا ترسانیان نەبووە بۆ

[١] المائدة: ٨

ئەوەی ڕێگریانبێ لە شێواندنی ڕاستییەکان، بەڵام مێژوونوسە موسڵمانەکان ڕەچاوی لەخوا ترسانیان کردوە لە کاتی تۆمار کردنی ڕووداوەکان یان قسە کردن لەسەر کەسایەتییەکان کە هەوڵیان داوە چۆن بوینە ئاوا باسیان بکەن، ئەوەش خاڵێکی زۆر گرنگە خوێنەری مێژوو دەبێ بەهەندی وەرگرێ.

## گرنگی خوێندنەوەی مێژوو لە چی دایە؟

دەتوانین بڵێین گرنگی خوێندنەوەی مێژوو لە سەرچاوە پاکەکان لە چەند خاڵێك کۆبکەینەوە.

یەکەم: گرنگی خوێندنەوەی مێژوو لەوە دایە کەدەکرێ سود لە ئەزمونی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابوری ئوممەتە ڕابردووەکان وەربگیرێ و بکرێنە زەخیرەیەك بۆ ئێستا و ئایندە، ئەگەرلە قورئانی پیرۆز ورد ببینەوە یەك لەسەر سێی بەشەکانی بەسەرهات و چیرۆکی ئوممەتانی پێش پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، خوای گەورە دەفەرمێ: {فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (١٧٦)}[1]. باسی ئەو بەسەر هاتانەیان بۆبکە تاوەکو تێبفرکن کە مەبەست پەند وەرگرتنە لە بەسەر هاتەکان .

---

(١) الأعراف: ١٧٦

دووەم: خوێندنەوەی مێژوو ڕاڤەی ئەو ئایەتەمان بۆ دەکات: {... إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ}[1]. خوای گەورە لە هیچ قەومێك ناگۆڕێ تا ئەوان خۆیان نەگۆڕڕێن، جا ئەو گۆڕانکاریە بەرەو باشی بێ یان بەرەو خراپی، واتە کەس چاوەڕوانی (موعجیزە) یەك لە مرۆڤی ئاسایی نەکات بۆ گۆڕینی حاڵەتەکەی لەخراپ بەرەو باش، بەڵکو خوای گەورە هێزو توانایەکی پێبەخشیوی دەبێ دروست بەکار بهێنرێ بۆ گەیشتن بە ئامانجەکان، گۆڕانکاریش تەنها بەکەسێك ناکرێ، بەڵکو دەبێ خەڵکی پێکەوە شان بدەنە یەك و هەوڵی گۆڕانکاری بدەن.

سێیەم: خوێندنەوەی مێژوو ئەو خاڵانەت پێدەناسێنێ کە میللەت بەرەو میحنەت و دەسەڵات بەرەو لەناوچون دەبا.

چوارەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ مرۆڤەکان خاوەن توانایەکی زەبەلاحی گەورەن زۆر جار کەسێك هاتوەو ئومەتێکی ڕاستکردۆتەوە لە ناخۆشی دەری کردون هەر وەکو زۆر جاریش هەبووە کەسێکی سیاسی خۆپەرست و خۆویست ئوممەتێکی بەرەو هەلاکەت و گەلێکی بەرەو فەوتان بردوە.

---

(١) الرعد: ١١

پێنجەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ ئەو ئوممەتە نامرێ بەڵێ دەکرێ دەسەڵات بڕوخێ و میللەت باجێکی زۆر گەورە بدا، بەڵام ئەو ئوممەتە لەبەر ئەوەی خاوەنی دوا پەیامی ئاسمانییە قەت نامرێ، بەڵکو هەندێك خاڵی هەن هەر هەموی خاڵی ڕووانەوەو بووژانەوەن هەر بۆنمونە لەو کاتەی موسڵمانان لەترسی مەغۆلەکان ڕادەکەن تیرەیەك لە تورکەکان ڕوو لە ناو چەی (ئەنادۆڵ) دەکەن و دواتر قەدەری خوای گەورە وا دەبێ کە لەسەر دەستی ئەو تیرەیە دەوڵەتێکی گەورە دروست دەبێ و دەبێتە چەترێك بۆ تەواوی موسڵمانان و بەربەستێکی گەورە بەڕوی خاچپەرستەکان ئەویش دەوڵەتی عوسمانییەکانە.

شەشەم: خوێندنەوەی مێژوو پەرەبەتوانای ڕاڤەکردنی ڕووداوەکان دەدا، بەشێوەیەکی ئاوا دەکرێ ئەو توانایە بکەی بە دەزگایەکی پێشبینی و لەڕێی هەنگاوەکان (ئاکاری دەرەنجامەکانت) بۆ دەرکەوێ.

حەوتەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ کە مرۆڤ حەز بەژیان دەکات و پێی خۆش نییە ئەو ژیانە جێبهێڵێ، لەهەمان کات کە بەسەرهاتی ئوممەتەکانی پێشەخۆمان دەخوێنینەوە دەزانین ئەوانیش حەزیان بەژیان بوو کەچی جێشیان هێشت ئێمەش ئاوا جێی دەهێڵێن و تەنها شوێنەوارو ناومان بۆ ماوەیەك دەمێنێ.

هەشتەم: خوێندنەوەی مێژوو زۆر جار پەند و عیبرەتی زۆری تێدایە بۆ (کاربەدەستەکان) جا گەر دادوەربن خەڵکی یادی خێریان دەکات و ڕەحمەتیان بۆ دەنێری، وەگەر زاڵم ستەمکاریش بن ئەوا سەرەڕای بونی ئەو زەمەنە زۆرە لەنێوان ئێمەو ئەوان خەڵکی لەعنەتیان بۆ دەنێرێ.

نۆیەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ کە ئەو دونیایە نەگۆڕ نییە، بەڵکو گۆڕانکاری زۆری بەسەر دێ بۆیە گرنگە دونیا بە(مەبەست) وەرنەگرین، بەڵکو بیکەینە ئامرازێك و قیامەتی پێ ئاوەدان کەینەوە.

دەیەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ تەمەنی ڕاستەقینەی مرۆڤ ئاسەواریەتی ئەو (شوێنەوارەیە) کەجێی دەهێڵێ نەك ئەو ڕۆژانەی کە دەیباتە سەر، بۆیە زۆر گرنگە هەر لەئێستاوە خەمی ئەو شوێنەوارەمان بێ کە لەو دونیایە جێی دەهێڵین .

یانزەم: خوێندنەوەی مێژوو پێمان دەڵێ ئەهلی تاعەت و لەخوا ترسان ناخۆشی و سەختی عیبادەتەکانیان لەسەر لاکەوت ئێستا چاوەڕوانی پاداشتەکانن، هەروەکو ئەهلی مەعصیەت لەزەتی تاوانەکانیان نەماو ئێستا چاوەڕوانی سزاکە دەکەن[(١)].

(١) الكامل في التاريخ (١/ ١١)، (المنتظم في تاريخ الملوك والأمم (١/ ١١٧).

# مەغۆل و تەتار كێن؟

مەغۆل و تەتار بە ڕەچەڵەك یەكن و لەیەك پشت بەپاش كەوتون زۆرێك لە مێژوونوسەكان دەڵێن، مەغۆل و تەتار لە توركە كۆنەكانن، یەكێك لە پادشاكانی ئەوكات بەناوی (ئەلینجاخان) جمكێكی دەبێ ناویان دەنێ (تەتەرخان) و (مەغۆل خان) ئینجا دواتر ئەو دوو كوڕە دەبن بەدوو بنەماڵەی زۆر گەورەو كێشەیەكی زۆریان دەكەوێتە نێوان و كێشەكان شەڕی نێوان ئەو دوو بنەماڵەیەی لێدەكەوێتەوە، لەزۆربەی شەڕەكان تەتارەكان زاڵ دەبن بەسەر مەغۆلەكان، بەو شێوەیە مەغۆلەكان دەكەونە ژێر دەستی تەتارەكان تا هاتنی (جەنگیزخان) و هاوكێشەكە پێچەوانە دەبێتەوە[(١)] هەندێكیش دەڵێن سەرەتا تەتار سەریان هەڵداوە دواتر مەغۆل، بەهەر حاڵ دیارە ئەوانە بەڕەچەڵەك لێك نزیكن، زانینی مێژوویەكی وردی ئەو هۆز و عەشیرەتانە كە دور بووینە لە (شارو ژیارو شارستانی) زۆر ئەستەمە.

(تەتار) ئەو ناوە مێژوونوسان دەڵێن دوو بەشە: (تات) واتە: شاخ وە (ئار) یانی نشین، واتە: شاخ نشین، دەربارەی (مەغۆل) ئەوان لە مەنغۆلیا لەبیابانی جوبی ژیاون، ئەو ناوەش (مەغۆل) زۆر نەناسراو بوو تا هاتنی

---

(١) تاريخ الاسلام السياسي والديني والثقافي والاجتماعي حسن ابراهيم حسن لاپەڕە ١٣١.

(تیموجین) جەنگیزخان، مەغۆلەکان زیاتر لە مەنغۆلیا کەدەکەوێتە ڕۆژ هەڵات و باکوری چین ژیاون بەپێچەوانەی تەتارەکان کە ئەوان لە باشورو خۆرئاوای مەنغۆلیا کەدەکاتە (تبت) و هەر وەها ڕۆژ ئاوای مەنغۆلیا تا دەگاتە ڕوسیا.(١) (*)

## کورتەیەك دەربارەی جەنگیزخان (تیموجین)

لەکۆتایی سەدەی شەشی کۆچی واتە سەدەی دوانزەی زاینی، کەسێك لەناو مەغۆلەکان دەرکەوت بەناوی (یسوغای) لەبنەماڵەیەکی دیاری مەغۆلەکان بوو، یەکێك بوو لەسەرکردە سەربازییەکانی بنەماڵەکەی، لەساڵی (٥٦١) کۆچی دەمرێ و چەند منداڵێك بەجێدەهێڵێ کوڕی گەورەی ناوی (تیموجین) کە دواتر بەجەنگیزخان دەناسرێ، ئەو کوڕەی کەسێکی ئازاوبەجەرگ دەبێ، دەتوانێ بەزیادەوە شوێنی باوکی پڕبکاتەوەو وردە وردە عەشیرەتەکانی مەغۆل لەدەوری خۆی کۆبکاتەوە، دواتر دەتوانێ تەتارەکانیش بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی و ڕۆژ بەڕۆژ دەسەڵاتی لەزیاد بوون دەبێ، تاوەکو لەساڵی (٦١٢) کۆچی دەتوانێ پایتەختی چین (بکین) بگرێ و تەواوی چین بخاتە ژێر دەسەڵاتی، دەوڵەتەکەی

---

(١) المغول والحضارة الإسلامية، رحلة المغول من الاستكبار إلى الانصهار لاپەڕە ٢٣.

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ١ و ژمارە ٢.

جەنگیزخـان لەخـۆر هەڵات لەسـنوری چـین لەگەڵ یابـان کە مەغۆلەکـان چەند جارەکی هەوڵی گرتنی یابانیان دا، بەڵام بۆیان نەگیرا لەباشوریش گەیشـتنە کۆریـای باشـور و تـاوەکو بـاکوری هینـد و تەواوی ئێـران لەخۆرئـاواش هێزەکانیـان گەیشـتە غەززە لەئەوروپـاش هێـزی مەغۆلەکـان گەیشتە پۆڵەندا. لەساڵی (٦٢٤) جەنگیزخان دەمرێ و دەوڵەتێکی فراوان بۆ کوڕەکانی جێدەهێڵێ، ژیانی (جەنگیزخان) پێویست بەکتێبی تایبەت دەکـا، بەڵام ئەوەی مەبەسـتی ئـێمەیە لەو کتێـبە خوێنـدنەوەی کەوتنـی پایتەختی خیلافەتی ئیسلامییە بە دەست مەغۆلەکانە ئەو غەفڵەتەی کە جیهانی ئیسلامی ئەو کاتی داپۆشی بوو.[١]

---

(١) تاريخ الترك في اسيا الوسطى، وە کتێبی المغول والحضارة الاسلامية، وە کتێبی جنكيز خان الحياة والموت والانبعاث .

# واقیعی جیهانی ئیسلامی
# لەسەرتای سەدەی حەوتی کۆچی

گرنگە ئاگادرای واقیعی جیهانی ئیسلامی ئەو کات بین، بۆیە دەتوانین جوگرافیای سیاسی سەرەتای سەدەی حەوتی کۆچی بەو جۆرە بنەخشێنین(خیلافەتی عەبباسییەکان لەبەغدا، میسرو شام وحیجازو یەمەن، مەغریب و ئەندەلوس، خوارزم و فارس و هیند، ئەنادۆڵ و مەملەکەتی کورج و ئەرمینیا و ئازەربایجان و هەندێ قەوارەی سەڵیبییەکان لەناوچەکە) ئەگەر بەکورتیش بێ پێناسەیەکی ئەو قەوارانە بکەین کە ئەو کات بونیان هەبووە.

## یەکەم: خیلافەتی عەبباسی .

عەبباسییەکان لەساڵی (١٣٢) کۆچی هاتنە سەرحوکم و توانیان دەسەڵات لە ئومەویەکان بسەننەوە، لەسەردەمی (هارون ڕەشید ١٧٠-١٩٣)کۆچی دەوڵەتی عەبباسی دەگاتە لوتکەی بەهێزی و سەردەمی زێڕینی و بەغدای پایتەخت بە پایتەختی جیهان ناو دەبردێ، لەدوای (هاڕون ڕەشید) شەڕێکی گەورە دەکەوێتە نێوان هەردوو کوڕی (ئەمین و مەئمون) (مەئمون ١٧٠-٢١٨) کۆچی بەیارمەتی خاڵوانی کەفارس بوون

تــوانی زاڵ بــێ بەســەر بــراکەی (ئەمین) و خەلافەتــی لــێ بســەنێتەوە، مێژوونوســان دەفەرمــون لاوازی ئەو دەوڵەتە ئەو کــاتە دەســتی پێکــرد، کە خەلیفە (المعتصم) تورکێکی زۆری هێنایە بەغدا و هەوڵی دا پشت بەوانە ببەســتێ لەبــری ئەو فارســانەی (مەئمــونی) بــرای هێنبویــانییە بەغــدا، تورکەکــان هێنــدە زۆر ببــون لەبەغــدا تــاوەکو جێگایــان بەدانیشــتوانی بەغــدا تەنگکرد و ناچار (موعتەسیم) شاری (سامەرا) دروست دەکات و خۆی و ئەو تورکانەی هێناویەتی دەچنە ئەوێ، لەو کاتەوە تورکەکان دەبنە بەلایەك بەسەر خەلیفە عەبباسییەکان تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی خەلیفە تەنها ناوی دەمێنێ تەواوی بڕیارەکان دەکەوێتە دەست تورکەکان، خیلافەتی عەبباسی بەردەوام دەبێ تا هاتنی (متوکل، ٢٠٥-٢٤٧ کۆچی) کەناوی: أبو الفضل جعفر المتوکل علی الله کوڕی المعتصم کوڕی هارون الرشید کوڕی المهدي کوڕی المنصور ە، کەلەساڵی (٢٣٢) بەیعەتی پێدەدرێ و دەبێتە خەلیفە، مێژوونوسان خیلافەتی (متەوەکیل) بەسەرتای سەردەمی (دووەمی عەبباسییەکان) هەژماردەکەن لەبەرئەوەی لەو سەردەمە هەر بەیەکجاری تورکەکان دەسەڵات داگیر دەکەن و خەلیفە تەنها وەکو ڕوکەشێك دەمێنێتەوەو هیچی ترنا، نەك تەنها بڕیاری سیاسی، بەڵکو دانانی خەلیفەو لادانیشی هەرلەدەست تورکەکان دەمێنێ تا کۆتایی خیلافەت لەساڵی (٦٥٦) کۆچی بەدەستی مەغۆلەکان.

بەڵێ (المتوكل) هەوڵێكی زۆری دا بۆ ڕزگاركردنی خیلافەت لەدەست توركەكان، بەڵام بۆی نەچوەسەر هەتا هەوڵی دا خیلافەت ئەگەر بۆماوەیەكی كاتیش بێ بباتە (شام)، بەڵام توركەكان ڕێیان بەوە نەدا و لەساڵی (٢٤٧) كۆچی لەسەردەستی كوڕی خۆی (المنتصر) بەیاوەری چەند سەركردەیەكی سەربازی دەكوژرێ.[1] هەر لەدوای كوشتنی (المتوكل) تاوەكو دوایین خەلیفەی عەبباسی (المستعصم بالله) حاڵی خیلافەت بەم شێوەیە بەڕێوە دەچێ هەر خەلیفەیەك بەعەقڵی سەركردە سەربازییەكان نەبوایە لایان دەدا و كەسێكی تریان لە بنەماڵەی عەبباسییەكان دەكردە خەلیفە و بەیعەتیان پێدەدا، لەزۆربەی حاڵەتەكان (حاكمی) ڕاستەقینەی لەخیلافەتی عەبباسی سەركردە سەربازیە توركەكان و وەزیرەكان بوینە، هەربۆنمونە لەسەردەمی خەلیفە (المقتدربالله) خاقانی وەزیر تەواو دەسەڵاتی گرتبوە دەست دانانی بەرپرسەكان و لادانی بەدەست ئەو بوو زۆربەی جاران بەرپرسی بە (بەرتیل) دادەنا كێ پارەی زیادی بدابایە ئەوی دەكردە بەرپرس بۆیە شاعیر وەصفی ئەو حاڵەتی كردوە دەڵێ:

وَزِيرٌ قَدْ تَكَامَلَ فِي الرَّقَاعِةْ ... يُوَلِّي ثُمَّ يَعْزِلُ بَعْدَ سَاعِةْ

إِذَا أَهْلُ الرُّشَى اجْتَمَعُوا لَدَيْهِ ... فَخَيْرُ الْقَوْمِ أَوْفَرُهُمْ بِضَاعَةْ

---

(١) البداية والنهاية (١٠/ ٣٨٥).

بەو شێوەیە وەزیر خۆی دەوڵەمەند کردوە نەك هەر خۆی، بەڵکو هەتا کوڕو خێزان و کەس و کاری وەزیریش کاریگەریان هەبووە لەسەر دانان و لادانی بەرپرسەکان.[1]

خەلیفە (المستعین) نەیدەتوانی یەك بڕیار بدا دور لەسەرکردە سەربازییەکان، شاعیرێك باسی حاڵی خەلیفە دەکا و دەڵێ:

خليفة في قفص ... بين وصيف وبغا

يقول ما قالا له ... كما تقول الببغا

خەلیفە لەقەفەس کراوە لەنێوان (وەسیف و بوغا) کە دوو (کەسی تورك) بوون ئەوەی ئەوانە بیڵێن خەلیفەش (توتی) ئاسا هەر ئەوە دەڵێتەوە،[2] جگە لەوەش خەلیفە ڕێی پێدرابوو خەریکی هەوەسی خۆی بێت و بۆیە کڕینی کەنیزەو و دروستکردنی کۆشکی گەورەو گوێگرتن لەگۆرانی و سەماو هەڵپەرکێ و خواردنەوەو ڕابواردن لەنێو کۆشکەکانی خەلیفە، حاڵەتێکی ئاسایی بووە، ئەوە لەکاتێکدا کە میللەت زۆر جار نان نەبووە بیخۆن، ئێمە ناڵێین حاڵی هەموو خەلیفەکان وابوە، بەڵام هێڵی گشتی حوکمی عەبباسییەکانی ئەو کات بەو شێوەیە بووە جار جار کەسێکی دڵسۆزی خوا ویست دەرکەوتوە، بەڵام هەر زوو کوشتویانەو ڕێگایان بەچاکسازییەکان نەداوە، لەساڵی (**٣٣٣**) کۆچی (المستكفى بالله)

---

(١) الكامل في التاريخ (٦/ ٦١٢).

(٢) تاريخ الخلفاء (ص: ٢٦١).

ابوالقاسم عبدالله کوڕی المکتفی بالله علی کوڕی المعتضد. دەبێتە خەلیفە و لەساڵی (٣٣٤)کۆچی (احمد البویهی) بەغدا داگیر دەکات ئەو جارەیان خیلافەتی عەبباسی دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی (بوەیهییەکان) ئینجا ئەوان بەهەوسی خۆیان (خەلیفە) دیاری دەکەن (احمد بوەیهی) خەلیفە (المستكفي بالله) دەنێرێتەماڵەوەو موچەیەکی مانگانەی بۆ دیاری دەکات و خۆشی کاروباری خیلافەتی ئیسلامی بەڕێوە دەبات، بوەیهییەکان لەسەر دەسەڵات دەمێننەوە تا سەردەمی (القادر بالله أحمد بن إسحاق بن المقتدر/٤٢٢ کۆچی) ئەو کاتەی سەلجوقییەکان دێن بەغدا داگیر دەکەن و کۆتایی بەحوکمی بوەیهییەکان دێنن.[1] خیلافەتی عەبباسی بەو شێوەیە دەمێنێتەوە تا ڕوخانی بەغدا بەدەستی مەغۆلەکان لەساڵی (٦٥٦) کۆچی بۆیە ئەوەی لای ئێمە زۆر گرنگە تیشکی بخەینە سەر لەگەڵ هاتنی ساڵی (٥٧٥)کۆچی و بەیعەت دانە بە(الناصرلدین الله ابو عەباس احمد کوڕی المتستضیء بأمر الله) هەروەکو دواتر بەدرێژی باسی ئەو زەمەنە دەکەین لەبەر ئەوەی مەغۆلەکان لەو سەردەمەوە دەردەکەون. ئەوە بەشێوەیەکی کورت باسی حاڵی خیلافەتی عەبباسییەکان بوو لە بەغدا تاوەکو خوێنەر تا ڕادەیەك بزانێ لە سنوری خیلافەتی عەبباسی کە تەنها بەغداو دەورو بەری بووە چ گوزەراوە، لەگەڵ تێبینی ئەوەی (دایکی خەلیفەو سوڵتان و خاڵوانی) دەستیان وەرداوەتە دەسەڵات، لەسەردەمی

---

(١) الكامل في التاريخ (٧/ ١٣٤). مسکویه ج ٢ لاپەڕە ٨٧ .

(مەئمـون) کەدایکـی خوراسـانی بـوو فارسـەکان ڕۆڵـی سـەرەکیان بینـی وەسەردەمی (موعتەصیم) دایکی تـورك بـوو تورکەکـان ڕۆڵێکی سـەرەکیان بینوە.

## دووەم: میسرو شام و حیجاز و یەمەن .

صـەلاحەدینی ئەییـوبی ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لەسـاڵی (٥٨٩) کـۆچی وەفـات دەکـات، لەدوای خـۆی شـازدە(١٦) کـوڕو کچێـك جێـدێڵێ،[1] ئەو شوێنانەی لەسەرەتای سەدەی حەوتی کۆچی لەژێر دەستی براو نەوەکـانی صـەلاحەدین بـوو، بەڵام بەداخەوە لە زۆر بابەتـان لەڕێبـازی (صـلاح الـدین) ئەییـوبی لایانـدابوو و نەیـانتوانی ئەو شـوێنانە بەیەکپـارچەیی بپـارێزن و حوکمی شام جودا بوو لە حوکمی (حیجاز و، یەمەن و، میسر) لە شـامیش زۆر جـار حمـص و حەلەب لەژێـر دوو دەسـەڵاتی جیـاواز بـوون هەر لەو کاتـانەش بـوو چەنـد شـوێنێك کە کـاتی خـۆی (صـلاح الـدین)ی ئەییـوبی لەچنگـی سـەڵیبییەکان دەری هێنـابوو دیسـان کەوتـنەوە ژێـر دەسـەڵاتی (سەڵیبییەکان).

خـوای گەورە پشـتیوان بێـت لە کتێبێکـی تـایبەت باسـی دەوڵەتـی ئەییوبییەکانیش دەکەین.

---

(١) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٢٥)

## سێیەم: خاچپەرستەکان، سەڵیبییەکان .

بـنکەی سـەرەکی خاچپەرسـتەکان لە خۆرئـاوای ئەورووپـا بـوو، بەردەوام خەریکـی هێرشـکردن بـوون بـۆ سـەر جیهـانی ئیسـلامی، نەسـرانییەکانی (ئینگلـتەراو، فەرەنسـاو، ئەڵمانیـاو، ئیتاڵیـا) هێرشـی یەك بەدوای یەکیـان دەکردە سەر شام و میسر، جگە لەوە نەسرانییەکانی (ئیسپانیا و، پورتوگـال و) جارجـار فەرەنسـاش هەدەفـی سـەرەکیان ئەنـدەلوس بـوو، ئینجـا چەنـد ئیمـارەتێکی خاچپەرسـتەکان لە نـاوچە ئیسـلامییەکە دامەزرابـوو وەکـو ئیمارەتی (أنطاكية و عكا و طرابلس و صيدا و بيروت) سەرەڕای ئەوەی صلاح الدين ئەییوبی ڕەحمەتی خوای لێبێ توانی قودس ڕزگار بکا لە چنگـی خاچپەرسـتەکان، بەڵام ئەو ئیمارەتـانە بەتەواوی لەنـاو نەچوبـون و لەدوای وەفاتی (صلاح الدين)ی ئەییوبی دەستیان کردەوە بەچالاکییەکانیان و زیـانێکی یەکجـار زۆریـان بە جیهـانی ئیسـلامی گەیانـد (مەملەکەتـی ئەرمینیا)ش کەدەکەوێتە باکوری فارس و خۆرئاوای ئەنادۆڵ، ئەوانیش لە جەنگـی بەردەوامـی موسـڵمانەکان بـون و بەتـایبەت سـەلجوقییەکانیان زۆر سەرقاڵکردبوو، هەروەها (مەملەکەتی کورج) کەدەکاتە (جۆرجیـای) ئێسـتا ئەوانیش لەهێرشی بەردەوامی سەرجیهانی ئیسلامی بوون.

## چوارەم: مەغریب و ئەندەلوس.

مەغریب و ئەندەلوس لەژێر دەسەڵاتی (موەحیدەکان)بوو، هەر لەسەرەتای سەدەی حەوتی کۆچی ئەوشوێنانە واتە خۆرئاوای ئیسلامی وەکو خۆر هەڵاتی ئیسلامی ڕوبەڕوی چەند کێشەیەکی یەکجار گەورە بوون و دووبەرەکی یەخەی گرتبوون تا لەساڵی (٦٠٩) شکستێکی زۆر گەورە بەر سوپای (موحیدەکان) کەوت و لەجەنگی (حصن العقاب) کە بەسەرەتای لەدەستدانی ئەندەلوس هەژمار دەکرێ.

## پێنجەم: دەوڵەتی خەواریزم .(*)

خەواریزم کە ئێستا بەناوی (xiva، خایەفە) شارێکە سەر بە ئۆزباکستانە ولەسنوری ترکمانستان نزیکە، لەسەرەتای سەدەی حەوتی کۆچی زۆربەی خۆرهەڵاتی وڵاتە ئیسلامییەکان لەژێر دەسەڵاتی خەواریزم شاه بوو هەر لەسنوری چینەوە تاوەکو باشوری ئێران و تاوەکو سنوری هیند، هەموو ئەو ناوچانە نائارامییەکی تەواوی بەخۆوە بینی بوو لەبەر سیاسەتە ناحەکیمانەکەی خەواریزم شاه، خەواریزمییەکان کۆتاییان بە دەوڵەتی سەلجوقییەکان هێناو خۆیان وەکو تاکە هێزی دەسەڵاتدار لەو ناوچانە

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ٣ .

حوكمیان كرد تا هاتنی مەغۆڵەكان، خاوەن پەیوەندێكی نائارامیش بوون لە گەڵ خیلافەتی عەبباسی لەبەغدا.

شەشەم: هیند .

هیند لەژێر دەسەڵاتی غۆرییەكان بوون دواتر (خەواریزم شاه) كۆتایی بەدەوڵەتەكەی ئەوانیش هێناو ئەوێشی خستە ژێر دەسەڵاتی خۆی.(*)

حەوتەم: فارس .

ناوچەی فارس بەتەواوی لەژێر دەسەڵاتی خەواریزم شاه بوو تەنها بەشێكی نەبێ كەلە ژێر دەسەڵاتی (ئیسماعیلییەكان) بوو.

هەشتەم: ئەنادۆڵ توركیای ئێستا.

ئەنادۆڵ كە دەكا توركیای ئێستا لەژێر دەسەڵاتی سەلوجوقییە ڕۆمییەكان و دەوڵەتی ئەییوبی بوو ململانێیەكی زۆریش لەنێوان هێزی سەلجوقییەكان و ئەییوبییەكان دا هەبوو، تا هاتنی مەغۆلەكان كەناوچەكە لە دەست هەر دوو هێز دەردێنێ، دواتر لەو شوێنە دەوڵەتی عوسمانی دروست دەبێت.

ئەوە بەكورتی واقیعی سیاسی جیهانی ئیسلامی بوو، ئاماژەمان پێكرد تاوەكو لەزیهنی خوێنەر وێنایەكی جیهانی سیاسی سەرەتای سەدەی

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ٤ .

حەوتی کۆچی دروست ببێ و بزانێ کە مەغۆلەکان دێن ڕوو بە ڕوو بوونەوەی چ واقیعێکی لاوازی پڕ لە کێشەو دووبەرەکی نێو خۆیی موسڵمانان بونەتەوە، ئینجا بۆئەوەی لەگەورەیی غەفڵەتەکە بگەین گرنگە بەدرێژی تیشك بخەینە سەر دەوڵەتی خەواریزمی هەر لەسەرەتای دروست بوونی تاوەکو ڕمانی ئەو دەوڵەتە بەدەست مەغۆلەکان.

# دروست بوونی
# دەوڵەتی خەواریزمییەکان

دەوڵەتی (خەواریــزم) لە هەنــاوی دەوڵەتــی ســەلجوقییەکان دامەزرا، ئەو دەوڵەتەی کەخاون دەسەڵات بوو بەسەر ناوچەیەکی زۆری خۆرهەڵاتی ئیسلامی، سولْتانی سەلجوقی (مەلیك شاە)[1]خزمەتکارێکی هەبوو بەناوی (ئەنوشتەکین لەهەندێ سەرچاوەش بەناوی نوشتەکین)[2]هاتووە، ئەو کەسە دەتوانێ متمانەی سوڵتان (مەلیك شاە)ی سەلجوقی بەدەست بێنێ و سوڵتان فەرمان دەردەکاو(نوشتەکین) دەکا بە ئەمیری ناوچەی خەواریزم، (خەواریزم) دەکەوێتە خۆرئاوای ئۆزباکستان ناوی ئێستای خەواریزم (خایەڤە، Xiva)یە، خەواریزم لەساڵی (٨٨)کۆچی لەسەردەستی (قوتەیبەی کوڕی موسلمی باهیلی) و لەسەردەمی خەلیفەی ئومەوی (وەلیدی کوڕی عبدالملك) فەتح دکرێ، [3]خەواریزم ئەو کات ناوی شارێك نەبوو، بەڵکو ناوی ناوچەیەك بووە، مێژووناسان دەفەرموون: ناوی (خەواریزم) لەوەوە هاتوە کاتی خۆی پادشای ئەو ناوچەیە لەنزیکەی

(١) سوڵتان: ملكشاه بن ألب أرسلان ٤٦٥-٤٨٥.
(٢) نوشتەکین ٤٧٠-٤٩٠.
(٣) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٩/ ٤٦٩).

(٤٠٠) کەس تـوڕە دەبـێ و دوریـان دەخـاتەوە لەئـاوەدانی، دەیـان نێـرێتە شوێنێکی دور کە نێوان ئەوان و ئاوەدانی (٤٠٠ تا ٥٠٠) کیلۆمەتر دەبێ، ئەو خەڵکە لەوێ جێنشین دەبن و ئەو شوێنە ئاوەدان دەکەنەوە، شوێنێك بووە دارو ئـاوی هەبـووە (ڕاوە ماسـیان) کـردوەو بەدارەکـانیش سـوریان کـردۆتەوو خواردویـانە، دوای مـاوەیەك دەسـەڵات دەگەڕێـتەوە بـۆ بینینـی حـاڵی ئەو خەڵـکە کە سـەیر دەکەن شـوێنەکەیان ئـاوەدان کـردۆتەوە و لەسـەر (ڕاوە ماسـی) ژیـاون ونـاوچەکەش داری زۆر بـوەو ئاگریـان کـردۆتەوەو خۆیـان لەسـەرما پاڕاسـتوە بـۆیە دەڵـێن ئەو شـوێنە بە(خەواریـزم) نـاوی دەرکـردوە لەبەرئەوەی بەزمانی ئەوان (گۆشت) یانی (خوار)و(رزم) یانی (باوشەدار) و ناوچەکە بۆتە خەواریزم[١].

(ئەنوشـتەکین) لەسـەر ویلایەتـی خەواریـزم دەمێنێـتەوە لەسـاڵی (٤٩٠) کۆچی وەفات دەکاو کوڕێکی دەبێ بەناوی (محمد)[٢]ئەو کـوڕەی دەچێتە شوێنی باوکی و ئەویش دەبێتە والـی خەواریزم و نزیکەی سی دانە ساڵ بەنـاوی سـەلجوقییەکان حـوکمی ئەو نـاوچەیە دەکـا، لەدوای وەفـاتی ئەو کـوڕەکەی کەنـاوی (ئـۆتز)ە[٣]ئەو کـات سـوڵتانی سـەلجوقی (سـنجر ٤٩٠-٥٥٢ کـۆچی) ڕازی دەبـێ کە (ئـۆتز) جێـی بـاوکی بگـرێتەوە و ببێـتە سوڵتانی خەواریزم. سوڵتان (ئۆتز) کەهەستی کرد دەوڵەتـی سـەلجوقییەکان

(١) معجم البلدان (٢/ ٣٩٥).
(٢) محمد کوڕی نوشتەکین (٤٩١– ٥٢١) کۆچی
(٣) ئۆتز کوڕی محمدی کوڕی نوشتکین (٥٢١-٥٥١).

بەرەو لاوازی دەڕوا هەوڵــی دا دەوڵەتێکــی ســەربەخۆ دابمەزرێنــیٚ و لەدەسەڵاتی (سەلجوقییەکان) دەربچیٚ، بەڵام سوڵتانی سەلجوقی (سنجر) لەو بەهێز تر بوو ڕێی پێنەدا جودابیێتەوە بەناچاری لەژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان مایەوە، لەدوای وەفاتی سوڵتان (ئۆتز)ی خەوارزمی کوڕەکەی بەناوی (ایل ارسلان)[1] دەبێتە سوڵتانی خەوارزم، سوڵتان (سنجر) سەلجوقی وەفات دەکاو کوڕەکەی بەناوی (محمودخان) دەچێتە سەر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، دەتوانین بڵێین دەسەڵاتی سەلجوقییەکان لە ناوچەی فارس لەگەڵ مردنی (سنجر) بەتەواوی کۆتایی پێهات هەندیٚ لە مێژوونوسان (ایل ارسلان)ی خەوارزمی بەیەکەم سوڵتانی سەربەخۆی دەوڵەتی خەوارزمی هەژمار دەکەن.[2] ایل ارسلان کە لە (٥٦٨) کۆچی وەفات دەکا، دوو کوڕ دوای خۆی جێدێڵیٚ، یەکیان بەناوی سوڵتان شاە محمود ئەوەی تر ناوی علاء الدین تکش، ئەو دوو کوڕە کێشەو ئیختلافیان زۆر بوو دایکیشیان جیاواز بوو، کوڕە بچوکەکە کەناوی (شاە محمود) بوو بەیارمەتی دایکی توانی بگاتە سەر حوکمی دەسەڵاتی خەوارزمییەکان، بەڵام کورە گەورەکەی کەناوی (علاء الدین تکش) بوو بەو پیلانە ڕازی نەبوو بۆیە هانای برد بۆ دەوڵەتی (خیتا)و توانی بەیارمەتی ئەوان دەسەڵات لەبراکەی بسەنێتەوەو براکەی واتە (شاە محمود) خەواریزم

---

(١) ایل ارسلانی خەواریزمی (٥٥١- ٥٦٨)کۆچی.

(٢) الدولة الخوارزمية والمغول حافظ احمد حمدي.

جێدەهێڵێ و لەساڵی (٥٨٩) کۆچی وەفات دەکا (علاء الدین تکش) زڕداکەکەی خۆی دەکوژێ[١] .

## سوڵتان (علاء الدين تكش) چۆن گەیشتە سەر تەختی دەسەڵات.

لێرە ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێبکەین هەروەکو لە چەند دێڕێکی پێشتر بەکورتی باسمان کرد کە سوڵتان (علاء الدين تكش) بەیارمەتی (دەوڵەتی خیتا کە لەمێژوو بەناوی الدولة القراخطائية)[٢] گەیشتۆتە سەرحوکم، بۆیە زۆر گرنگە پێناسەیەکی کورتی ئەو دەوڵەتە و ئاینی ئەو دەوڵەتە بکەین ئەو کات دەزانین کە سوڵتان علاء الدين تكش هەموو شتێکی کردوە بۆئەوەی بگاتە سەر کورسی دەسەڵات.

---

(١) الكامل في التاريخ (٩/ ٣٧٢).
(٢) العبر في خبر من غبر (٣/ ٥٤)

# دەوڵەتی(خیتا)یەکان کێین ؟ (*)

دەوڵەتـی (خیتـا، یـان قەراخیتائییەکـان) دەوڵەتێـك بـوو، لە نێـوان مەملەکەتـی خەواریزمییەکـان لەخۆرئـاواو و مەملەکەتـی مەغۆلەکـان لەخـۆرهەڵات، ڕوبـاری (سـەیحۆن) کەدەکەوێتە(اوزباکسـتان)ی ئێسـتا سنوری نێـوان خەواریزمییەکـان و (قەراخیتائییەکـان) بـوو، (خیتـا) چەنـد تیـرەو هۆزێـك بـوون لە بـاکوری چیـنەوە بەرەو ئەو نـاوچەیە هەڵکشـابوون، دەوڵەتێکیـان دروسـت کـرد بەنـاوی (دەوڵەتـی خیتـا) ئـاینی فەرمـی ئەو دەوڵەتە (بوزی) بوو، سەلجوقییەکان لەسەردەمی خۆیان لەشەڕێکی بەردەوام دابـوون لەگەڵ ئەو دەوڵەتە، لەهەمـان کاتـدا ئەو دەوڵەتە لەململانێیەکـی بەردەوامیش بـوو لەگەڵ (مەغۆلەکان) بۆیە زۆرێك لە مێژوونوسان دەڵێن دەوڵەتـی (خیتـا) وەکـو دیوارێـك بـوو لەنێـوان جیهـانی ئیسـلامی و مەغۆلەکـان، سـوڵتان (عـلاء الـدین تکـش) پەنـا بـۆ ئەو دەوڵەتە دەبا بـۆ ئەوەی بگاتە سەر کورسی دەسەڵات، بەزمـانی ئەوڕۆ ئیستعانە بەهێزێکـی کوفری(الاستعانة بالمشرکین) بۆ گەیشتن بەدەسەڵات، ئەوەی (علاء الدین تکش) کـردی تـاوانێکی گەورە بـوو، لەبەر ئەوەی وای کـرد کە ئەو دەوڵەتە

---

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ٥ .

چاو ببڕێتە سەروەت و سامانی خەواریزمییەکان، سەرچاوەکان دەڵێن (عـلاء الـدین تکش)پـارەو سـەروەتێکی زۆری بەو دەوڵەتە موشریکە دا، بـۆ ئەوەی پشتگیری بکات تا دەگاتە دەسەڵات، کە گەیشتە سەر کورسی حوکمیش بـاجێکی سـاڵانەی دیـاری کـراوی بەو دەوڵەتە دەدا[1] لێرەوە دەتـوانین بڵێین دەسـتپێکی (عـلاء الـدین تکـش) دەسـتپێکەکی پـاك و چـاك نەبـوو، هەر لەسەرەتاوە بەخیانەت لەودینەوە گەیشتۆتە سەر کورسی حوکم، پەیوەندی ناشەرعی خەواریزمییەکان و(خیتایەکان) کۆن بوو، لەساڵی(٥٣٦) کۆچی سوڵتان (ئۆتز)ی خەواریزمی بەیارمەتی سوڵتان (کورخان)ی خیتائییەکان لەشـەڕێکی گەورە لە بیابـانی (قطـوان) کە نـزیکەی (٣٦) کیلـومەتر لە سـەمەرقەند دورە تـوانی سـوڵتانی سـەلجوقی (سـنجر) بشـکێنێ و کۆتـایی بەدەسـەڵاتی سـەلجوقییەکان بێنـێ لە خـۆرهەڵاتی ئیسـلامی، سـوڵتان (ئـۆتزی) خەواریزمـی لەسێبەری دەوڵەتی(خیتاییەکـان) حـوکمی نـاوچەکە دەگیرێتە دەست بەو مەرجەی ساڵانە سی هەزار(٣٠٠٠٠) دیناری ئـاڵتونی وەکـو (بـاج) بەو دەوڵەتە بـدات، ئەو پەیمانە لەسـەر دەمـی سـوڵتان (ئـۆتز و کورەکەی ایل ئەرسەلان و کوڕی ئەو یش علاء الدین تکش) بەردەوام بـوو، واتە دەوڵەتی خەواریزمـی بـاجی سـاڵانەی بەدەوڵەتی(خیتـائییە بوزییەکـان) داوە بۆ ئەوەی لەسـەر دەسـەڵات بمێنن، دوای ئەوەی سـوڵتان (عـلاء الـدین تکش) کێشە ناوخۆییەکانی دەوڵەت چارەسەر دەکـات، ئینجـا هەنگـاو دەنـێ

(١) الدولة الخوارزميه والمغول لاپەرە ٢٩ / حافظ احمد حمدي.

بو جوداکردنەوەی دەوڵەتی خەواریزمی لە حوکمی (خیتائییەکان) و نەدانی باجی ساڵانە بەو دەوڵەتە، لە ساڵی (٦٠٤) کۆچی ململانێی فیعلی نێوان دەوڵەتی (خەواریزمی و خیتائییەکان) دەستپێدەکات، ئەو کاتەی سوڵتان عوسمانی حاکمی (سەمەرقەند) پەیوەندی بە سوڵتان علاء الدين تکشی خەواریزمی دەکات و دەڵێ: ئێمە موسڵمانین یارمەیتمان بدە و پێکەوە هاوکار دەبین بۆ دەرچون لەدەسەڵاتی سوڵتان (کۆرخان) سوڵتانی دەوڵەتی (خیتاییەکان) ڕزگارکردنی ئەو ناوچەیە لەدەست ئەو (بوزیانە) بەئەرکێکی شەرعی دەزانێ ئەوە بوو سوڵتان خەواریزم پێشنیارەکەی سوڵتان عوسمان سوڵتانی سەمەرقەند قبوڵ دەکات و ئەو کاتەی سوڵتان کۆرخانی خیتایی، وەفدێك دەنێرێ بۆ وەرگرتنی باجی ساڵانە، سوڵتان خەواریزم باجی ساڵانە ناداو وەفدەکە دەکوژێ و سوپایەك پێك دێنێ لەگەڵ سوڵتانی سەمەرقەند سوڵتان عوسمان و لە ڕووباری (جیحون) دەپەڕنەوەو بەسوپایەکی گەورە ڕوو دەکەنە دوژمنی هاوبەشی هەردوکیان کە دەوڵەتی (خیتاییەکانە) لەشەڕێکی گەورەی نێوان سوپای هاوبەشی عوسمانی سەمەرقەندی و خەواریزم شا لەگەڵ سوپای (خیتاییەکان) سوپای موسڵمانان دەشکێی وخودی سوڵتان علاء الدين تکشی خەواریزمی بەدیل دەگیرێ و دواتر دەتوانێ ڕابکا، لەساڵی (٦٠٥) کۆچی دیسان سوڵتان خەواریزم بەخۆ دەکەوێتەوەو سوپایەکی تر ئامادە دەکاو لەساڵی (٦٠٦) کۆچی ئەو جارەیان دەتوانێ سوپای (خیتائییەکان) بشکێنێ کە

بەسەرکردایەتی کەسێك بوو بەناوی (طاینکو) تەمەنی لەسەروی (١٠٠) ساڵەو نوێنەری سوڵتانی ئەوان دەبێ، بەدیل دەگیرێ و دەکەوێتە بەردەستی سوڵتان خەواریزم شاه، ئەو کاتە مەملەکەتی ئەو دیوی ڕووبار (بلاد ما وراء النهر) دەکەوێتە ژێر دەستی خەواریزم شاه، ئەویش ئەو ناوچەیە تەسلیم بە سوڵتان عوسمانی سەمەرقەندی دەکات و کچەکەی خۆشی لێمارە دەکات، دوای نزیکەی ساڵێك سەربازە خەواریزمییەکان ستەمێکی زۆر لەخەڵکی ئەو ناوچەیە دەکەن بەشێوەیەکی ئاوا کەخەڵکی ناوچەکە خۆزگە بە هاتنەوەی هێزەکانی (خیتائییەکان) دەخوازن ئەوە بوو سوڵتان عوسمانی سەمەرقەندی لەدەسەلاتی سوڵتان (خەواریزم شا) هەڵدەگەڕێتەوە وبەنهێنی پەیوەندی بە هێزەکانی (خیتائییەکان) دەکات و کچی (سوڵتان کورخان) دەخوازێ و هێزەکانی خەواریزم شا لە ناوچەکە دەردەکات و هێزی (خیتائییەکان) دێنیتەوە، هەوڵ دەدا خێزانەکەی بکوژێ کە کچی سوڵتان خەواریزم شایە، بەلام خزمەت کارەکانی دەپارێنەوەو ڕێگری لەکوشتنی دەکەن، ئەویش بڕیار دەدا کە کچەکەی خەواریزم شا بکاتە خزمەت کاری ژنی دووەمی کە کچی (سوڵتان کۆرخان)ە، [1] سوڵتان خەواریزم کەبەوە دەزانێ هێزێکی زۆر گەورە ئامادە دەکاو دەگەڕێتەوە ناوچەکەو تەواوی ناوچەکە لە چەنگی سوڵتان عوسمانی سەمەرقەندی ڕزگار دەکات و سوڵتان عوسمانی سەمەرقەندی دەستگیر دەکات و لەگەڵ زۆرێك لە

---

(١) تاريخ الدولة المغولية فى ايران/ عبدالسلام عبدالعزيز فهمى.

سەرکردەکانی ناوچەکە لەگەردەنیان دەدرێ[(١)].

دوای ئەوەی سوپای خواریزم شاه، ئەوسەرکەوتنە گەورەیە بەدەستدێنێ، سوپا تێکشکاوەکەی خیتائییەکان دەگەڕینەوە شوێنی خۆیان، لەوکاتەوە هێزێکی تر دێتە مەیدانەکەو ئەوانیش ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینن لە ڕووداوەکان، ئەویش هێزی (کشلی خان)و دەورو بەرەکەیەتی.

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٢٥٨).

## (کشلی خان) و ئەو ڕۆڵەی ئەو بینی لە ڕوداوەکان

(کشلی خان) یان کشلوخان کوڕی (کشلوخانە) و بەناوی باوکی کراوە، کشلوخانی باوك کاتی خۆی یەکێك بووە لەو (خانانەی) لەگەڵ جەنگیزخان لە دەسەڵاتی خانی گەورەی مەغۆل دەردەچن کەناوی (ئاڵتون) خان بووە، دواتر کوشلی خانی باوك دەمرێ، (کوشلی خانی کوڕ) بەتەمەن منداڵ دەبێ و جەنگیزخان، بەکەمی سەیری دەکاو هەوڵدەدا دەسەڵاتەکانی کەم کاتەوەو بهێنێتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، کشلی خانی کوڕ ئەوە قبوڵ ناکاو ناوچەکە جێدەهێڵێ ودەچێتە سنورەکانی دەوڵەتی خەواریزم و (خیتاییەکان)و لەوێ نیمچە ئیمارەتێك دروست دەکات دواتر ئەوانەی لەدژی (جەنگیزخان)ن ڕوو دەکەنە ئەو ناوچەیە و لەو شوێنە دەسەڵاتێکی مەغۆلی دژ بە سیاسەتی (جەنگیزخان) دروست دەبێ.[1] ئەوەی جێی ئاماژەیە کشلوخان دوژمنایەتییێکی کۆنیان لەگەڵ دەوڵەتی (خیتاییەکان) هەبوو، بۆیە ئەو کاتەی کەدەزانێ خەواریزمییەکان دەوڵەتی خیتاییەکانیان شکاندوە، کشلوخان نامەیەك دەنێرێ بۆ (خەواریزم شا) و هاوکاری خۆی نیشان دەدا بۆ لەناوبردنی یەکجارەکی دەوڵەتی (خیتاییەکان)، سوڵتانی (خیتاییە)کان بەوە دەزانێ کە (کشلوخان) پەیوەندیی کردوە بە (خەواریزم

---

(١) سیرة جلال الدین منکبرتی / لاپەڕە٣٨، محمد کوڕی احمدی نەسەوی، وە تاریخ ابن الوردي (٢/ ١٣٥).

شاه) ئەویش پەیوەندی بەخواریزم شاه دەكات و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ كە پەڕەیەكی تازە هەڵدەنەوە لەبەر ئەوەی دوژمنێكی ئاوا سەرسەخت هاتۆتە ناوچەكە كە مەبەستی (كشلوخان)ە، ئەگەر ئەو دەسەڵاتی ناو چەكە بگرێتە دەست و بەسەر ئێمە دا زاڵ بێ لەوە دڵنیا بە دەوڵەتەكەی ئێوەش دەڕوخێنێ.[1]

هەر دوو لا داوای یارمەتی لە خەواریزم شاه دەكەن، بۆیەكلاكردنەوەی ئەو جەنگەی كە دەكەوێتە نێوان (كشلوخان و خیتائییەكان) سوڵتان (علاءالدین تكش) دڵی هەردوولا ڕازی دەكاو مەبەستیەتی لەو نێوەندە یاری بكا، هەر كامیان بشكێن دەبێتە هاوپەیمانی ئەوەی تر و پشتی سەركەوتوو دەگرێ، ئەوە بوو (خەواریزم شاه) بەسوپایەكی گەورەوە كەوتەڕێ نزیك بوویەوە لە هەردوولا واتە سوپای (خیتاییەكان) و سوپاكەی (كشلوخان) چاوەڕوانی دەرەنجامی شەڕەكەی دەكرد، كەزانی سوپای (خیتاییەكان) لەشكانەو (كشلوخان) سەركەوتن وەدەستدێنێ، ئەویش هاتە ناوشەڕەكەو لەگەڵ (كشلوخان) بەتەواوی دەوڵەتی (خیتاییەكان)یان لەناو بردو (كشلوخان) ناوچەكەی كەوتە دەست.[2] لەدوای ئەوە خەواریزم شاه پەیوەندی بە (كشلوخان) دەكاو پێی دەڵێ: كە ئێمە پێكەوە ئەو دەوڵەتەمان ڕوخاندوە دەبێ میراتەكەشی لەنێوان هەردووكمان دابەشبكرێ (كشلوخان) وەلامی

---

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٢٦٠)

(٢) العبر في خبر من غبر (٣/ ١٤٠)

(خەواریـزم شـاە) دەداتەوە بەوەی کە لەشمشێر زیـاتر هیچت لای مـن نیـیە دەوڵەتەکەی ئێوەش لە دەوڵەتی (خیتا)ییەکان، بەهێز تر نییە ئەگەر ڕازیش نەبن چۆن ئەوانمان لەناو برد ئاواش ئێوە لەناو دەبەین، ئەلەو کاتە هەردوو لا واتە: (کشـــلوخان) و (خەواریـــزم شـــاە) ســـوپا ئامـــادە دەکەن. هەرکاتێك(کشلوخان)بە کێشەیەکی ناوخۆیی خەریك بووایە(خەواریزم شاە) هێرشی دەکردە سەر، تا گەیشتە ئەوەی (کشلوخان) نامەی بۆ ناردو لەنامەکە پێی دەڵێ: ئەوەی تۆ دەیکەی لە کاری دزو جەردەکان دەچێ نەك لە کـاری سـوڵتان بـۆیە داوای لێکـرد ڕوو بەڕووی بێـتەوە، بەڵام (خەواریزم شاە) خۆی لەشەڕی ئەوان دەپاراست.

هەر لەو کاتیشدا بڕیاری دا شارە سنورییەکانی نێوان خۆی ئەوان کاوڵ بکا، وەکو شاری (شاش و فرغانە و کاسان) ئەو شارانەی هەموو کاوڵکرد تاوەکو نەکەوێتە ژێر دەستیان. [1] ئەوەی گرنگە لێرە سەرنجی بۆ ڕاکێشین (کشـلی خـان) دوای ئەوەی دەوڵەتـی (خیتاییەکـان) دەڕوخێنـێ کچـی (کورخان)ی پادشای خیتاییەکان دەخوازێ، سەرەتا دەڵێن (کشلی خان) نەسـڕانی بـوو، بەڵام دوای ئەوەی ئەو کـچە دەخـوازێ دەکەوێـتە ژێـر کـاریگەری خێـزانەکەی و دەبێـتە (بـوزی) و هەوڵـدەدا خەڵکـی ژێـر دەسەڵاتیشی بهێنێتە سەر ئاینی (بوزییەکان)[2] هەر لەبەر ئەوەش بوو،

---

(١) (کشلی خان) . الکامل في التاریخ (١٠/ ٢٦١)

(٢) تاریخ الدولة المغولیة فی ایران، لاپەڕە ٤٤.

موسڵمانانی ئەو ناو چەیە کەوتنە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش و (کشلی خان) فشاری زۆری خستە سەر خەڵکە موسڵمانەکە بۆ ئەوەی لەئیسلامیان هەڵگێریتەوە، سەربازە بوزییەکانی بەسەر ماڵە موسڵمانەکان دابەش کرد و دەبوایە هەرماڵێکی موسڵمان سەربازێکی بوزی قبوڵ بکاو لەگەڵیان بژی، ڕێك وەکو ئەوەی ئێستا وڵاتی چینی شیوعی دژ بە موسڵمانانی (ئیغور) دەیکا هەمان سیاسەتی ئەو کاتی بوزییەکانە، خەڵکە موسڵمانەکەی سەرپشککرد لەنێوان (ئاینی بوزی) و ئاینی (نەسرانی) بۆیە هەندێك لە موسڵمانەکان نەسرانییەتیان هەڵبژارد، مزگەوتەکان قەدەغەکرا هاموشۆ بکرێن و بانگدان ڕاگیرا زۆر جار زانایانی ئاینی (بوزی) دەهێنا بۆ گفتوگۆ لەگەڵ موسڵمانەکان و بەگومان خستنیان لە ئیسلام.

(کشلی خان) بڕیاری جەنگ دەدا بەسەر ئیسلام و یەکێك لە بڕیارەکانی کۆکردنەوەی خەڵکێکی زۆرە لە دەرەوەی شار بۆ گفتوگۆکردن لەسەر ئیسلام و بوزییەت، ئەو پێی وابوو کەچەند شارەزایەکی هێناوە لە ئاینی بوزی و دەتوانێ بیسەلمێنێ کە ئیسلام ئاینێکی ڕاست نییە، ئەوە بوو داوای گفتوگۆی لەموسڵمانان کردو زانایەك لە زانا گەورەکانی ئەو ئیسلامە (علاءالدين محمد الختني)یە ڕەحمەتی خوای لێبێ، دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ (کشلی خان) و دارو دەستەکەی، کەهیچ بەڵگەیان پێنەما، (کشلی خان) فەرمانی گرتنی (علاءالدين)ی دەرکردو، دوای ئەوەی بۆ چەند ڕۆژێك برسی دەکەن و ئازارێکی زۆری دەدەن بۆ ئەوەی

هەڵگەڕێتەوە لەئیسلام، ئیمام ڕەحمەتی خوای لێبێ خۆڕاگرتر دەبێ، لەکۆتا هەڵی دواسن، بە چوار بزمار لە سەر دەرگای مزگەوت دەیکوتن تا گیانی دەردەچێ، خوای گەورە بەشەهیدی قبوڵ کات و فیردەوس جێگەی بێ.[1]

ئەو ڕوداوانە لەساڵی (٦٠٥ - ٦٠٦) کۆچییە، لێرەدا خەبەر دەگاتە (جەنگیزخان) کە (کشلی خان)ی کۆنە دوژمنی بۆتە خاوەن دەوڵەت و خەریکە دەبێتە خاوەن هێزێکی گەورە، بۆیە(جەنگیزخان) بەرەو ناوچەکانی دەسەڵاتی (کشلی خان) بە سوپایەکی گەورە دەکەوێتە ڕێ و (کشلی خان) خەریکی شەڕی (جەنگیزخان) دەبێ.

لێرە گرنگە سەرنجی خوینەر بۆئەوە ڕاکێشین هەڵەی(خەواریزم شاە) لەوە دابوو، دوو دوژمنی هەبوون کردی بەیەك، واتە نەدەبوو دەوڵەتی خیتاییەکانی لەناو بباو (کشلی خان) بکاتە خاوەنی ناوچەکە، ئینجا یەکێك لەهۆکارەکانی هاتنی (جەنگیزخان) بۆ ناوچەکە هێزەکەی (کشلی خان)بوو واتە (جەنگیزخان) ئەوەی قبوڵ نییە دوژمنەکەی ببێتە خاوەن هێزێکی گەورە، ئەوەی بەهەڕەشە دەزانی لەسەر دەسەڵاتی خۆی.

---

(١) تاریخ فاتح العالم الجزء الاول ص ١٠١.

## پەیوەندی خەواریزم شاە بەدەوڵەتەکانی دەورو بەری

دوای لەناو بردنی دەوڵەتی (خیتاییەکان) خواریزم شاه پێشتریش کێشەی لەگەڵ دەوڵەتی (غورییەکان) هەبوو، کە پایتەختەکەیان (غەزنە) بوو کە دەکەوێتە ئەفغانستانی ئێستا، لەساڵی (٦١٣) کۆچی خەواریزم شاه غەزنە داگیر دەکا و کورەکەی خۆی کەناوی (جلال الدین منکبرتی) یە دەکا بەسولْتان بەسەر غەزنەو تەواوی مەملەکەتی غورییەکان دەکەوێتە ژێر دەسەلاتی خەواریزم شاه.[1] لێرە خاڵێکی یەکجار گرنگ هەیە دەبێ ئاماژەی پێبکەین، کە غەزنە دەگیرێ و دەوڵەتی غورییەکان دەڕوخێ سولْتان خەواریزم لە خەزینەی (غورییەکان) چەند نهێنییەکی بۆ ئاشکرا دەبێ کە بریتی بوون لە چەند نامەیەك دەیاندۆزێتەوە، کەکاتی خۆی (خەلیفە ناصرٍ) بۆ سولْتانەکانی غورییەکانی ناردبوو لەنامەکان خەلیفە ناصیر داوای لە سولْتانی غورییەکان کردوە سنورێك بۆ دەسەلاتی خەواریزم شاه دابنێن بۆیە چەندجار غۆرییەکان هێرشیان کردبووە سەر خەواریزمییەکان، بەئاگاداری و دواکاری خەلیفە (ناصرٍ) ئەوە یەکێکە لەو هۆکارانەی خەواریزم شاه لەساڵی (٦١٤) کۆچی بڕیار دەدات هێرش بکاتە سەر بەغدا بۆ ئەوەی تۆڵە لە خەلیفە بکاتەوە، لە چوار چێوەی باسکردنی حاڵی ئەو ئوممەتە بەر لەهاتنی مەغۆل زۆر گرنگە باسێکی خەلیفە ناصرٍ لدین الله بکەین، کە لەساڵی(٥٧٥) کۆچی بەیعەتی پێدەدرێ و

---

(١) تاریخ ابن خلدون (٤/ ٥٥٠).

لەساڵی (٦٢٢) وەفات دەکا لەو زەمەنەش ڕووداوی زۆرگرنگ ڕوویداوە و نزیکەی (٤٧) ساڵ لەسەر کورسی خیلافەت بووە.

## ناوی تەواوی خەلیفە ناصیر

(الخليفة أبو العباس احمد)کوڕی (المستضيء بأمر الله) کوڕی (المستنجد بالله يوسف)کوڕی (المقتفى محمد)کوڕی (المستظهربالله أحمد)کوڕی (المقتدي الهاشمي العباسي البغدادي)یە لەساڵی (٥٥٣) کۆچی لەدایك بووە، لەسەرەتای مانگی زیلقەعدەی ساڵی (٥٧٥) کۆچی بەیعەتی پێدراوەو کراوە بەخەلیفە، لەساڵی (٦٢٢) کۆچی وەفاتی کردوە. خەلیفە ناصیر زۆری حەز لەکۆکردنەوەی پارەو ماڵ بوو بۆیە چاڵەکی گەورەی لەباخچەی ماڵەکەی هەڵکەندبوو ڕۆژانە سەردانی چاڵەکەی دەکرد و دەیگوت: توبڵێی بژیم تاوەکو ئەو چاڵە پڕ بکەم لە ئاڵتون، چاڵەکە پڕ دەکا لە ئاڵتون و دوای تەمەنێکی زۆر لەسەر حوکم وەفات دەکا، ئینجا کوڕەکەی دەبێتە خەلیفە کەناوی (المستنصر) بوو، ئەو خەلیفەیەش ڕۆژانە دەهاتە سەر ئەو چاڵە گەورەیە کە پڕە لەئاڵتون و دەیگوت: تۆ بڵێی ئەوەندە بژیم تاوەکو ئەو هەموو ئاڵتونە خەرج بکەم ئینجا ئەویش بەسەر دا وەفات دەکاو چاڵە ئاڵتونەکە هەر تەواو نابێ تاوکو هۆلاکۆ بەغدا دەگرێ و ئاڵتونەکان دەبا، کەدواتر باسی دەکەین.[1]

---

(١) الناصر قَدْ جَمَعَ ما يتحصل من الذهب في بركة في دار الْخِلَافَةِ، فَكَانَ يَقِفُ عَلَى حَافَّتِهَا وَيَقُولُ: أَتُرَى أَعِيشُ حَتَّى أَمْلَأَهَا، وَكَانَ الْمُسْتَنْصِرُ يَقِفُ عَلَى حَافَّتِهَا وَيَقُولُ أَتُرَى أَعِيشُ حَتَّى أُنْفِقَهَا كُلَّهَا. البداية والنهاية إحياء التراث (١٣/ ١٨٦)

خەلیفە ناصیر هەوڵێکی زۆری دا خیلافەت و سەنتەری بڕیار لەدەستی سوڵتانەکان دەربهێنێ بۆیە سەرەتا نامەی نارد بۆ سوڵتان خەواریزم کە خیلافەت لە دەسەڵاتی سەلجوقییەکان ڕزگار بکا لەساڵی (٥٩٠) داوای یارمەتی لە سوڵتان (خەواریزم شاه) دەکا بۆ ڕزگار کردنی لە دەسەڵاتی سەلجوقییەکان، ئەوەبوو سوڵتان خەواریزم شاه داواکاریەکەی قبوڵ دەکات و سوپای سەلجوقییەکان و سوپای خەواریزمییەکان لەنزیك شاری (ئەلرەی) دەگەنە یەك و سوڵتانی سەلجوقییەکان (طغرل) دەکوژرێ و خەواریزمییەکان سەری سوڵتان (طغرل) دەنێرن بۆ خەلیفە ناصیر خەلیفەش فەرمان دەکا سەری سوڵتان (طغرل) بۆ چەند ڕۆژێك لەبەغدا هەڵبواسرێ.[1] لەدوای ئەوەی خیلافەت ڕزگاری دەبێ لە چنگی سەلجوقییەکان ئەو جارەی دەکەوێتە ژێر هەڕەشەی خەواریزمییەکان، سوڵتان علاءالدین خەواریزم شاه داوا دەکات لەسەر مینبەرەکان دوعا بۆ ئەو بکرێت و هەمان ڕۆڵی سوڵتانی سەلجوقییەکان ببینێ، هەر بۆ ئەو مەبەستەش چەند جارەکی قازی (مجیرالدین عمر کوڕی سەعدی خواریزمی) ڕەوانەی بەغدا دەکا،[2] بەڵام خەلیفە ناصر ئەوەی قبوڵ نییە و دەبێتە هۆی دروستبونی گرژی نێوان سوڵتان خەواریزم و خەلیفە ناصر بۆیە سوڵتان خەواریزم شاه سوپایەکی (٤٠٠) هەزار کەسی ئامادە دەکات و

---

(١) البداية والنهاية (١٦/ ٦٦٤) وە کتێبی: الدولة الخوارزمية والمغول، لاپەڕە ٣٩.

(٢) سيرة سلطان جلال الدين منكبرتي لاپەڕە ٥٠.

بڕیـــار دەدا بەغـــدا بگـــرێ ســـوپایەکە بەڕێ دەکەوێ تادەگـــاتە نـــاوچەی (همـذان) کەخەلـیفە بەهـاتنی ئەو سـوپایە زەبەلاحە دەزانـێ، بەپێـی توانـا خۆی ئامادە دەکات و وەفدێك دەنێرێ بەسەر پەرشتی ئیمام (شهاب الدين السهروردي) خاوەنی کتێبی (عـوارف المعـارف) ئیمـام دەفەرمـێ: کە چـوم بـــۆ دیـــتن و قســـەکردن لە گەڵ ســـوڵتان خەواریـــزم، بیـــنم کەســـێکی زۆر لەخۆبـایی بـوو کەسڵاوم کـرد وەڵامـی سڵاوەکەی نەدامەوە و ڕێـی پێنـدام دابنیشم، ئینجا دەڵێ: منیش دەستم کرد بەوتارەکەم و باسـی فەزڵـی نەوەی عەبباسـم کـرد و ئامـاژەم بەفەرمـودەیەك کـرد، کە نەهـی کـراوە لە ئەزیەت دانی ئەو بنەماڵەیە، سوڵتان خەواریزم عەرەبی نەدەزانی بۆیە کەسێك لەوێ بوو قسەکانی منـی وەردەگێڕایە سـەر زمـانی تـورکی ئینجا کە لەقسـەکانم بـوومەوە، سـوڵتان خەواریـزم گـوتی پیـی بڵێن: ئەو فەزڵانەی کە ئامـاژەت پێکـرد فەزڵـی ئەو خەلـیفەیە نیـیە کە تـۆ باسـی دەکەی، بەڵکـو مـن خەلیفەیەك دێنم خاوەنی ئەو فەزڵە بێ کەتۆ باسـی دەکەی ئینجا خەلـیفە ناصـرٍ خـۆی سـتەمێکی زۆری لە نەوەی عەببـاس کـردوە و زۆربەیـانی خستۆتە زیندانەوە.[١]

لێرەدا هەوڵەکـانی نـوێنەری خەلـیفە ئیمـام سوهرەوەردی کۆتـایی پێدێ و سوڵتان خەواریزم بڕیاری داوە بەغدا بگرێ، ئینجا نەك هەر ئەوەندە، بەڵکـو خەواریزم شاە بڕیاری دابوو خیلافەت لە چنگ نەوەی عەببـاس دەربێنـێ و

---

(١) النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، بەرگی ٦ لاپەڕە ٢٢٠.

بیداته دەست عەلەوییەکان بۆ ئەو مەبەستەش کەسێکی عەلەوی هێنابوو کەخەڵکی (ترمذ) بوو بەناوی (علاء الملك) بڕیاری دابوو ئەو بکاتە خەلیفە و شیعەش دڵیان بەو هەنگاوەی خەواریزم شاە زۆر خۆش بوو، ئومێدیان دەکرد پلانەکەی خەواریزم شاە سەربگرێ، بەڵام قەدەری خوای گەورە سەرماو بەفرێکی زۆر ڕووی کردە ناو چەکە و سوپا گەورەکەی خەواریزم توانای خۆڕاگرتنی بەرامبەر بەو بەفرە زۆرە نەماو زۆرێك لەسەربازەکانی خەواریزم شاە لەسەرمان دەست و قاچیان بڕایەوەو سوپاکە شکستێکی گەورەی هێناو خەواریزم شاە نەیتوانی بەغدا بگرێ، ئیمام (ابن کثیر) کەباسی ئەو ڕووداوە دەکات دەڵێ: خەواریزم شاە بەشکستێکی گەورە گەڕایەوە...فَـرَدَّهُمُ اللَّهُ خَـائِبِينَ وَالْحَمْـدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَـالَمِينَ ئەو ڕووداوە لەساڵی (٦١٤) کۆچی بوو.[1] جالە هەموی سەیرتر ئەو سوپایەی خەواریزم شاە کەهاتبوون بۆ گرتنی بەغدا ژمارەکەی (٤٠٠) هەزار کەس بوو (٧٠) هەزاریان لە (خیتائییەکان) بوون[2] واتە ئەو تەتارە موشریکانەی دوژمنی جەنگیزخان بوون، ئەوخاڵەش زۆرگرنگە لای خوێنەر ڕوون بیتەوە کە لای (خەواریزم شاە) تەنها دەسەڵات گرنگە جا چۆن و لەڕێی کێوەدەبێ لای ئەو هیچ گرنگ نەبووە، ئەگەر نا چۆن خەڵکێکی بت پەرست دێنێ بۆ گرتنی بەغداو ڕوخاندنی خیلافەتی ئیسلامی؟!.

(١) العبر في خبر من غبر (٣/ ١٦١) البداية والنهاية إحياء التراث (١٣/ ٩٠).
(٢) النجوم الزاهرة فى ملوك مصر والقاهرة، بەرگی ٦ لاپەڕە ٢٢٠.

## هەوڵەکانی خەلیفە بۆ ڕوخاندنی دەوڵەتی خەواریزمییەکان

ئاماژەمان بەوە کرد کە خەلیفە ناصرِ هەر لەسەرەتاوە هەوڵی داوە سەنتەری بڕیار بگێڕیتەوە وخیلافەت ڕزگار بکا لەچنگی سوڵتانەکان و نەیەڵێ چیترئەزمونی سوڵتانی سەلجوقییەکان دووبارە ببتەوە، بۆیە یەکێك لەکارەکانی ڕوخاندنی خانوی سوڵتان بوو لە بەغدا، واتە خانوێك هەبوو لەبەغدا بەناوی (دار السلطنة) سوڵتان لەوێیا دادەنیشت و هەموو بڕیارەکانی خستبوە ژێر دەستی خۆی، هەتا گۆڕینی خەلیفە، خەلیفە ناصرِ ئەزمونێکی زۆر تاڵی هەبوو لەگەڵ سوڵتانی سەلجوقییەکان، بۆیە بڕیار دەدا ئەو بنکەیە (دار السلطنة)بڕوخێنێ[1] و بەوەش هەموو ئومێدێکی لە سوڵتان خەواریزم شاە بڕی و ناڕاستەو خۆ پێی وت ئەوەی بۆ سوڵتانە سەلجوقییەکان چوە سەر نابێ بۆ ئێوە بچێتە سەر، خەلیفە ناصرِ جگە لەوە چەند هەنگاوێکی تریشی نا بۆ کۆکرنەوەی گەنجەکان و گێڕانەوەی هەیبەتی خیلافەت هەربۆنمونە دەزگایەکی دامەزراند بەناوی دەزگای (الفتوة) کەتایبەت بوو بەگەنجان و فێری سوار چاکی و تیر هاوێشتنی دەکردن و تەنانەت جۆرە بەرگێکی تایبەتی بۆ دانابوون کەسە نزیکەکانی خەلیفە دەبوایە ئەو جۆرە بەرگە لەبەر بکەن، ناصرِ لدین الله لێی دەگێڕنەوە

---

(١) تاريخ الخلفاء الامام جلال الدين السيوطی، لاپەرە ٣٢٢.

کە کەسێك بوو زۆر گرنگی بە موڵك و دەوڵەت دەدا و بێ ئاگا نەبوو، بەڵکو هەر زوو ئاگاداری زۆربەی ڕووداوەکان دەبوو دەزگایەکی هەواڵگری وای هەبوو، زوو هەواڵی بۆدەهات زۆر جار مێژوونوسەکان دەربارەی (ناصرلدین الله) دەڵێن جنۆکەی هەبووەو لەڕێی ئەوانەوە خزمەت کراوە، بەڵام ئەوە جۆرێکە لە ئەفسانە، بەڵکو دەزگای هەواڵگری بەهێز بوو هەتا گەیشتبوە ئەو ئاستەی ڕۆژانە هەواڵی بازارو گەڕەکەکانی ناو بەغدای بۆ دەهات، ئیمام زەهەبی دەفەرمێ لێی دەگێرنەوە: فێڵ و پلانی وای هەبوو زۆر جار ناخۆشی دەخستە نێو مەلیکە تەبایەکان و نێوانی دوو مەلیکی ناتەباشی چاکدەکرد و ئاشتی دەکردنەوە بەشێوازێکی ئاوا کە هەستی پێنەکەن.[1] بۆیە ئەو باسە دێتە گۆڕێ دوای ئەوەی خەواریزم شاە هەڕەشەی لە خەلیفە ناصر کرد ئایا ڕاستەخەلیفە ناصر نامە بەنهێنی بۆ (جەنگیزخان) دەنێرێ و داوای لێدەکات هێرش بکاتە سەر مەملەکەتی خەواریزم شاە؟

سەرتا دەچینە خزمەت کتێبی الکامل فی التاریخ ئیمام (ابن الاثیر) کەلەساڵێ (٥٥٥) کۆچی لەدایك بووە و لە ساڵی(٦٣٠) وەفاتی کردوە، ئەو سەرچاوەیە بەشایەدی دۆست و دوژمن سەرچاوەیەکی زۆر وردە لە مێژوو تادەگاتە ئەو ڕادەیەی، محمد ی کوڕی احمدی نەسەوی کە وەزیری جلال الدین منکبرتی کوڕی خەواریزم شاە بووە کتێبێکی تایبەتی

---

(١) سير أعلام النبلاء الرسالة (٢٢/ ١٩٥).

نوسیوە کەخۆی لەنێو ڕووداوەکان ژیاوە دەربارەی ئیمام (ابن الاثیر) دەفەرمێ: دوای ئەوەی کتێبەکەیم خوێندوە واتە: (الکامل فی التاریخ) کەباسی ڕووداوەکانی تەتار دەکات هەڵەی زۆر کەمی کردوە بۆیە ستایشی دەکاو دەڵێ : لله در مقیم بدیار الشام دعته همته الی ضبط ماحدث من الوقائع بأعالی بلاد الصین و أعماق دیار الهند.[1] ڕەحمەتی خوا لەو کەسەی کە لەشام جێنیشینە و هیمەتی ئەوەندە بەرزە بەتەواوی باسی ڕووداوەکانی سەروی وڵاتی چین و قوڵایی وڵاتی هیند دەکا، ئیمام (ابن الاثیر) دەبارەی خەلیفە ناصیر دەفەرمێ: کەسێکی خراپ و ستەمکار بوە زۆر جار کارێکی دەکرد و دواتر پێچەوانەی ئەو کارەی ئەنجام دەدا عێراق لەسەردەمی ئەو کاوڵ بوو خەڵکەکەی دەربەدەر بوون و موڵك ومالی ئەو خەڵکەی داگیر کرد خانوێکی دروستکرد بۆئەوەی لەمانگی ڕەمەزان خەڵکی هەژار ڕۆژی تێدا بکەنەوە ماوەیەك مایەوە دواتر خۆراکی لێبڕین، ئەو جارەی چەند خانوێکی دروستکرد بۆ حاجیان ماوەیەك مایەوە دواتر ئەویشی داخست هەندێ باجیشی تازە کردەوە و بەسەر ئەو خەڵکەی سەپاند، هەموو خەمی ئەو پیاوە هاوێشتنی بەرد بوو(رمی البندق) جۆرە قوڕێکی وشك کراوە یان بەردێکی خر بەزمانی ئەوڕۆ لەشێوەی (کەلا) بوو بەجۆرە کەوانێك دەهاوێشترا شێوەی (دارلاستیکی) یان (بەردەقانی) ئەوڕۆ، ئینجا دەزگایێکی بۆ گەنجان داناو کردی بەدەزگایەکی فەرمی و ناوی نا

---

(١) سیرة جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ٣٥.

(الفتوة) واتە گەنجی کۆدەکردنەوە فێرە ئەو بەرد هاوێشتنەی دەکردن و بەرگێکی تایبەتی بۆ ئامادەکردبوون ئەو گەنجانە بەشێوەیەکی وا ئامادە دەکران کە سیستەمی خیلافەت بپارێزن، ئینجا ئیمام ابن الاثیر دەفەرمێ: عەجەمەکان دەڵێن کە ئەو بوو تەماعی داگیرکردنی وڵاتە ئیسلامییەکانی دا بە تەتارەکان، ئەگەر ئەوە ڕاست بێ ئەوە تاوانێکی هەندە گەورەیە کە هەرچی تاوان هەیە لە تەکیا بچوك دەبێتەوە.(١)

دووەم: ئیمام ئیبن کەسیر لەکتێبی البدایة والنهایة گوتەکانی ئیمام ابن الاثیر نەقل دەکاو بەبێ ئەوەی هیچی لەسەر بڵێ، (٢)جا گرنگە لێرە ئەوە بزانین هەردوو ئیمام (ئیبن ئەسیرو ئیمام ئیبن کەسیر) لە سەردەمی عەبباسییەکان ژیاون نەیانتوانیوە لەوەزیاتر باسی ئەو بابەتە بکەن.

سێیەم: کتێبی کنز الدرر وجامع الغرر (٧/ ٢١٧) أبو بکر کوڕی عبد الله کوڕی أیبك الدواداري. دەربارەی خەلیفە ناصیر گوتەیەکی (ابن واصل) نەقل دەکا کەدەڵێ: خاوەنی کتێبی تاریخ بغداد: دەڵێ خەڵکێکی دیاری دەوڵەتی بەغدام بینی هەمویان دەیانگوت (خەلیفە ناصڕ) نامەی بۆ تەتارەکان نارد و داوای لێکردن دەوڵەتەکەی سوڵتان خەواریزم شاە بڕوخێنن، هەوڵەکانی خەلیفە ناصڕ بۆ ئەوە بوو کە ئەزمونی سەلجوقییەکان

---

(١) الکامل في التاریخ (١٠/ ٤٠٠).
(٢) البدایة والنهایة الفکر (١٣/ ١٠٧)

لەبەغدا دوبارە نەبێتەوە و خیلافەت جارێکی تر نەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی سوڵتانەکان و تەنها ناوێکی بێناوەڕۆك نەبێ.

چوارەم: کتێبی (مرآة الزمان في تواريخ الأعيان) (٢٢/ ٢٧٣) ئیمام شمس الدين أبو المظفر يوسف کوڕی قِزْأُوغلي کوڕی عبد الله ناسراو بە (سبط ابن الجوزي) کە لەساڵی (٦٥٤) کۆچی وەفاتی کردوە دەڵێ: لەساڵی (٦٢٢) (جەلال الدین)ی کوڕی سوڵتان خەواریزم شاە نامەی بۆ مەلیك (المعظم) دەنێرێ و پێی دەڵێ: وەرە هێزەکانمان کۆبکەینەوەو باپێکەوە بچینە سەر خەلیفە ناصرِ لەبەر ئەوەی خەلیفە ناصرِ هۆکاری ئەوە بوو کافرەکان ڕوو بکەنە وڵاتی ئێمە، ئێمە نامەی ئەومان لایە کەبۆ خیتائییەکانی ڕەوانەکردوە و پارەی بۆ ناردوون تاوەکو هێرش بکاتە سەر دەوڵەتی خەواریزم، بەڵام (المعظم) وەڵام دەداتەوە دەڵێ: لەگەڵتدام لەزۆر خاڵان، بەڵام ناکرێ و بۆم نییە بەشداری هێرشێك بکەم بۆسەر خەلیفە، لەبەر ئەوەی ئەو ئیمامی موسڵمانانە، دواتریش لەباسی هێرشی جلال الدين منکبرتی بۆسەر داقوق زیاتر باسی ئەو نامەیە دەکەین[(١)].

---

(١) تێبینی: لەکتێبی (دولة المغول والتتار بين الانتشار والانكسار) د.محمد علی صەلابی داهاتوە کەئەوەڕاست نییە کە خەلیفە ناصرِ پەیوەندی بە تەتارەکان کردبێ، صەلابی دەڵێ: جگە لەمێژووەکەی ئیمام (ابن الاثير) کەسی تر، باسی ئەوەی نەکردوە و دەڵێ (ابن الاثير) ڕقی لە خەلیفە ناصرِ بۆتەوەو بۆیە ئەو تۆمەتەی داوەتە پاڵی، پێمان وایە (صەلابی) لەوخاڵە نەیپێکاوە ئەوەی سەیرە ئەو دەڵێ: هیچ سەرچاوەی تر باسی نەکرد و بۆنمونە باسی کتێبی (مراءه الزمان) ئیمام (سبط ابن الجوزی) دەکات دەڵێ ئەوانە باسیان نەکردوە، بەڵام

بەهەر حـاڵ پەیوەنـدیکردنی خەلـیفە ناصـرٍ بە تەتارییەکـان بـابەتێکی هەستیارە گەرچی هەندێك ئەوە بەتۆمەت دەزانن بە خەلیفە ناصرٍ کراوە، بەڵام پێمـان وانیـیە ئەوبـابەتە هـیچ ئەصـلێکی نەبێ، ئینجـا ئەوەی زۆر گرنگە ئەوەیە ئەوڕۆ لەو سەردەمەی ئێمە زۆر باسی (وەلائو بەڕا دەکرێ) بۆنمونە کێشـەیەکی زۆر لە نێوان زانایـان دروست بـوو لەسـەر هێنـانی هێزە ئەمریکییەکان بۆ دەرکردنی هێزەکانی حکومەتی عێراق لە کوەیت، بەڵام ئەو کـات واتە بەر لەهـاتنی تەتـار بۆسـەر جیهـانی ئیسـلامی ئەو حـوکمە شـەرعییە زۆر پێشـێل کرابـوو تەنـانەت دوای (صـلاح الـدینی ئەییـوبی) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەلایەن هەندێ لە مەلیکەکان پێشبڕکێ دەکرا بۆ هێنانی هێزی خاچ پەرەستەکان بۆ نـاوچەکەو شـکاندنی نـاحەزانی خۆیـان، هەر وەها ئاماژەمان پێکرد بەوەی خودی سوڵتان خەواریزم پەلکێشی هێزی خیتاییەکانی کرد بۆ گەیشتن بە کورسی دەسەڵات، کەوابوو ئەوەی خەلـیفە ناصرٍ سەرەڕای ئەوەی تاوانێکی زۆر گەورەیە، بەڵام دور نییە ئەو لە چوار چێـوەی ئەو پلانـانە حەزی کـردوە تەتارەکـان هێـرش بـکەنە سـەر دەوڵەتـی خەواریـزم شـاە بـۆ لاواز کردنـی و پاراسـتنی خـیلافەت و بەغـدا لەوەی نەکەوێتە ژێر چنگی سوڵتان خەواریزم شاە، خەلیفە ناصرٍ ئەوەی لەحیسابدا نەبـووە کە ئەو هێـزە ڕوویـان لە جیهـانی ئیسـلامی کـرد جـارەکی تـر

---

بەداخەوە لەوە نەپێکاوە و (سبط ابن الجوزی) باسی ئەوەی کردوە هەر وەکو لە گەمارۆی داقوق زیاتر باسی دەکەین .

ناگەڕێنەوە و تەنها بە ڕوخانی دەوڵەتی خەواریزمییەکان ناوەستن، بەهەر حاڵ هەر چی بڵێین دیفاع لە هەڵوێستی خەلیفە ناکەین و کارەساتێکی گەورەیە خەلیفەی موسڵمانان بۆ پاراستی کورسی خیلافەتی خۆی ڕوو لەهێزێکی وەحشی وەسەنی وەکو مەغۆلەکان بکات.

ئینجا دەگەڕێینەوە بۆسەرەتای ڕووداوەکان ومەغۆل چۆن هاتنە سەر سنوری دەوڵەتی خەواریزم، دوای ئەوەی سوپای خەواریزم شاه دەشکێ و بەغدای پێناگیرێ بەشکەستێکی گەورە وە دەگەڕێتەوە هەتا زۆرێك لەشوێنکەوتوانی خەواریزم شاه گوتیان قوربان ئەوە تۆڵەی خوایە لەبەرئەوەی نەدەبوو هێرش بکەیتە سەر خیلافەتی ئیسسلامی، بنەماڵەی عەبباسییەکان بنەماڵەیەکی پیرۆزن، ئەوە بیرو باوەڕوی زۆرێك لەشوێن کەوتوانی خەواریزم شاه بوو.

# ڕووداوەکانی ساڵی (٦١٥) کۆچی و جەنگیزخان چۆن توانی دەوڵەتەکەی (کشلی خان) لەناو ببا

دوای ئەوەی کشلی خان دەبێتە هێزێکی گەورەی ناوچەکەو هەواڵی ئەو هێـزە دەگـاتە (جەنگیزخـان) جەنگیزخـان کەدوژمنێکـی سەرسـەختی (کشلوخانە) و بەهیچ جۆرێك ڕازی نەدەبوو ناوچەیەکی فراوان بکەوێتە ژێـر دەسـەڵاتی (کشـلوخان) و هـۆزو تیرەکـانی نـاڕازی بەسیاسـەتی جەنگیزخان کۆبکاتەوە، بۆیە فەرمانی کرد سەری (کشلوخانی) بۆ بێنن و سوپایەکی بیست هەزار کەسی بەسەرکردایەتی (شپی) بۆ ئەو مەبەستە ڕەوانەی ناوچەکە کرد و داوای کرد (کشلوخانی) بۆ بێنن بەزیندویی یان بە مردویی، (شپی) دەگاتە ناوچەکە و بڕیار دەدا هەرکەسەو ئازادە چ ئاینێك هەڵدەبژێرێ، خەڵکی ناوچەکەش زۆر بێزار ببون لەوستەمەی (کشـلوخان) لێیـدەکردن بەتـایبەت موسـڵمانەکان لەبەر ئەوەی فشـارێکی زۆریان لەسەربو کشلوخان هەوڵی دەدا ئەو موسڵمانانە بەرەو (بت پەرستی) ببا، ئەوەبو خەڵکی ناوچەکە سـەرەتا دڵیـان زۆر خـۆش بـوو بەهـاتنی هێزەکـانی جەنگیزخـان بـۆ نـاوچەکە و ڕاپەڕیـن بەڕوی هێزەکـانی (کشـلوخان)و بەمـاوەیەکی کەم تەواوی نـاوچەکە کەوتە دەسـت هێزەکـانی

جەنگیزخـان.[١] کشـلوخان کە دەسـەڵات لەو ناوچانە لەدەست دەدا خۆی و چەنـد کەسـێکی دەوروبەری دەگەنە نـاوچەی (کاشـغر) کەئێسـتا سـەر بە تورکسـتانی خـۆرهەڵاتە و لە چـوار چێـوە (چـین) دایە ئـاڵەو نـاوچەیە دەکەوێـتە بۆسـەی چەنـد ڕاوچییێـك و بەدیـل دەگیـرێ و ڕاوچییەکـانیش ڕادەستی هێزەکانی جەنگیزخانی دەکەن و هەر ئەو کات لەگەردەنـی دەدرێ و سـەرەکەی دەبەنەوە بـۆ جەنگیزخـان.[٢] بەو شـێوەیە تەواوی نـاوچەکە دەکەوێـتە دەسـت هێزەکـانی جەنگیزخـان و سـنوری دەوڵەتـی جەنگیزخـان دەکەوێتە سەر سنوری دەوڵەتی خەواریزم شاه.

(١) الدولة الخوارزمية والمغول، لاپەرە ٨٠ .

(٢) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، لاپەرە ٩٨.

## هۆکاری هێرشەکەی جەنگیزخان بۆسەر دەوڵەتی (خەواریزم شاه) و چیرۆکی کوشتنی بازرگانەکان

دوای ئەوەی سنوری دەوڵەتەکەی (جەنگیزخان) دەگاتە سەر سنوری دەوڵەتەکەی (خەواریزم شاه) و تا ڕادەیەك ناوچەکە بەرەو سەقامگیری ودەڕوات، لەبەر ئەو هەموو شەڕەی سوپاکەی جەنگیزخان کردبووی، تا ڕادەیەکی زۆر کاروانی بازرگانەکان لە چینەوە بۆ شوێنی تر ڕاوەستابوو، بەوهۆیەوە گرانییەکی زۆر ڕوی لە چین کردبوو، بەتایبەت لە بواری قوماش و بەرگەوە (جەنگیزخان) لە هەوڵی بوژانەوەی ئابوری دابوو، ئالەو کاتە ٣ بازرگان ی موسڵمان بەناوی (احمد جندی و ابن الامیر حسین و واحمد بالخج) بڕیار دەدەن بچن بۆ مەملەکەتەکەی جەنگیزخان، جەنگیزخانیش بەمەبەستی بوژانەوەی باری ئابوری لە سەر هەر قۆناغێکی (ڕێگا بازرگانییەکان) چەند کەسێکی دانابوو بەناوی (قراقجیان) بۆ پاراستنی ڕێگاکە لە دزو چەتە و هاندەرێکیش بێ بۆ بازرگانەکان ترسیان نەمێنێ و ڕوو لە مەملەکەتەکەی بکەن، هەر سێ بازرگان کاڵایەکی زۆر گران بەها دەبن بۆ چین و دەگەنە دیوانی (جەنگیزخان) سەرەتا یەکێك لەبازرگانەکان کەناوی (احمد جندی) بوو، داوای نرخێکی یەکجار زۆر دەکا بۆ ئەو کاڵایانەی کە پێیەتی بەتایبەت بەرگێك کە جەنگیزخان پێی جوان بوو ویستی بیکڕێ، ئینجا کە ئەو نرخە

زۆرە دەبیستێ، جەنگیزخان تووڕە دەبێ و دەڵێ: ئەوانە پێیان وایە ئێمە بەرگی واگران بەهامان نەبینیوە! بۆیە داوای ئەو نرخە زۆرە دەکات کە شایستەی ئەو نرخە نییە، فەرمان دەکات بە گرتنی (احمد جندی) دەگرن و دەیخەنە بەندینخانەو ئەوەی پێشی بوو هەمووی دابەشی سەر خۆیان دەکەن، ئینجا جەنگیزخان بەدوای دوو بازرگانەکەی تر دەنێرێ، ئەوان کەهەواڵی گرتنی (احمد)ی هاوڕێیان دەزانن دەترسن و دەڵێن قوربان ئێمە ئەو کاڵایانەمان وەکو دیاری بۆ ئێوە هێناوە، ئینجا جەنگیزخان کاڵاکان دەکڕێ و لەبەر خاتری ئەو دوو بازرگانەی (احمد)ی هاوڕێشیان ئازاد دەکا و پارەی کاڵاکانیشیان پێدەداو داوا لەسوپاکەی دەکات کەدەبێ ئەو بازرگانانە بەسەلامەتی بگەنەوە شوێنی خۆیان، ئەو سێ بازرگانە بە سەلامەتی دەگەنەوە شوێنی خۆیان و پیاوەکانی جەنگیزخان پارێزگاریان لێدەکەن تاوەکو دەگەڕێنەوە مەملەکەتەکەی سوڵتان(خەواریزم شاە)[1] ئینجا جەنگیزخان وەفدێکی بازرگانی ڕەوانەی لای خەواریزم شاە دەکات و لەگەڵ ئەو وەفدە نامەیەك بۆ خەوارزیم شاە دەنێرێ پێی دەڵێ: کە بازرگانەکانی ئێوە بەسەلامەتی گەیشتنەوە لای خۆتان، وەفدەکە پێکهاتبوون لە(محمودی خەواریزمی وعەلی خەواجەی بوخاری و یوسف کەنکای ئۆتراڕی) وەفدەکە دەگەنە لای خەواریزم شاە و نامەکەی جەنگیزخانی بۆ دەخوێننەوە جەنگیزخان لەنامەکەی دەڵێ:

---

(١) تاريخ فاتح العالم، ج ١ لاپەڕە ١٠٧، علاء الدين عطا ملك الجويني .

ليس يخفى علي عظيم شأنك، ومابلغت من سلطانك، ولقد علمت بسطة ملكك، وانفاذ حكمك، في اكثر أقاليم الارض، وانا ارى مسالمتك من جملة الواجبات، وانت عندي مثل أعز اولادي، وغير خاف عليك ايضا أنني ملكت الصين وما يليها من بلاد الترك، وقد أذعنت لي قبائلهم، وانت اخبر الناس بان بلادي مثارات العساكر، ومعادن الفضة، وأن فيها لغنية عن طلب غيرها، فان رأيت ان تفتح للتجار في الجهتين سبيل التردد، عمت المنافع و شملت الفوائد [(١)].

جەنگیزخان لەو نامەیە چەند خاڵێك دەوروژێنێ سەرەتا باسی دەسەڵات و دەوڵەتی خەوارێزم شاه دەكات و دان بەهێزو توانای دەوڵەتەكەی دەنێ، لەهەمان كاتیشدا دوو هەڕەشەی ناڕاستەو خۆی تێدایە یەكیان پێی دەڵێ: من خاوەنی تەواوی چین و دەورو بەریمە و هەروەها خۆی بەخاوەنی هۆزو عەشیرەتە توركەكان دەزانێ، لەگەڵ خاڵێكی تر كەدەڵێ: تۆلای من وەكو بەڕێزترینی كوڕەكانمی، دوای ئەو خاڵانە ئینجا داوا دەكات كە ڕێگای بازرگانی نێوان هەردوو وڵات ئاوەدان بكرێتەوە ودەرگاكان بەڕووی بازرگانەكان والا بكرێ .

ئەوەی جێی سەرنجە لێرە ئەو خاڵەیە ئایا تا چەند لە عورفی سیاسی ئەو كات پادشایەك دەتوانێ بەپادشایەكی تر بڵێ: تۆ وەكو كوڕی منی؟ پێیان وابوە بەكارهێنانی ئەو جۆرە دەستەواژەیە بۆ مەلیك و پادشاكان

---

(١) سيرة السلطان جلال الدين منكبرتى، لاپەڕە ٨٤. تاريخ الخلفاء للسيوطى، لاپەڕە ٣٠٤.

سـوكايەتی بـووە، ئەوە يەكـێكە لەوخـاڵانەی كە (خەواريـزم شـاە) لەدڵـی گرتوەو بەبێڕێزییێكی گەورەی زانیوە بۆیە شەو بەنهێنی لەدوایی (محمود خەواريزمی) دەنێرێ كە یەكێك بوە لەو سێ بازرگانە و پرسیاری لێدەكات دەربـارەی جەنگیزخـان و سـوپاكەی و پێـی دەڵـێ: تـۆ یەكێكـی لە ئـیمەی خەواریزمی دەبێ، خۆشەویستی ئیمەت لەدڵ دابێ و چاوی ئێمە بی لە سـەر جەنگیزخـان، سـوڵتان (خەواريـزم شـاە) پـارەیەكی زۆر بەو كەسـە دەبەخشێ و پێی دەڵێ: ڕاستم پێ بڵێ، ڕاسـتە (جەنگیزخان) خاوەنی ئەو هەموو مەملەكەت و ئەو سوپا گەورەیەیە؟ ئەویش دەڵێ: بەڵێ قوربان ئەوە ڕاستە، ئینجا سوڵتان (خەواريزم شاە) پێی دەڵێ: تۆ دەزانی مـن خاوەنی سـوپایەكی چەنـدە بەهێـز و مەملەكەتێكـی چەنـد فـراوانم، ئەو مەلعـونە (مەبەسـتی جەنگیزخـانە) چـۆن جـورئەت دەكـا بەمـن بڵـێ: تـۆ وەكـو ئـازیزترینی كوڕەكـانمی؟ ئەو كـاتە (محمـود خەواريـزم) دەزانـێ سـوڵتان خەواریزم زۆر توڕە بووە دەڵێ: قوربان ئەو سوپایەی كە ئەو هەیەتی ئەگەر بەراورد بكرێ لەگەڵ ئەو سوپا زۆرەی جەنابت، ئەوا سوپاكەی ئەو وەكو دوكەڵێكە لەتاریكە شەو، یان وەكو تاكە سوارێكە لەنێو سوپایەكی گەورەدا، (محمود خەواریزم) هەوڵی خۆ ڕزگاركردن دەدا، بە دڵی سوڵتان (خواریزم شـاە) قسـان دەكـات و زانیـاری زۆر هەڵەی پێـدەدا، ئەوە بـوو سـوڵتان (خەواريـزم شـاە) پەیمـانەكە قبـوڵ دەكـات و ڕێگـای بازرگـانی نێـوان مەملەكەتـی (خـواریزم شـاە) و مەملەكەتـی (جەنگیزخـان) دەبێـتەوە،

جەنگیزخان بەو پەیمانە زۆر دڵخۆش دەبێ، بۆیە چەند بازرگانێكی چینی ڕەوانەی خۆرهەڵات دەكات و دەگەنە مەملەكەتی (خەواریزم شاە) شاری (ئۆترار)[1] حاكمی ئەو شارە ناوی (یەنال خانە)[*] كوڕە خاڵی (خەواریزم شا)یە، هەندێكیش لەسەرچاوەكان دەڵێن: خاڵی(خەواریزم شاە)بوە، وەفدەی بازرگانەكانی تەتار پێكهاتبوون لە (عومەر خەواجەی ئۆترای و حەمالی مەراغی و فەخرەدینی دەنزكی بوخاری و ئەمینەدینی هەرەوی) ماڵ و كالایەكی زۆریان لەگەڵ خۆیان هێنابوو لەو مەمەلەكەتە بیفرۆشن و كالای تر بكڕن و بیبەنە وە (چین) مەملەكەتەكەی جەنگیزخان.

خاڵێكی گرنگ هەیە ئاماژەی پێبكەین، دەربارەی ژمارەی بازرگانەكان عەلائەدینی جوەینی دەڵێ: ژمارەی بازرگانەكان (٤٥٠) كەس بووینە.[2] (ابن العبری) لەكتێبی تاریخ مختصر الدول لاپەڕە ٣٠٩ دەڵێ: ژمارەیان (١٥٠) بازرگان بووە، بۆ كۆكردنەوەی ئەو بۆ چونانە دەڵێین: خۆی مەعقوڵ نییە كاروانێكی بازرگانی تەنها بە چوار كەس بكەونە ئەو ڕێیە، لەكاتێك هەندێك لە سەرچاوەكان دەڵێن: كاروانەكە پێكهاتبوو لە (٥٠٠) وشتر،[3] ئەو كاروانە جەنگیزخان پاسەوانی بۆ داناوە كالاو پارەیەكی

---

(١) ناوی شارێك بووە كەدەكەوێتە وڵاتی كازاخستانی ئێستا هەندێك بە ئۆطرار ناویان بردوە : اسم مدينة حصينة وولاية واسعة في أول حدود الترك بما وراء النهر على نهر سيحون قرب فاراب، وبعضهم يقول: أترار معجم البلدان (١/ ٢١٨).

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ٦ .

(٢) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني. لاپەرە ١٠٨

(٣) الدولة الخوارزمية والمغول حافظ احمد حمدي، لاپەڕە ٨٥

زۆریـان پێبـوە، بـۆیە دەکرێ بڵێـین ئەو سـێ کەسـە سەرپەرشـتی و گەورە بازرگـانی ئەو کـاروانە بـوینە، ئەوانەی تـر هەنـدێکیان وەکـو پاسـەوان و هەندێکی تریش لە بازرگانە بچوکەکان و خزمەتکارەکان بوینە.

هەمـوو ئەوانە پـێکەوە، گەیشـتونەتە (ئـۆترارِ) و (یەنـال خـان)ی حـاکمی ئۆترارِ خاوەن سوپایەکی بیست هەزار کەسی بـوو لەو شـارە، کە چاوی بە پـارەو کـاڵا گـران بەهاکـانی ئەو بازرگانـانە دەکەوێ تەمـاحی تێـدەکاو، نامەیەك دەنێرێ بۆ (خەواریزم شاە) و دەڵێ: چەند سـیخورەکی جەنگیزخان لەبەرگی بازرگان هاتونەتە شارەکەی ئـیمە (ئـۆترارِ) ئەوانە بازرگـان نیـنە سـیخورن کەبەتەنها دەبـن لەگەڵ ئەو خەڵـکە، دەیـان ترسـێنن و پێیـان دەڵـێن خەڵکینە ئێوە نازانن چ سوپایەکی گەورە بەڕێوەیە بۆ ئێرە (مەبەسـت پێـی سوپاکەی جەنگیزخانە) یەنال خان (خەواریزم شاە) وا حـاڵی دەکـا، کەئەوانە هـاتون تەنهـا بـۆ ترسـاندنی ئەو خەڵـکە و زانیـاری لەسـەر مەمـلەکەت و سوپای (خەوارزیم شاە) بۆ جەنگیزخان دەنێرن، دیارە کە ئەو نامەیە دەگـاتە (خەواریزم شاە) فەرمانی دەستگیر کردنـی ئەو بازرگانـانە دەدا، یەنـال خـان بەگرتنیان ناوەستێ و بازرگانەکان دەکوژی، ئەو پارەو کاڵایانەی پێیـان بـوو هەمـــوی زەوت دەکـــا.[١] لەســـەرچاوەکان زۆر جـــار دەگـــوترێ (کۆمەڵکـــوژیەکەی بازرگانەکـــان) واتە هەر هەمـــوو ئەوەی لەگەڵ ئەو کـاروانە بـوون هەمویـان دەکـوژرێن تەنهـا یەك کەس ڕزگـاری دەبـێ و

(١) سیرة السلطان جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ٨٦

هەواڵەکە دەگەیەنێتە (جەنگیزخان)، کەجەنگیزخان هەواڵی کوشتنی تەواوی بازرگانەکان دەبیستێ زۆری پێتێك دەچێ و لەهەندێك سەرچاوە هاتوە، خەفەتەکەی ئەوەندە گەورە دەبێ بۆ چەند ڕۆژێك ناتوانێ بخەوێ، لێرە هەندیك لەسەر چاوەکان دەڵێن: جەنگیزخان بەرلەوەی هیچ بڕیارێك بدات دەچێتە سەر گردێك و سێ ڕۆژ دەمێنێتەوە ئینجا بڕیار دەدا و دیسان هەوڵێکی تری دبلۆماسی دەدا بۆ کۆنترۆڵکردنی حاڵەتەکە، وەفدێك دەنێرێ پێکهاتبوون لە(٣)کەس، بەرپرسی وەفدەکە کەسێکی موسڵمان بوو کوڕی یەکێك لەسەرکردە سەربازییەکانی باوکی سوڵتان خەواریزم شاه بووە، ئەو موسڵمانە لەڕیزی تەتارەکان بووە بەناوی (ابن کفرج) لەگەڵ دوو کەسی تری مەغۆلی کەنامەی (جەنگیزخان)یان پێیە نامەکەی جەنگیزخان دەخوێیننەوە و بە خەواریزم شاە دەڵێ: أنك قد أعطيت خطك ويدك بالامان للتجار وان لاتتعرض الى احد منهم، فغدرت ونكثت، والغدر قبيح ومن سلطان الاسلام اقبح، فان كنت تزعم ان الذي ارتكبه ينال خان كان من غير امر صدر منك فسلم ينال خان الي لاجازيه على مافعل حقنا للدماء وتسكينا للدهماء، والا فأذن بحرب ترخص فيها غوالي الارواح وتتعضد معها عوامل الرماح) [(١)]جەنگیزخان لەڕێی ئەو وەفدەوە نیگەرانی خۆی دەردەبڕێ و بە خەواریزم شاە دەڵێ: تۆبەڵێنت دا کەدەست بۆ ئەو بازرگانانە درێژ نەکەی و سەلامەتی ئەوان بپارێزی بەڵێن شکاندن غەدرە و زۆر

---

(١) سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، لاپەڕە ٨٧.

ناشـرینە لە سـوڵتانی ئیسـلام هەر عەیبەیەکـی یەکجـار گەورەیە، ئەگەر ڕاسـتە کوشـتنی ئەو ئەو بازرگانـانە بەفەرمـانی تـۆ نەبـوە (ینـال خـان) حاکمی ئۆترارِ کردویەتی ئەوا (ینال خان)مـان ڕادەست بکەو تۆڵەی ئەو بازرگانانەی لێدەسەنینەوە ئەگەر ئەوەش نەکەی چاوەڕوانی جەنگێکی زۆر گەورەبە ئەوەی نرخی تێدا نەبێ ڕۆحە.

لێرەدا خەوارێزم شاە دەکەوێتە هەڵوێستێکی یەکجار نـاخۆش، ئەو ناتوانێ یەنـال خـان تەسـلیم بە جەنگیزخـان بکـا لەبەر ئەوەی زۆربەی سـەرکردە سـەربازییەکان لە عەشیرەتی ینـال خـان بـوون کەدەکەنە خـاڵوانی خەوارێـزم شـاە[1] بـۆیە هەنگـاوێکی زۆر نـاحەکیم و ناعـاقلانەی تـر دەهـاوێ ئەویـش کوشتنی وەفدەکەی جەنگیزخانە، کە لەعورفی سیاسی ئەو کـاتیش نێردراو نـاکوژرێ، هەتـا پێغەمـبەری خـوا صـلى الله عليـه وسـلم وەفـدەکەی مسـیلمەی درۆزنـی نەکوشـت فەرمـوی: وَاللهِ لَـوْلا أَنَّ الرُّسُـلَ لا تُقْتَـلُ لَضَـرَبْتُ أَعْنَاقَكُمَـا.[2] پێغەمـبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) وەفـدو نـوێنەری موسـەیلەمەی درۆزنـی نەکوشـتوە، خەوارێـزم شـاە بە چ مافێك دەست بـۆ وەفـدی دانوسـاندنی مەغـۆل درێـژ دەکـات و دەیـانکوژێ؟ بـۆیە بەداخەوە هەندێ کتێب لەو بوارەوە دەخوێنیتەوە جێی مەخابنە بەهانە بۆ کوشتنی ئەو وەفـدە دێینـنەوە یـان بەهـانە بـۆ کوشـتنی بازرگانەکـان دەهێنـنەوە و دەڵـێن

---

(١) سيرة السلطان جلال الدين منكبرتي، لاپەڕە ٨٨ .
(٢) مسند أحمد الرسالة (٢٥/ ٣٦٦)

ئەوانە سیخوریان کردوە بۆ جەنگیزخان، ئەو ڕووداوانە دەبەنە چوار چێوەی ململانێـــی کـــوفر و ئیمـــان، بەڵام کە ڕوداوەکە دەخـــوێنیتەوە لەخـــودی سەرچاوەکان بەتایبەت لەکتێبەکەی سیرة السلطان جلال الدين منكبرتي، کە تا دوا نەفەس لەگەڵ سوڵتان جەلالەدین بووە، لەو کتێبە دەردەکەوێ بەڵێ (جەنگیزخـان) تـاغوت و سـتەمکار بـووە، بەڵام دەسـتپێکردنی جەنـگەکە هۆکارەکەی سیاسەتە نا ئیسلامی و ناحەکیم و ناعەقلانییەکەی (خواریزم شاه) بوو، جەنگیزخان چەندە تاوانبارە لەوەی بەسەر جیهانی ئیسلامی هێنا ئەوەندەش خواریزم شاه تاوانبارە کە ئوممەتێکی کردە قوربانی شەهوەت و مـاڵی دونیـا، کەدواتـریش لە گفتوگـۆیەك لەسـەر کتێـبەکەی (راغیبـی سـەرجانی) زیـاتر درێـژە بەو بـابەتە دەدەیـن، کەوابـوو (خەواریـزم شـاه) وەفـدەکەی (جەنگیزخان)ی کوشـت کە بـۆ دانوسـاندن ڕەوانەی کردبـوو، بەو هەڵوێستەشـی هـیچ نەفەسـێکی نەهێشـت بـۆ دۆزیـنەوەی دەرچەیەکـی ئاشتیانە لەو کێشەگەورەیە، کەدواتر نەك هەر خۆی و بنەماڵەکەی، بەڵکو ئەو ئوممەتە باجی حەماقەتی ئەو حاکمەیان دا.

## چەند تێبینی و سەرنجێك لەسەر كتێب و وتارەكانی راغب السرجانی

مێژووی ئوممەتی ئیسلام مێژوویەكی قوڵە بەقوڵایی زەمەن و سەرەتای ئەو مێژووە لەگەڵ هاتنی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) دەستپێناكات، بەڵكو لەگەڵ هاتنی ئادەم علی نبینا وعلیه الصلاة والسلام دەستی پێكردووە، هیچ ئوممەتێكیش خاوەن مێژوویەكی ڕاست نیە وەك مێژووی ئوممەتی ئیسلام خوای پەروەردگار، باسی بەسەرهاتی پێغەمبەران و ڕووخانی ژیاروو عاقیبەی كوفرو میحنەت و خۆڕاگری بڕوادارانی كردووە لەقورئانی پیرۆز، كە بێگومان ئەوانە هەمووی زادەی بەردەوامی ڕێیەو پەندو عیبرەت لەهەڵەكان و سوود وەرگرتن لە هەنگاوە ڕاستەكانە، لەدوای تەواو دابەزینی قورئان و وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم)، دیسان مێژووی ئیسلام تایبەتمەندی خۆی هەیەو ڕووداوەكان دەستی پاك و دڵی پڕ لەباوەڕ بە ئەمانەتەوە نەقڵی كردوون مێژووەكەی ئیمام الطبری و، ئیمام ابن كەثیرو، امام ابن الاثیر و، مەقریزی و، ابن خەلەكان و.. بەڵگەی زیندوون لەسەر ئەو ڕاستییە.

یەكێك لەو ڕووداوە دڵ تەزێنانەی كە مێژووی ئیسلامی تۆماری كردووە هێرشەكەی جەنگیزخانە، هێرشی جەنگیزخان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی كارەساتێكی گەورە بوو سەرەڕای ڕق و قینی ئەهلی كوفر دژ بەجیهانی

ئیسلامی، هەڵەی حاکمێکی نا حەکیمیش ڕێخۆشکەری ئەو هێرشە بوو. ڕووداوەکە ئەوەندە دڵتەزێنە ئیمام ابن الاثیر ڕەحمەتی خوای لێبێ بۆچەند ساڵێك قەڵەمی داناوە و نەیتوانیوە باسی ئەو ڕووداوە بکات، بۆیە دەفەرموێ: لقد بقيت عدة سنين معرضاً عن ذكر هذه الحادثة استعظاماً لها، كارهاً لذكرها، فأنا أقدم إليه رجلاً وأؤخر أخرى، فمن الذي يسهل عله أن يكتب نعي الإسلام والمسلمين، ومن الذي يهون عليه ذكر ذلك؟ فيا ليت أمي لم تلدني، ويا ليتني مت قبل حدوثها وكنت نسياً منسياً، إلا أني حثني جماعة من الأصدقاء على تسطيرها وأنا متوقف، ثم رأيت أن ترك ذلك لا يجدي نفعاً، فنقول: عمت الخلائق، وخصت المسلمين، فلو قال قائل: إن العالم مذ خلق الله سبحانه وتعالى آدم، وإلى الآن، لم يبتلوا بمثلها" لكان صادقاً، فإن التواريخ لم تتضمن ما يقاربها ولا ما يدانيها)[1] ئەوە قسەکانی ئیمام ابن الاثیرە، کە ئەو ئیمامە بەڕیزە لەساڵی (٦٣٠) کۆچی وەفاتی کردوە، واتە کەوتن و گرتنی بەغدای نەدیوە کە لەساڵی (٦٥٦) ڕوویدا ئاخۆ ئەگەر گرتنی بەغدای بدیتبا دەبا چی بووتبا؟!

لەو ڕۆژگارەماندا جێی دڵخۆشی یە کەسانێك هەبن خەریکی لێکۆڵینەوەی مێژووی ئیسلامی بن بەئینصافەوە باس لەڕووداوەکان بکەن، پەند لەهەڵەکان وەرگیرێ و سوودمەندیش بین بە هەنگاوە ڕاستەکان.

(١)الکامل في التاريخ ٣٠٤/٥

(راغب السرجاني) یەکێکە لەو بەرێزانەی باسی ڕووداوەکەی تەتاری کردووە، خەڵکێکی زۆریش گوێبیستی وتارەکانین، کتێبەکەشی (قصة التتار من البداية الى عين جالوت) ڕەواجێکی زۆری هەیە، بەڵام کەماڵ تەنها بۆ کتێبی خوای پەروەردگارە سبحانە وتعالی وە تەنها کتێبەکەی ئەو بێهەڵەیە، (راغب السرجاني) لەکتێبەکەی دەربارەی کوشتنی بازرگانەکان لەلایەن خەوارزم شاو و دەربارەی هۆکاری هێرشەکەی جەنگیزخان دەڵێ:

وكان جنكيزخان في شبه اتفاق مع ملك خوارزم (محمد بن خوارزم شاه) على حسن الجوار، ومع ذلك فلم يكن جنكيزخان من أولئك الذين يهتمون بعقودهم، أو يحترمون اتفاقياتهم، ولكنه عقد هذا الاتفاق مع ملك خوارزم ليؤمّن ظهره إلى أن يستتب له الأمر في شرق آسيا، أما وقد استقرت الأوضاع في منطقة الصين ومنغوليا، فقد حان وقت التوسع غرباً في أملاك الدولة الإسلامية!..)
واتە: جەنگیزخان لە نیمچە پەیمانێك دابوو لەگەڵ خەوارزم شاه گەرچی جەنگیزخان لەو کەسانە نەبوون کە پەیمان بپارێزن، بەڵام ئەو پەیمانەی بۆ ئەوە بوو تاکێشەکانی تری چارەسەرکات دوای یەکلاکردنەوەی کێشەکانی ناوچەی چین و مەنغولیا کاتی ئەوە هات ڕوو بکاتە وڵاتە ئیسلامییەکان، واتە جەنگیزخان بەدوای بەهانەیەك گەڕاوە بۆ هێرش کردنە سەر وڵاتە ئیسلامییەکان و پەیمانەکەی بشکێنێ.

هەروەها دەڵێ: ولكن.. حتى تكون الحرب مقنعة لكلا الطرفين، لابد من وجود سبب يدعو إلى الحرب، وإلى الادعاء بأن الاتفاقيات لم تعد سارية، وقد

بحث "جنكيزخان " عن سبب مناسب، ولكنه لم يجد... ولكن - سبحان الله - لقد حدث أمر مفاجئ بغير إعداد من جنكيزخان!!.. وهذا الأمر المفاجئ يصلح أن يكون سبباً مقنعاً للحرب.. نعم، لقد جاء هذا السبب مبكراً بالنسبة لإعداد جنكيزخان ولرغبته، ولكن لا مانع من استغلاله... ولا مانع أيضاً من تقديم بعض الخطوات في خطة الحرب، وتأخير بعض الخطوات الأخرى..) بەڵام بۆئەوەی جەنگ جێی قەناعەتی هەردوو لابێ دەبێ هۆكارێك هەبێت لەسەر ئەوەی كە پەیمانەكان هیچ ڕیزێكی نەماوە، جەنگیزخان گەڕا بەدوای هۆكارێك، بەڵام نەیدۆزیەوە... بەڵام لەپڕو كارێكی چاوەڕوان نەكراو، هاتە پێش بەبێ ئەوەی جەنگیزخان دەستی تیا هەبێ، ئەو كارە چاوەڕوان نەكراوە دەشێ ببێتە مایەی شەڕێكی موقنیع... بەڵێ ئەو هۆكارە خۆی هێنا پێشەوە گەرچی زوو بوو لەهاوكێشەكەی جەنگیزخان، بەڵام ئەوە نەبووە مایەی ئەوەی ئەو هەلە نەقۆزێتەوە. ئینجا دەڵێ: (ما هي الذريعة التي دخل بها "جنكيزخان " أرض خوارزم شاه؟! لقد ذهبت مجموعة من تجار المغول إلى مدينة "أوترار " الإسلامية في مملكة خوارزم شاه.. ولما رآهم حاكم المدينة المسلم، أمسك بهم وقتلهم...!) بەڵام ئەو بەهانەیە چ بوو كە جەنگیزخان پێی هاتە خاكی خەوارزم شاه، چەند بازرگانێكی مەغۆل هاتنە شاری أوترار (otrar)، حاكمی ئەو شارە چاوی بەو بازرگانانە كەوت گرتیانی و كوشتنی، ئینجا دەڵێ: (أما عن سبب قتلهم.. فقد اختلف المؤرخون في تفسير هذه الحادثة: فمنهم من يقول: إن هؤلاء ما كانوا إلا

جواسيس أرسلهم جنكيزخان للتجسس على الدولة الإسلامية أو لاستفزازها، ولذلك قتلهم حاكم مدينة أوترار..). دەربارەی هۆكاری كوشتنیان مێژوونوسان چەند بۆچونێكی جیاوازیان دەربارەی ئەو ڕوداوە هەیە، هەندێك لەمێژوونوسان دەڵێن ئەوانە سیخوڕ بوون و جەنگیزخان بۆ سیخوڕی لەسەر دەوڵەتی ئیسلامی ڕەوانەی كردبوون هەر لەبەر ئەوەش بوو حاكمی شاری ئۆترار كوشتنی. (ومنهم من يقول: إن هذا كان عمداً كنوع من الرد على عمليات للسلب والنهب قام بها التتار في بلاد ما وراء النهر، وهي بلاد خوارزمية مسلمة..) هەندێكیش دەڵێن: ئەوە وەك وەڵامێكی ئەو كردەوە دزین و فەرهودیە بوو كە تەتارییەكان پێی هەڵدەستان... ومنهم من يقول: إن هذا كان فعلاً متعمداً بقصد استثارة التتار للحرب، ليدخل خوارزم شاه بعد ذلك منطقة تركستان، والتي هي في ملك التتار آنذاك.. وإن كان هذا الرأي مستبعداً" لأن "محمد بن خوارزم شاه " لم تكن له أطماع تذكر في أرض التتار.. هەندێكش دەڵێن ئەو كارە بۆ ئەوەبوو تەتارییەكان بكێشێتە نێو شەڕ، تاوەكو خەوارزم شاە بچێتە ناوچەی توركستان كە ئەوكات لەژێر دەسەڵاتی تەتارەكان بوو گەرچی ئەو بۆچونە دوورە لەبەر ئەوەی (محمدخوارزم شاە)هیچ تەماعێكی لە خاكی تەتارەكان نەبوو .. وكل ما كان يريده هو العهد على بقاء كل فريق في مملكته دون تعدّ على الآخر... ئەوەی دەیویست پابەندبوونی هەردوو لابوو بەپەیمانەكە و بەبێ دەستدرێژی كردن بۆسەر خاكی ئەوەی تر.. ومنهم من قال: إن خوارزم شاه طمع في أموال التجار

فقتلهم لأجلها.. كل هذه احتمالات واردة، لكن المهم في النهاية أن التجار (أو الجواسيس) قد قُتلوا.. وە هەشە دەڵێ: خەوارزم شاە تەماعی لەماڵی بازرگانەکان کرد و کوشتنی، هەموو ئەو ئەگەرانە لەئارادایە، بەڵام ئەوەی گرنگە بازرگانەکان یان سیخورەکان کوژران.

ئەو قسانە لەبەرئەوەی بێ سەرچاوەن دکتۆر(الصلابي یش هەر هەمان قسان دەکا، بەڵام ئاماژەی بەهیچ سەرچاوەیەك نەکردووە، بەڵکو ئاماژەی تەنها بە نوسینەکەی (راغب السرجاني) کردووە[١].

لێرەدا دەڵێین: مێژوونوسانی ئیسلام خەڵکی ڕاستگۆو لەخوا ترس و شارەزای دین بووینە بە ئەمانەت سەیری ڕووداوەکانیان کردوەو وەکو خۆی گێراویانەتەوە نەوەك ڕووداوەکان بخەنە چوارچێوەی فیکرو تەسەوری خۆیان، ئەوان کوفریان ناسیوە، بەڵام بوختانیان بۆ کوفر هەڵنەبەستاوە هەمیشە: (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ (٨))[٢]. لەبەر چاو بووە.ئەوەش گەورەترین تایبەتمەندی مێژووی ئیسلامییە، سەرچاوەکان دەڵێن: خەوارزم شاە تاوانبار بوو ئەویش دەستی سەرەکی هەبوو لە هەڵگیرسانی فیتنەکە بۆیە گرنگە گەشتێك بکەین بەسەرچاوەکاندا.

---

(١) بڕوانە کتێبی : المغول(التتار)بين الانتشار والإنكسار، لاپەڕە ٨٧.
(٢) المائدة: ٨.

یەکەم: البداية والنهاية:

(...وسبب دخولهم نهر جيحون أن جنكزخان بعث تجارا له ومعهم أموال كثيرة إلى بلاد خوارزم شاه يبتضعون له ثيابا للكسوة، فكتب نائبها إلى خوارزم شاه يذكر له ما معهم من كثرة الاموال، فأرسل إليه بأن يقتلهم ويأخذ ما معهم، ففعل ذلك، فلما بلغ جنكزخان خبرهم أرسل يتهدد خوارزم شاه، ولم يكن ما فعله خوارزم شاه فعلا جيدا، فلما تهدده أشار من أشار على خوارزم شاه بالمسير إليهم، فسار إليهم وهم في شغل شاغل بقتال كشلي خان).

واتە: هۆکاری پەرینەوەیان لەڕووباری جیحون ئەوەبوو جەنگیزخان چەند بازرگانێکی بەپارەیەکی یەکجار زۆر ڕەوانەی وڵاتی خەوارزم شاه کردبوو، یەکێك لەحاکمی وڵاتەکانی خەوارزم شاه چاو دەبڕێتە پارەکانیان نامەیەك دەنێرێ بۆ خەوارزم شاه باسی زۆری ئەو ماڵە دەکات کە لەگەڵیانە، ئەویش دەڵێ: بیانکوژن و ماڵەکانیشیان ببەن ئەوەبوو بازرگانەکان دەکوژرێن، کە هەواڵەکە دەکاتە جەنگیزخان خەڵکێك دەنێرێتە لای خەوارزم شاه و هەڕەشەی لێدەکا، ئیمام (ابن كثير) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێ: (ولم يكن ما فعله خوارزم شاه فعلا جيدا) ئەوەی خەوارزم شاه کردی شتێکی باش نەبوو.

ئینجا خەوارزم شاه بەوەندە ناوەستێ لەوکاتەی جەنگیزخان خەریکی شەڕی (كشلي خان) بوو خەوارزم شاه هێرش دەکاتە سەریان و لەشەڕێکی

چـوار ڕۆژیـدا کـە نزیکـەی (٢٠٠٠٠) موسـڵمان شـەهید دەکـرێن و دوو ئەوەنـدەش تـەتارەکان دەکـوژرێن و شـەڕەکە هەنـدە خوێنـاوی بـوو، ئەسـپ هەڵدەخلیسکا لەسەر خوێن، دوای ئەو شەڕە چوار ڕۆژییە، سوپای هەردوو لا دەکشێنەوەو خەوارزم شاە خۆی لە بوخارا و سەمەرقەند قایم دەکا.

لێرەدا ئیمام (ابن کثیر) زۆر بەڕاشکاوی باسی هۆکاری شەڕەکە دەکاو هۆکـاری پەڕینـەوەی سـوپاکەی جـەنگیزخان دەداتـە پـاڵ کوشـتنی بازرگانەکان.

ئنجا ئیمام (ابن کثیر) ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ کە دێتە سەر باسی مردنی جەنگیزخان دەفەرموێ: ولكن كان البداءة من خوارزم شاه، فإنه لما أرسل جنكيزخان تجارا من جهته معهم بضائع كثيرة من بلاده فانتهوا إلى إيران فقتلهم نائبها من جهة خوارزم شاه، وهو والد زوجة كشلي خان، وأخذ جميع ما كان معهم، فأرسل جنكيزخان إلى خوارزم شاه يستعلمه هل وقع هذا الامر عن رضى منه أو أنه لا يعلم به، فأنكره وقال له فيما أرسل إليه: من المعهود من الملوك أن التجار لا يقتلون لانهم عمارة الاقاليم، وهم الذين يحملون إلى الملوك ما فيه التحف والاشياء النفيسة، ثم إن هؤلاء التجار كانوا على دينك فقتلهم نائبك، فإن كان أمرا أمرت به طلبنا بدمائهم، وإلا فأنت تنكره وتقتص من نائبك.

(فلما سمع خوارزم شاه ذلك من رسول جنكيزخان لم يكن له جواب سوى أنه أمر بضرب عنقه فأساء التدبير، وقد كان خرف وكبرت سنه، وقد ورد

الحديث " اتركوا الترك ما تركوكم " فلما بلغ ذلك جنكيزخان تجهز لقتاله وأخذ بلاده، فكان بقدر الله تعالى ما كان من الامور التي لم يسمع بأغرب منها ولا أبشع) [١].واتە: دەستپێك لە خەوارزم شاە بوو كە جەنگیزخان بازرگانەكان ڕەوانەی وڵاتی خەواریزم شاە دەكا بەماڵێكی زۆر دەگەنە ئێران، والی ئەو وڵاتە دەیانكوژێ والی ئەو وڵاتە باوكی خێزانی (كشلی خان) بوو كشلي خان یەكێك بوو لە دوژمنەكانی جەنگیزخان هەموو ماڵەكانیان دەبا. ئینجا جەنگیزخان نێرراو دەنێرێتە لای خەوارزم شاە داوا دەكاو دەیەوێ بزانێ ئەوەی ئەنجام درا بەرەزامەندی ئەو بووە یا لێی بێئاگابووە و پێی دەڵێ: لەعادەتی مەلیكەكان كە بازرگان ناكوژن لەبەر ئەوەی ئەوان وڵات ئاوەدان دەكەنەوە و ئەوانیشن شتی بەهاو بەنرخ دەگەینە مەلیكەكان، ئینجا ئەو بازرگانانە لەسەر ئاینی ئێوە بوون جێگرەكەی تۆ ئەوانی كوشتووە، گەر بەفەرمانی تۆ بووە ئەوا داوای خوێنەكەیان دەكەین، گەر نا ئەوا نارەزایی خۆت دەربڕەو تۆڵە لەجێگرەكەت وەرگرە.

كە خەوارزم شاە گوێ بیستی ئەو قسانە دەبێ وەڵامەكەی فەرمانكردنبوو بە كوشتنی نێرراوەكەی جەنگیزخان.

ئینجا لێرەش (راغب السرجاني) هەڵەیەكی تر دەكا و دەڵێ: ووصل النبأ إلى جنكيزخان، فأرسل رسالة إلى "محمد بن خوارزم شاه " يطلب منه تسليم القتلة إليه حتى يحاكمهم بنفسه، ولكن "محمد بن خوارزم شاه " اعتبر ذلك

---

(١) البداية والنهاية ١٣٩/١٣.

تعدياً على سيادة البلاد المسلمة" فهو لا يسلم مجرماً مسلماً ليحاكم في بلدة أخرى بشريعة أخرى..غير أنه قال: إنه سيحاكمهم في بلاده.. فإن ثبت بعد التحقيق أنهم مخطئون عاقبهم في بلاده بالقانون السائد فيها وهو الشريعة الإسلامية..)

(وهذا الكلام وإن كان منطقياً ومقبولاً في كل بقاع الأرض إلا أنه بالطبع لم يكن مقنعاً لجنكيزخان.. أو قل: إن جنكيزخان لم يكن يرغب في الاقتناع" فليس المجال مجال حجة أوبرهان أو دليل.. حقيقة الأمر أن جنكيزخان قد أعد لغزو بلاد المسلمين خططا مسبقة.. ولن يعطلها شيء.. وإنما كان يبحث فقط عن علة مناسبة، أو شبه مناسبة، وقد وجد في هذا الأمر العلة التي كان يريدها...)

واتە: دوای ئەوەی هەواڵی کوشتنی بازرگانەکان دەگاتە جەنگیزخان نوێنەری دەنێرێتە لای خەوارزم شاە و داوای تەسلیم کردنی بکوژان دەکا تا خۆی دادگاییان بکا، بەڵام خەوارزم شاە ئەوە بەدەستدرێژی کردنە سەر سەروەری وڵاتی ئیسلام دەزانێ، ئەو تاوانبارێکی موسڵمان تەسلیم ناکا تاوەکو لەوڵاتێکی ترو بەشەریعەتێکی تر دادگای بکرێ، بەڵام ئەو وتی خۆی لەوڵاتی خۆی دادگاییان دەکا، دوای لێکۆڵینەوە لەگەڵیان و دەرکەوت تاوانبارن ئەوا ئەو کات لەوڵاتی خۆی دادگایان دەکا بەیاسای ئەو وڵاتە کە شەریعەتی ئیسلامە.

جا ئەوەی سەیرە لێرەدا (راغب السرجاني) ئەو قسانەی لەکوێ هێناوە لەکام سەرچاوە ئاخر ئیمام (ابن كثير) زۆر بەڕاشکاوی دەفەرموێ:

(جــەنگیزخان لــەڕێی نوێنەرەکەیــەوە بەخــەوارزم شــاە دەڵــێ کوشــتنی بازرگانەکان گەر بەفەرمانی تۆ بووە ئەوا داوای خوێنەکەیان دەکەم گەر بەفەرمانی تۆش نەبووە ئەوا خۆت تۆڵەکەیان لە جێگرەکەت بسەنەوە... فـإن کـان أمـرا أمـرت بـه طلبنـا بـدمائهم، وإلا فأنـت تنکـره وتقـتص مـن نائبك... ئینجا خەوارزم شاە بەڕاستی ئەو کەسە نەبووە کە ئامادەنەبێ موسڵمانێك تەسلیم بە غەیرە موسڵمان بکاو موڵکی خۆی لەسەر دابنێ، مێژووی خەوارزم شاە پڕە لەکوشتنی موسڵمان لەپێناو ڕاگرتن و بەردەوامی و فراوانکردنی حوکم و دەوڵەتەکەی، ئاخر ئەوە خەوارزم شاە بوو بەهێزێکی گەورەوە بەڕێکەت بۆ ڕوخاندنی خیلافەتی ئیسلامی و حوکمی خۆی بگەینێتە بەغدا، بەڵام بەهۆی سەختی کەش و هەواو بارینی بەفرو بارانێکی زۆر نەیتوانی پیلانەکەی بهێنێتە دی و سوپاکەی تێکشکا و گەڕایەوە شوێنی خۆی، ئینجا خەواریزم شاە خودی خۆی بە هێزێکی وەسەنی خیتائییەکان گەیشتە سەر حوکم واتە ئەوەی راغبی سرجانی دەڵێ: زۆر دورە لە ڕاستی ئەو بەنەفەسێکی بانگخوازانە ڕووداوە مێژووییەکە دەخوێنێتەوە، هەروەها دەڵێین لەعنەتی خوای گەورە لە جەنگیزخان بێت خوێنی هەزارا موسڵمانی ڕشت و هەزارا ئافرەتی موسڵمانی بە کەنیزە بردو هەزاران شارو گوندی موسڵمانانی کاوڵ کرد، سەرەڕای ئەوەش هیچ بوختانی بۆ هەڵنابەستین و نامانەوێ مێژووی ئیسلامی ڕەسەنایەتی خۆی لەدەست بدات و ئیمامەکان چۆن باسی ڕووداوەکانیان کردووە ئێمەش وای دەگەیەنین.

## دووەم: تاريخ الإسلام للإمام الذهبي:

خوارزم شاه ورُسل جنكيز خان:

وفيها عاد السلطان خوارزم شاه محمد إلى نيسابور، وأقام بها مدة وقد بلغه أن التتار خذلهم الله تعالى قاصدون مملكة ما وراء النهر، وجاءه من جنكس خان رسلٌ وهو محمود الخوارزمي، وخواجا علي البخاري، ومعهم من طرف هدايا الترك من المسك وغيره، والرسالة تشتمل على التهنئة بسلامة خوارزم شاه، ويطلب منه المسالمة والهدنة، وقال: إن الخان الأعظم يسلم عليك ويقول: ليس يخفى علي عظم شأنك، وما بلغت من سُلطانك، ونفوذ حكمك على الأقاليم، وأرى مسالمتك من جملة الواجبات، وأنت عندي مثل أعز أولادي، وغير خاف عنك أنني ملكت الصين، أنت أخبرُ الناس ببلادي، وإنها مثارات العساكر والخيول، ومعادن الذهب والفضة، وفيها كفاية عن طلب غيرها، فإن رأيت أن نعقد بيننا المودة، وتأمر التجار بالسفر لتعم المصلحتين فعلت) واته: دوای ئەوەی خەوارزم شاه دەگەڕێتەوە نەیسابوور ماوەیەك لەوێ دەبێت هەواڵی ئەوەی پێدەگا تەتارەكان - خوا ڕیسوایان كات- مەخسەدیان وڵاتی ئەو دیوی ڕوبارەو نوێنەری جەنگیزخانیش دێنە لای كە ناویان (مەحمود الخوارزمی و خەواجا علی البخاری) بوون دیاری جۆراوجۆریان پێبوو و نامەیەكی جەنگیزخانیان پێبوو بەخێرهاتنەوەی خەوارزم شاه دەكات و دەڵێ: لای من شاردراوە نییە گەورەیی تۆ و فراوانی دەسەڵاتت بەسەر دەوروبەرت وا دەبینم ئاشتی لەگەڵ تۆ واجیبە تۆش لای من وەكو عەزیزترین

منداڵەکانمی، لای تۆش شاردراوە نیە کە مـن بـووم بـەخاوەنی چین ئـەتۆش شارەزای وڵاتـی منـی کانگـای سـەرباز و ئەسـپ و کـانزاو ئـاڵتون وزیـوە، وڵاتی من بایی ئەوەی تیایە کە ڕوونەکەمە وڵاتی تر، گەر پێت چاکبێ دەبا پەیوەندی تەبایی لە نێوانمان ببەستین و ڕێ بە بازرگانەکان بدەین تا بەرژەوەندی هەردوولامان بگرێتەوە.

خـەوارزم شـاە کـە گـوێ بیسـتی ئـەو قسـانەی جـەنگیزخان دەبـێ، مـەحمودی خـەوارزمی بانـگ دەکـاو دیـاریەکی بـەنرخی پێشـکەش دەکـا و پێی دەڵێ: ئەتۆ لە ئێمەی و دەبێت پشتگیریمان لێبکەی، داوای لێدەکات ببێ بەچاوی ئەو بەسەر جەنگیزخان ئینجا پێی دەڵێ: (اصدقني أجنكز خـان ملـك طمغـاج الصـين قـال: نعـم. فقـال: مـا تـرى فـي المصـلحة قـال الاتفاق) ڕاستبە لەگەڵم جەنگیزخان مـوڵکی چینـی گرتـە دەست؟ ئـەویش دەڵـێ بـەڵێ، خـەوارزم شـاە دەڵـێ: چـی بـەباش دەزانـی؟ ئـەویش دەڵـێ پێکهاتن، خەوارزم شاە ڕازی دەبێ و پەیمان دەبەستن و جەنگیزخانیش دڵـی بـەو هەڵوێسـتە خـۆش دەبـێ و حاڵەتەکـە وادەمێنـێ تـاوەکو بازرگانـەکانی جەنگیزخان دەگەنە وڵاتی خەوارزم شاە.

لێـرە مێـژوو نووسـەکان لەسـەر ژمـارەی بازرگانـەکان و پەیوەنـدی ئـەو حاکمەی کە ئەو بازرگانانە دەکوژێ چەند بۆچونێکی جیاوازیان هەیـە لێرە ئیمام (الذهبي) دەفـەرموێ: (وكان خال السلطان خوارزم شاه ينوب على بـلاد ما وراء النهر، ومعه عشـرون ألـف فـارس، فشـرهت نفسـه إلى أمـوال التجـار

وكاتب السلطان يقول: إن هؤلاء القوم قد جاؤوا بـزي التجـار، ومـا قصـدهم إلا إفساد الحال وأن يجسوا البلاد، فإن أذنت لي فـيهم. فـأذن لـه بالاحتيـاط عليـه. وقبض عليهم، واصطفى أموالهم).

واتە: خاڵی سوڵتان خەوارزم شاە حاكمی وڵاتـی ئـەو دیـوی ڕووبـار بـوو (٢٠٠٠٠) سـوارچاكی هـەبوو، چـاوی بڕییـە مـاڵی بازرگانـەكان و بـۆ خەوارزم شاهی نوسی ئەوانە بەبەرگی بازرگـانی هـاتوون، بـەڵام لەڕاسـتیدا مەبەسـتیان سـیخوریە بەسـەر وڵات. خـەوارزم شـاە ڕێـی پێـدەداو حـاكم بازرگانەكان دەكوژێ و ماڵەكانیشیان دەبا، بێگومـان ئـەوەش هەڵوێستێكی ناحەكیمانە بووە، ئینجا لەوەش ناحەكیمانە تر، كوشتنی نوێنەرەكانە لەكاتێك فەرموودەی پێغەمبەری خوای لەسەرە كە نوێنـەر نـاكوژرێن- ابْـنِ مَسْعُودٍ- ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ دەفەرموێ: ان رجلين اتيا رسول الله صلى الله عليه وسلم رسولين لمسيلمة، فقال لهما: اتشهدان انى رسول الله؟ فقالا نشهد ان مسيلمة رسول الله، فقال: لوكنت قاتلا رسولا لضربت أعناقكما) فجرت السنة الا تقتل الرسل. (١)

واتـە: دوو كـەس دێنـە خزمـەت پێغەمبـەری خـوا نوێنـەر موسـەیلەمەی درۆزن بـوون، پێغەمبـەری خۆشەویسـت(صـلى الله عليـه وسـلم) دەفـەرموێ: شـایەتمانی دەدەن كـە مـن پێغەمبـەری خـوام؟ (صـلى الله عليـه وسـلم) ئـەوانیش لەوەڵامدا وتیان: شایەتی دەدەین كە موسەیلەمە پێغەمبـەری خوایـە، ئینجا

(١) التلخيص الحبير فى تخريج احاديث الرافعى الكبير ٥ /٢٦٠

پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: گەر نوێنەر بکوژرابان دەمکوشتن، بۆیە؛ ابن مسعود ڕەزای خوای لێبێت، دەفەرموێ: سونەت وایە نوێنەر نەکوژرێن.

بەهەرحاڵ نوێنەری جەنگیزخان دێنە لای خەوارزم شاه پێی دەڵێن: کە تۆ ئەمانت دا بە بازرگانەکان و غەدرت کرد، غەدرکردنیش شتێکی ناشرینە لە سوڵتانی موسڵمانان زۆر ناشرینترە. لەو ڕیوایەتە جەنگیزخان داوا دەکات ئەو حاکمەی کە بازرگانەکانی کوشتووە تەسلیم بەو بکرێ: فإن زعمت أن الذي فعلهُ خالط بغير أمرك، فسلمه إلينا، وإلا فسوف تشاهد مني ما تعرفني بە) بەلام خەوارزم شاە نوێنەرەکانیش دەکوژێ، بۆیە ئیمام الذهبی دەفەرموێ: (فحصل عند خوارزم شاه من الرعب ما خامر عقلهُ، فتجلد، وأمر بقتل الرسل، فقتلوا، فيا لها حركة لما هدرت من دماء الإسلام، أجرت بكل نقطة سيلاً من الدم.)[1] وای لەو کارەی کە بەهەر دڵۆپێ جۆگەیێ خوێنی موسڵمانانی ڕشت.

ئابەم شێوەیە ڕووداوەکان دەستپێدەکات و هەروەکو ئیمام (الذهبي) فەرمووی: ئەو کارەی خەوارزم شاه لافاوی خوێنی هەستاند، هەروەها لەکتێبی (تاريخ الخميس فی احوال انفس نفيس) ئیمام حسين کوڕی محمدی کوڕی حەسەنی دیاربەکری بەرگی ٢ لاپەڕە ٤١١، دەفەرمێ: ئەو کاتەی بازرگانەکانی تەتار گەیشتنە مەملەکەتی خوارزم شاه،

(١) تاريخ الإسلام للإمام الذهبي ٤٤ /٢٣.

نوێنەری خەواریزم شاە ستەمی لێکردن و ئەو بازرگانانەی کوشت و پارەو ماڵەکەی بردن، ئەوە بوو جەنگیزخان نوینەری خۆی ناردو هەڕەشەی لە خەواریزم شاە کرد، خەواریزم شاە نوێنەرەکانیشی کوشت ...ئینجا دیاربەکری دەفەرمێ: یالها من فعلة ما كان اقبحها أجرت كل قطرة من دماء الرسل سيلا من الدماء. واتە: بەڕاستی کارێکی ناشرین بوو لەبری هەر دڵۆپێکی خوێنی ئەو نوێنەرانە ڕووبارە خوێنەکی موسڵمانان ڕژا.

لە هەموو ئەو سەرچاوانە خەواریزم شاە تاوانبارە وەکو کتێبی (تاريخ الخلفاء)ی ئیمام (السيوطي)ی و کتێبی (سمط النجوم العوالي في أنباء الأوائل والتوالي، العصامي) بەهەر حاڵ خەوارزم شاە هەڵەبوو لەو کارەی کە کردی، ئەوەش دەبێت دانی پێبنێین گەرچی (راغب السرجاني) هەوڵ دەدات ئەو گومانە لەسەر خەوارزم شا لابدات.

مێژوو تۆمار نەکراوە بۆئەوەی بەهانە بۆ تاوانەکانی دەسەڵات بهێنیرێتەوە، سەرجانی بەئینصافەوە باسی ڕووداوەکان ناکات، وەك مێژوو نوسێك کە ڕاستییەکانی وەکو خۆی تۆمارکردبێ، ئێمە لەبەر چی دەست لەسەر برینەکان دانەنێن و تاوانی خەواریزم شاە نەخرێتە ڕوو بەململانێی (کوفر و ئیمان) تاوانەکانی خەواریزم شاە بشارینەوە، بەڵێ ئێمە دەبێ دان بەوە بنێین کە قۆناغ هەبووە لەمێژووی ئەو ئوممەتە ئاڕاستەی ڕووداوەکان تەنها بە هەوەسی حاکم کراوە نەکە بەمەشورەتی پیاوی عاقڵ و حەکیم .

تێبینی: لەکتێبی تاریخ فاتح العالم علاء الدین الجوینی لاپەڕە ١٠٨ باسی خاڵێکی کردوە پێم چاك بوو لێرە باسی بکەم: ئەو دەڵێ کە قافڵەی بازرگانەکان دەگاتە شاری ئۆترار، کەسێك لەگەڵ ئەو قافڵەیە دەبێ ئەو کەسە (هیندی) بووە، حاکمی ئۆتراڕی پێشتر ناسیوە بۆیە هەر بەناوی خۆی بەبێ نازناو بانگیکردوە (ئینال جوق) حاکمی ئۆتراڕیش نازناوی (غایرخان)ی لەخۆ ناوە کە ئەو کەسە هیندیە بەبێ نازناو ناوی ئەو حاکمە دەهێنێ حاکمەکە غرور دەیگرێ بڕیاری دەستگیر کردنی تەواوی قافڵەکە دەداو، دواتر هەواڵ دەنێرێ بۆ خەواریزم شاه ئەویش فەرمان دەکا بەکوشتنی بازرگانەکان، بەهەر حاڵ هەر چۆنەك بێ کوشتنی ئەو بازرگانانە هەڵەیەکی یەکجار گەورەبوو هەر لەبەر ئەوەشە (علاء الدین الجوینی) کەباسی کوشتنی ئەو بازرگانانە دەکات دەڵێ: وجرت بحار کثیرة من دمائهم عوضا عن کل قطرة اریقت منهم، وصار قصاص کل شعرة واحدة من رؤسهم مئات الالوف من الرؤس صرعی مبعثرة علی مفارق الطرق ودفع في مقابل کل دینار قنطار) لەبری هەر دڵۆپێ خوێنی ئەو بازرگانانە دەریایەك لەخوێن ڕژا، لەجێی تاڵە موێکی سەری ئەو بازرگانانە سەدان هەزار کەس کوژران و لەبری هەر دینارێك دنیایەك پارە وەرگیرا ... هتد .

# ڕووداوەکانی دوای
# کوشتنی نوێنەرەکانی جەنگیزخان

لەو کەسانەی لەگەڵ بازرگانەکان بوون تەنها یەك کەس ڕزگاری دەبێ و هەواڵەکەی دەگەیەنێتە(جەنگیزخان) جەنگیزخان دەچێتەسەر تەپۆڵکەیەك و سێ ڕۆژ بەتەنها دەمێنێتەوە، ئینجا دادەبەزێ و بڕیاری هێرشکردنە سەر دەوڵەتی (خەواریزم شاه) دەدات، سەرەتا جەنگیزخان سوپایەکی نزیکەی (٢٠٠) هەزار کەسی ئامادە دەکات، بەرەو (ئۆتڕاڕ) دەکەونە ڕێ، دیارە چاکترین و ئازاترین و شارەزاترینی سەربازەکانی هەڵدەبژێرێ، علائەدینی جوەینی دەڵێ: ئەو سوپایەی جەنگیزخان زۆر ئازاو لێهاتو بوون، تیرهاوێژی وایان لەگەڵ بوو باڵندەیان لەئاسمان بەتیر دەخست و ماسیان لە ناو ئاو بەتیر ڕاو دەکرد، زۆریش بەپەرۆش بوون بۆ ئەو جەنگە پەرۆشی ئەو گەنجەی کە بەیانی خۆشەویستەکەی دەگوازێتەوە، دیارە ئەو سوپایە هەر کەدەگاتە سنوری ئۆتڕاڕ دووسەرکردەی، خواریزم شاه پەیوەندی بە جەنگیزخان دەکەن و دەچنە ڕیزەکانی ئەو، ئالەو کاتە (ینال خان) خۆی ئامادە دەکات و دیواری شارەکە قایم دەکات و دەرگەکانی قەلاکە دادەخەن و چاوەڕوانی، جەنگ دەبن هەندێك لەسەر چاوەکان دەڵێن ئەوەی بۆ (ینال خان) کۆببوەوە لە شاری ئۆتڕاڕ نزیکەی شەست هەزار کەس بووینەو

سوڵتان خەواریزم شاە دەرگەوانەکەی (حاجب)ی خۆی کەناوی (قراجەخان) بوو بۆ یارمەتی (ینال خان) دەنێرێ، جەنگیزخان شارەکە گەمارۆ دەداو، هەموو سوپاکەشی تەسلیم بەهەردوو کوڕی دەکات و (ئۆتراڕ) گەمارۆ دەدەن و خۆشی لەگەڵ سوپایەکی گەورە بەرێدەکەوێ بۆ شاری (بوخارا)[1].

مەغۆلەکان سەنتەری بڕیاریان زۆر بەهێز بوو، واتە هیچ لەسەرکردە و سەربازەکان لە فەرمانی جەنگیزخان دەرنەدەچون، یەکێتی ڕیزی مەغۆلەکان زۆر بەهێز بوو، لەهەمان کاتدا سوپاکەی مەغۆل سوپایەکی بەئەزمونی بەهێزبوو، جەنگیزخان کە بەرەو (ئۆتراڕ) دەکەوێتە ڕێ، سوپاکەی دەکاتە چوار فیرقە:

فیرقەی یەکەم: ژمارەیان نزیکەی دە هەزار کەس دەبوون، ئەوانە داوایان لێکرا شاری (ئۆتراڕ) بگرن، دوو لەکوڕەکانی جەنگیزخان سەرپەرشتی ئەو فیرقەیەیان دەکرد (جغتای و ئەوجدای، ئەقتای).

فیرقەی دووەم: بەسەر پەرشتی کوڕێکی تری بەناوی (جوجی، توشی) ئەوەش داگیر کردنی شارەکانی قەراغ ڕووباری (سەیحۆنی) خرا ئەستۆ، بەتایبەتی شاری (جەند).

فیرقەی سێیەم: نزیکەی پێنج هەزار کەس دەبوون ئازاد کردنی شاری (خوجەند و بناکت)یان خرایە ئەستۆ.

---

(١) تاریخ فاتح العالم علاء الدین الجوینی، لاپەڕە ١١٢ بەرگی یەکەم.

فیـــرقەی چـــوارەم بەسەرپەرشـــتی خـــودی (جەنگیزخـــان) بـــوو لەگەڵ (تولۆی) کوڕی بەرەو شاری بوخارا، کەوتنە ڕێ[(١)] .

## کەوتنی (ئۆتراڕ، Otrar) ساڵی(٦١٥-٦١٦) کۆچی

(ئـۆتراڕ نزیـك شـاری فـاراب) ئەوشـارە دەکەوێتە وڵاتـی (کازاخستانی) ئێستا، بەرلەوەی هێزەکانی جەنگیزخان بگەنە دەوروبەری شاری (ئـۆتراڕ) یەکێك لە سەرکردەکانی خەواریزم شاە بەناوی (بدرالدین عمید)، پەیوەندی بەهێزەکـانی مەغـۆل دەکات و خۆی ڕادەستی ئەوان دەکـات، ئینجا لەوێوە نامە بەناوی جەنگیزخان بۆ زۆرێك لەسەرکردەکانی خەواریزم شاە دەنێرێ، بەدرەدین عەمید دەتوانێ کاریگەری بکاتە چەند سەرکردەیەکی دەوروبەری خەواریـزم شـاە، بـۆیە پیلانێـك دادەنـێن بۆکوشـتنی خەواریـزم شـاە، بەڵام خەواریـزم شـاە بەو پـیلانە دەزانـێ و ئەو سـەرکردانەی دەسـتیان هەبـوو لە پیلانـی کوشـتنی خەواریـزم شـاە، ڕادەکەن بەرەو هێزەکـانی جەنگیزخـان، هێزەکـانی مەغـۆل گەمـارۆی شـاری (ئـۆتراڕ) دەدەن و لەشـێوەی چەنـد بازنەیەك و (ئـۆتراڕ) بەتەواوی لە دەرەوەی دادەبڕن و ئەو شـارە نەفەس بڕ دەکەن، شـاری ئـۆتراڕ تـوانی نـزیکەی پیـنچ مانـگ ئـارام بگـرێ بەڕوی هێرشـەکانی مەغـۆل، هێرشـەکانی مەغـۆل بـۆ سـەر شـارەکە هەنـدە زۆربـوو، ڕۆژ بەڕۆژ هێزەکـانی ئـۆتراڕ بەرەو لاوازی دەڕۆیشـتن و توانـای بەرەنگـار

(١) تاريخ المغول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية. عباس اقبال وەرگێرانی عبدالوهاب علوب، لاپەڕە ٦٦.

بوونەوەیان نەما و تا گەیشتە ئەو ئاستەی (قەراجەخان) پێشنیاری کرد کەبە (دانوساندن) ئەو شارە تەسلیم بەهێزەکانی مەغۆل بکرێ، خۆیان ڕزگارکەن، بەڵام (ینال خان) دەیزانی جەنگیزخان داوای ئەوی کردوە بۆیە، پێشنیارەکەی (قەراجەخانی) ڕەد کردەوەو، بەردەوام بوو لە بەرەنگار بوونەوەی هێزەکانی مەغۆل، (قەراجەخان) هیچ ئومێدی بەبەرنگار بوونەوەی هێزەکانی مەغۆل نەماو دەیزانی ناتوانن بەردەوام بن و ئەو شارە توانای بەرەنگاربوونەوەی هێزەکانی مەغۆلی نەماوەو دەکەوێتە دەست جەنگیزخان، بۆیە خۆی و چەند سەرکردەیەکی تر، بەشەوو بەنهێنی و دور لەئاگای (ینال خان) یەکێك لەدەرگاکانی قەڵاکە کەناوی دەرگای (صوفی خانە) بوو، ئەو دەرگایە دەکەنەوە کەڕابکەن، بەڵام هێزەکانی مەغۆل هەر هەمویان بەدیل دەگرن و لەو دەرگایەوە دەچنە نێو شاری ئۆتراڕ، قەراجەخان و ئەوانەی لەگەڵی بوون بەدیل دەگیرێن و دەگەیەنرێنە بەردەستی سەرکردەکانی مەغۆل، مەغۆلەکان دەڵێن ئێوە وەفاتان نەبوو بۆ سوڵتانی خۆتان کەخاوەن چاکەیە بەسەرتان، چۆن بەوەفا دەبن بۆ ئێمە، بۆیە بڕیار دەدەن هەمویان بکوژن هەر لەوێ (قەراجەخان) و هاوەڵەکانی دەکوژرێن، هێزەکانی مەغۆل دەگەنە نێو شارەکە (ینال خان) و هێزێکی بیست هەزار کەسی لە قەڵایەکی شارەکە خۆیان قایم دەکەن، ئەو بیست هەزار کەسە تا کۆتا زۆر ئازایانە بەرەنگاری هێزەکانی مەغۆل دەبنەوە ئینجا دابەش دەبن بەسەر چەند بازنەیەك هەر بازنەیەك پەنجا کەس لەخۆی

دەگرێ و بەو جۆرە دەتوانن زۆرێك لەسەربازانی مەغۆل بكوژن، تاوەكو بەتەواوی هەر بیست هەزار كەسیان دەكوژرێن، یەنال خان خۆی و چەند كەسێكی بە دەور دەمێنێ و شەڕی مان و نەمان دەكەن، تا دەگاتە ئەوەی لەخانوێكدا گەمارۆدەدرێ، جەنگیزخان فەرمانی كردبوو كە (یەنال خان) نەكوژن، بەڵكو بەدەست بیگرن، بۆیە لەو خانوە (یەنال خان) هیچ تیری پینامێنێ ڕم و شمشێرەكەشی لەدەست دەكەوێ، هەندێ ئافرەتی لەگەڵ بوون بەردەیان دەدایە دەست (یەنال خان) ئەویش بەو بەردانە شەڕی مەغۆلەكانی دەكرد، تاوەكو بەدەست دەیگرن، هێزەكانی مەغۆل شاری ئۆتراڕ تەخت دەكەن و هەر چی پیاو منالْ هەیە دەیكوژن و ئافرەتەكانیش بە كەنیزە دەبەن، تەنها خاوەن پیشەكان (صەنعەتكارەكان) دەهێڵنەوە، وەكو ئاسنگەر و دارتاش و هەر كەسێك هەرپێشەیەكی هەبوایە نەیاندەكوشت بۆ دروستكردنی مەنجەنیق و پێداویستییەكانی جەنگ بەكاریان دەهێنان، ئینجا (یەنال خان) دەبەنە بەردەستی جەنگیزخان، جەنگیزخان فەرمان دەكا (مسی) تواوە بخنە چاو و گوێی (یەنال خان) بەو ئازارەوە دەكوژن[١]

(١) الدولة الخوارزمية والمغول لاپەڕە ١٣٩، تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەكەم لاپەڕە ١١٣.

## کەوتنی (سقناق)

دوای گرتنی (ئۆتراڕ) سوپایەکی مەغۆلەکان بۆ شاری (سقناق) دەکەوێتە ڕێ، بەڵام سەرەتا سوپاکەی مەغۆل کەسێك دەنێرن بۆئەوەی قسە لەگەڵ خەڵکی شارەکە بکا و خۆوەدەست بدەن بەبێ شەڕ، ئەو کەسە ناوی (حسن حاجی) دەبێ، یەکێك بووە لەو بازرگانانەی هاموشۆی چینی دەکرد، خەڵکی شارەکە لەبری گفتوگۆ نوێنەرەکە دەکوژن، (جوجی) کوڕی جەنگیزخان بەسوپایەکەوە، بۆ گرتنی ئەو شارە دەکەوێتە ڕێ و لەماوەیەکی کەم دەتوانێ شارەکە بگرێ و کوڕی (حسن حاجی) کوژراو دەکاتە حاکمی شارەکە[1].

## کەوتنی شاری (جەند)

(جەند)[2] شارێکی گەورەی موسڵمانان بوو تەنها دە ڕۆژ لەخەواریزم دوور بووە، نزیك بووە لەڕوباری (سەیحۆن) ئەو شارە نەماوە، بەڵام شوێنەواری دەکەوێتە تورکستانی ئێستا کە لەژێر دەسەڵاتی چینە،[3] هێزەکانی مەغۆل نزیك دەبنەوە لەو شارە (مەنجەنیق) و کەرستەیەکی زۆری سەربازیان پێیە، حاکمی شارەکە هەر کەدەزانێ مەغۆلەکان نزیك بوونەتەوە، بەشەو ڕادەکاو شارەکە بەجێ دەهێڵێ، خەڵکی شارەکە دەبن بە

---

(١) المغول فی التاریخ / الدکتور فؤاد عبد المعطی الصیاد، لاپەڕە ١١٤.

(٢) جَنْد: بالفتح ثم السکون.

(٣) معجم البلدان (٢/ ١٦٨)

دوو بەش بەشـێکیان دەڵـێن بـا بەرەنگـاری هێزەکـانی مەغـۆل ببینەوە بەشەکەی تر دەڵێن بەرەنگاربوونەوە هیچ سودی نییە و با شارەکە تەسلیم بەمەغۆل بکەین، مەغۆلەکان دیواری شارەکە دەڕوخێنن و شارەکە بەبێ هیچ بەرەنگـار بوونەوەیەك خۆیـان ڕادەستی مەغـۆل دەکەن، ئەوانەی ڕوو بەڕوی سـوپاکەی مەغـۆل بـونەتەوە هەر هەمویـان دەکـوژرێن ئەوانیتـر سەلامەت دەبن.[1] دواتر کەسێك بەناوی (علی خواجه البخاری) دەکەن بەحاکمی (جەند)[2].

## کەوتنی شاری (خوجەندە، خُجَنْدَة)

خوجەندە هەروەکو لە معجم البلدان[3] هاتوە، شارێکی گەورەیەو لەسەر ڕووبـاری (سـەیحۆنە)، سـوپایەکی گەورەی مەغۆلەکـان، ڕوو لەو شـارە دەکەن و حاکمی ئەو شارە کەسێکی ئازاو و بەجەرگ بوو ناوی (تیمور ملیك) بووە، پێی وابووە بەرەنگار بوونەوەی ئەو هێزەی مەغۆل بەو شێوەیە ناکرێ، بۆیە شارەکە جێدەهێڵێ و خۆی (١٠٠٠)کەس دەچنە، دورگەیەك کە لە نێو ڕوباری سەیحۆن دابووە، لەوێوە هێرشیان دەکردە سەر هێزەکانی مەغۆل، یەکێك لە ئازاترین کەتیبەکانی بەرەنگاربوونەوەی مەغۆل بوون، ئەو کەتیبەیەی (تەیمورمەلیك) چەند بەلەمێکی بچوکیان دروستکردبوو،

---

(١) الدولة الخوارزمية والمغول، لاپەڕە ١٤٠.
(٢) کتێبی المغول نوسینی السيد الباز العريني، لاپەڕە ١٢٤.
(٣) معجم البلدان (٢/ ٣٤٧)

ئەو بەلەمانەیان بە پێست داپۆشیبوو، بەشێوەیەکی ئاوا کە تیر کاری تێنەگات، لەو بەلەمە بچوکانە شوێنی ئەوەندەیان هێشتبووەوە کە تێدا تیر بهاوێن، بۆیە ئەو کاتەی کە لە هێزەکانی مەغۆل نزیك دەبوونەوە لەئاوەوە تیریان دەهاوێشتە مەغۆلەکان و زۆریان لێکوشتن، تیری مەغۆلەکانیش هیچ کاری لەوان نەدەکرد لەبەر ئەوەی بەلەمەکان هەروەکو باسمان کرد بە پێستی ئاژەڵ داپۆشرابوو، مەغۆلەکان نەیان دەتوانی لەئاوەکە نزیك ببنەوە، بەم شێوەیە زیانێکی زۆر بە مەغۆلەکان دەگەیەنن، تا دەگاتە ئەوەی مەغۆلەکانیش چەند بەلەمێك دروست دەکەن، ئەو کات (تەیمور مەلیك) و هاوەڵەکانی ئەو بەلەمانە بەجێ دەهێڵن دەچنە سەر ووشکایی و لەوێوە ڕێی (خەواریزم) دەگرنە بەر، کەتیبەکەی (تەیمور مەلیك) تا دەگەنە (خەواریزم) زۆربەیان شەهید دەکرێن، (تەیمور) خۆیی و چەند کەسێك دەمێننەوە، تیرێکی زۆر کەمیان پێمابوو، تەنانەت تەیمور سێ دانە تیری بەدەست دەمێنێ، یەکیان تیرێکی بێ سەرە واتە سەری تیرەکە شکاوە بۆیە ئەو کاتەی چەند مەغۆلەك لێیان دێنە پێش (تەیمور مەلیك) بەتیرە شکاوەکە چاوی یەکیان کوێر دەکا و بەوانی تریش دەڵێ: بگەڕێنەوە ئەگەر نا ئێوەش دەکوژرێن، ئەو کات مەغۆلەکان دەترسن واز لە تەیمورمەلیك دەهێنن، ئەویش دەچێتەخەواریزم دوای بەرەنگار بوونەوەیەکی زۆر کە بەشداری زۆربەی شەڕەکان دەکا، خوای گەورە سەلامەتی دەکا، تەیمور مەلیك بۆ ماوەیەك دەچێتە شام و چەند ساڵێکی لەوێ دەمێنێتەوە، دواتر

غەریبی مەملەکەتەکەی خۆی (خوجەندە) دەکاو دەگەڕێتەوە بەشێوەیەکی نهێنی، وە ئەو کاتە تەیمور مەلیك ئەو شوێنانەی بەجێهێشت کوڕێکی هەبوو کوڕەکەی شیرە خۆرە بوو، بۆیە ئەو کاتەی (تەیمور) دەگەڕێتەوە سەیر دەکا کوڕەکەی گەورە بووەو دەچێتە لای و پرسیاری لێدەکات، ئەگەر باوکی خۆت ببینی دەیناسیەوە، ئەویش دەڵێ: ئەو کاتەی ئێمە جێهێشتبوو من شیرە خۆرە بووم، بەڵام پیاوێك هەیە ئەو کاتی خۆی باوکی منی بینی بوو ئەگەربیبنێ دەیناسیتەوە، ئەوە بوو پیاوەکە چاوی دەکەوێ بە(تەیمور مەلیك) دەڵێ بەڵێ تۆ (تەیمور)ی باوکی ئەو کوڕە، هەواڵی گەرانەوەی تەیمور دەگاتەوە مەغۆلەکان و تەیمور دەستگیر دەکرێ و دواتر دەیکوژن خوای گەورە بەشەهیدی قبوڵی کات، ئەو چیرۆکەی (تەیمور مەلیك) چیرۆکێکە لەهەزارا چیرۆکی بەرەنگار بوونەوەو ئازایەتی خەڵکانێك کە ئامادە نەبووینە، ژیانی زیللەت لەژێر دەسەڵاتی مەغۆل ببەنە سەر، بەڵام کێشەی گەورە ئەوە بووە، دەوڵەتێك نەبوو توانای ئەو خەڵکە ئازایە لەخۆ بگرێ و بەرەنگار بوونەوەی مەغۆلیان پێبکات.[١]

---

(١) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٢٢.

## کەوتنی شاری (بوخارا)

یـاقوتی حەمەوی[1] کەباسـی بوخـارا دەکـا، دەڵـێ گەڕام بەدوای ئەوەی لەبەر چـی ئەو شـارە نـاونراوە بوخـارا، بەڵام هـیچ هۆکـارێکم لەو بـوارەوە دەسـت نەکەوت، ئینجـا دەڵـێ: ئەو شـارە حەوت ڕۆژە ڕێ لە سـەمەرقەند دورە.[2]

بەڵام جوەینی خاوەنی کتێبی تاریخ فاتح العـالم جهـان گشـای کەلەساڵی (٦٨٣)ی کـۆچی وەفـاتی کـردوە، دەربـارەی شـاری بوخـارا دەڵـێ: نـاوی بوخـارا لە بوخـار هـاتووە بەزمـانی خەڵکـی نـاوچەی ئەوکـات مانـاکەی شوێنی زانست بووە، هەتـا خیتائییەکـان و بت پەرستەکانیش پەرستگاکانی خۆیان بە (بوخار) ناو دەبرد[3].

دوای کەوتنــی شــاری ئــۆتراڕو خوجەنــدە، ســوپایەکی تــری گەورەی مەغۆلەکان کەبەسەر پەرشتی خودی (جەنگیزخان) و (تولـوی) کـوڕی، بەرەو شاری (بوخارا) کەوتبونەڕێ، کەئێستادەکەوێتە وڵاتـی (ئۆزباکستان) سـەرەتا دەگەنە سـەر قەڵای (زرنـوق) و قەڵای (نـور) سـوپایەکە کاتێـك دەگاتە دەوروبەری ئەو قەڵایانە، بەشێك لەخەڵکی ئەو قەڵایانە بەشێوەیەکی وا غـافـل و بێئـاگـابوون لەگەڵ تەپ و تـۆزی سـوپاکە کە بەری ئاسمانی

(١) شهاب الدين باوكی عبد الله ياقوت كوڕی عبد الله الرومي الحموي، لە ساڵی(٦٢٦) كۆچی وەفاتی كردووە خاوەنی كتێبی (معجم البلدان)ە.

(٢) معجم البلدان (١/ ٣٥٣).

(٣) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەكەم لاپەڕە ١٢٤.

گرتبوو بەئاگا هاتنەوە، خەڵکی قەڵای (زرنوق و نور) دەرگای قەڵاکە دادەخەن، جەنگیزخان نوێنەرێکی موسڵمان بۆ خەڵکی قەڵاکە دەنێرێ بەناوی (دانشمند)ی حاجب، نوێنەرەکە لە دیوارو دەرگای قەڵاکە نزیك دەبێتەوە و دەڵێ: من موسڵمانم هاتووم بۆ ئەوەی ڕزگارتان کەم، ئەوە سوپایەکی گەورەی مەغۆلەکان کە بەسەرپەرشتی خودی جەنگیزخانە دەوری شارەکەی ئێوەی داوە بۆیە واچاکە، قەڵاکە تەسلیم بە جەنگیزخان بکەن و، کەس بەرەنگاری ئەو سوپایە نەبێتەوە لەبەر ئەوەی توانای بەرەنگاری ئەو سوپایەتان نییە، ئەگەر قەڵاکە تەسلیم نەکەن، دڵنیابن لەوەی ئەو قەڵایە دەبێتە گۆمی خوێن، هەردوو قەڵای (زرنوق و نور) تەسلیم بە جەنگیزخاندەبن، قەڵای نور (١٥٠٠) دیناری ئاڵتونی هەمان ئەو پارەیەی دەیاندایە (خەواریزم شاە) دەیدەن بە جەنگیزخان و قەڵاکەی خۆیان بەبێ شەڕ ڕزگار دەکەن[١].

دوای ئەوەی جەنگیزخان هەردوو قەڵای دەورو بەری بوخارا داگیر دەکا، دەگاتە شاری بوخارا، شاری بوخارا تەواو شڵەژا بوو، هەندێك سەرچاوە دەڵێن سوپاکەی خەواریزم شاە، لەو شارە لەنێوان دوازدە هەزار تاوەکو سی هەزار کەس دەبوون، دور نییە دوازدە هەزار سوپای خەواریزم شاە بوبێت و ئەوەی تر چەکدارەکانی خەڵکی شارەکەو خۆبەخشەکان بن، بەسەر پەرشتی

(١) تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدوله التيمورية.لاپەڕە ٦٧ . عباس اقبال وەرگێرانی د. عبدالوهاب علوب. وە کتێبی تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٢٦.

گەورە سەرکردەکانی خەواریزم شاە وەکو (اختیار الدین کشلو) و (ئیناج خانی حاجب)، سوپاکەی جەنگیزخان شاری بوخارا گەمارۆ دەدەن، دوای سێ ڕۆژ لەو گەمارۆیە سوپایەکی خەڵکی بوخارا بەسەر پەرشتی (ئیناج خان) لەشارەکە دێنەدەرەوە و هێرش دەکەنە سەر سوپاکەی مەغۆل، بەڵام ئەو سوپایە هیچیان ڕزگاریان نابێ، تەنها (ئیناج خان) نەبێ، دوای سێ ڕۆژ لەبەرەنگار بوونەوە، گەورە پیاوانی بوخارا بڕیار دەدەن شارەکە تەسلیم بە جەنگیزخان بکەن، ئەوە بوو قازی (بەدرەدین) و چەند ڕیش سپییەکی شارەکە دەچنە لای جەنگیزخان و شارەکەی تەسلیم دەکەن.

(جەنگیزخان) دەچێتە نێو شاری بوخارا بەسواری ئەسپەوە، ئینجا دەگاتە بەردەرگای مزگەوت و دەڵێ: ئەوە کۆشکی سوڵتانە ؟ ئەوانیش دەڵێن نەخێر قوربان ئەوەماڵی خوایە، ئەو کاتە (جەنگیزخان) لەسەر ئەسپەکەی دادەبەزێ و دەچێتە سەر مینبەری مزگەوتەکە، هاوار دەکا و دەڵێ: ئەو بیابانەی بڕیمان لەوەڕی تێدا نەبوو، ئیستا بڕۆن خۆتان و ئەسپەکانتان تێر کەن، سوپاکەی جەنگیزخان تێدەگەن کە ئەوە ڕێپێدانە بۆ فەرهود کردنی شارەکە، ئینجا چەندین سنوقی دار دێنن کە پڕ بوو لەقورئان و سنوقەکان لەحەوشەی مزگەوت هەڵدەڕێژن، قورئانەکان هەڵدەدەنە ژێر قاچی ئەسپ و وڵاغەکانیان (ولاحول ولاقوة الا بالله العلی العظیم) عەرەق و مەی دێننە حەوشەی مزگەوتەکە و دەست دەکەن بەخواردنەوەی عەرەق و مەیی و ئافرەتیش دێنن گۆرانیان بۆ دەڵێن و سەمایان بۆ دەکەن، زاناو شیخەکان و

گەورە پیاوانی ئەو شارەش بەدیاریان وەستابوون و هیچیان بۆ نەدەکرا، قەڵایەك لەناو شاری (بوخارا) نزیکەی (٤٠٠) پاڵەوانی تێدا بوو نزیکەی دوازدە ڕۆژ شەڕی سوپاکەی (جەنگیزخان) یان کرد و زیانێکی زۆریان بەسوپاکەی جەنگیزخان گەیاند، دواتر هەر هەموویان دەکوژرێن خوای گەورە بەشەهیدیان قبوڵکات، لەدوای ئەوە (جەنگیزخان) خەڵکی شارەکە کۆدەکاتەوەو وتاریان بۆ دەدات وپێیان دەڵێ: ئەوەی بەسەر ئێوە هاتوە دەرەنجامی تاوانەکانی ئێوەیە خوای گەورە منی بەسزا بۆئێوە ناردوە، ئینجا داوا لەدەوڵەمەندەکانی بوخارا دەکا هەرچی ماڵە هەیانە بیهێنن، ئەوەی پارەی هەیە و شاردیتیەوە پارەکە بەمەمنونی دێنێ، [(١)]جەنگیزخان دەڵێ: ئەو کاتەی بازرگانەکان کوژران، خەواریزم شاە کاڵاکانی بەئێوە فرۆشتۆتەوە کێ ئەو کاڵایانەی لایە بابۆمی بهێنێتەوە، ئەوەبوو ئەوەی کاڵاکانی کڕیبوو هێنایەوە، لەدوای ئەوە بەفەرمانی (جەنگیزخان) شارەکە دەسوتێنن و ئافرەتەکان بە کەنیزە دەگرن و پەککەوتەو پیرو گەنج هەر هەمویان دەکوژرێن. ئیمام (ابن الاثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێ کەباسی کەوتنی بوخارا دەکا دەفەرمێ: ڕۆژێکی زۆر سەخت و پڕئازار بوو، بەسەر موسڵمانان داهات، گریانی ژن و منداڵ و پیاو ناوچەکەی داپۆشیبوو، ئافرەتەکان بەسەر سەربازە مەغۆلەکان دابەشکران، لەبەر چاوی کەس و کاری ئافرەتەکان دەستدرێژیان کرا سەر، پیاوەکانیان کە ئەو دیمەنەیان بینی

---

(١) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٢٩.

تاویـان دایه شمشـێرو شـەڕیانکرد، تـاوەکو شـەهیدکران لەو پاڵەوانـانە ئیمـام ڕوکنەددین ئیمام زادەو کوڕەکەی و هەروەها قازی صەدرەدین، شەڕیانکرد تـاوەکو شـەهید کـران ڕەحمەتـی خوایـان لێبـێ، ئەوانەی کـوژران کـوژران، ئەوانەی مـابونەوە خستیانە پێشی سوپاو بۆ گرتنـی (سەمەرقەند)کەوتنە ڕێ.[1] زیاتر لە سی هەزار کەس تەنها لە بوخـارا کـوژران خوای گەورە بە شـەهیدیان قبوڵکـات[2]. تەنهـا صـەنعەتکارەکانیان نەکوشـت، سیاسـەتی مەغۆلەکـان لەزۆربەی شـەڕەکان وابـووە، ئەوەی خـاوەن صـەنعەت بـوایە دەیانهێشتنەوە[3].

## کەوتنی سەمەرقەند

سەمەرقەند[4] یەکێك بوو لەئاوەدانترین شارەکانی ئەو دیوی ڕوبار(مـاوراء النهـر)، دوای ئەوەی مەغۆلەکـان بوخارایـان خـاپورکرد، بەرەو ئەو شـارە کەوتـنەڕێ، مەغۆلەکان دیلەکانیـان ڕاپێچ کـرد و دابەشیان کردبـوو بەسـەر چەنـد گروپێـك، هەر گـروپەو ئالایەکیـان بـۆ هەڵکردبـوون، ئەوانەی توانـای ڕێکردنیان نەمابوو لەڕێگـا کوژران، کەگەیشـتنە نزیـك شـاری سـەمەرقەند، خەڵکی شارەکە زانیان سوپایەك ڕووی تێکردون، توانای بەرەنگار بـوونەوەی

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٣٤٠).
(٢) تاريخ فاتح العالم علاء الدين الجويني، بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٣١.
(٣) الحياة والانبعاث، لاپەڕە ١٨٣ جون مان وەرگێرانی حسن عبدالعزيز عويضة.
(٤) کەئێستا دەکەوێتەولاتی (ئۆزباکسان).

ئەو سوپا گەورەیان نییە، ئەو شارە بەشارێکی ستراتیژی بازرگانی[*] گەورە دادەنرا، بۆیە بەدیوارێکی گەورە دەوردرا بوو، ئەو دیوارە (١٢) دەرگای هەبوو، لەسەر دیوارەکانیش چەند قوللەیەکی بەرز هەڵچنرابوو بۆ بەرگریکردن لەشارەکە، سەرچاوەکان دەڵێن سەمەرقەند شەست هەزار سەربازی تورك و پەنجا هەزار سەربازی فارسی تێدابوو، هەندێ سەرچاوەی تریش باس لەژمارەی تر دەکەن، بەهەر حاڵ جیاوازی ئەو ژمارانە لەوەوە هاتوە، کە ئەوخەڵکەی لە شوینەکانی ترەوە ڕایانکردبوو، خۆیان گەیاندبووە ئەو شارە بەو حیسابەی کەشوێنێکی قایمە، هەروەها بیست فیلی گەورەش لەڕیزی ئەو سوپایە بوو بۆ بەرگری کردن لەو شارە، سەرەڕای ئەوەی سەمەرقەند شارێکی عاسێ و قایم بوو، بەڵام خەڵکەکە سەرکردە سەربازییەکانی خەواریزم، وورەیان ڕووخا بوو، سوپاکەی جەنگیزخان بەتەواوی گەمارۆی شارەکەی دابوو، ڕۆژی یەکەم و دووەم، سوپاکەی سەمەرقەند توانی زۆر دلێرانە بەرەنگاری مەغۆلەکان بونەوە، بۆ شکاندنی ئابلۆقەی سەریان، هێزێکی گەورە لەشارەکە هاتنە دەروو هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مەغۆل، مەغۆلەکان سەرەتا بەرووی هێرشی سەرمەقەندییەکان وایان نیشاندا کەشکاون بۆیە مەیدانیان بەڕوی سوپای هێرشبەر چۆڵکرد، سەمەرقەندییەکان نەیان زانی ئەوە بۆسەیەکی مەغۆلەکانە، ئەو هێزە تەواو لەقەڵاکە دوورکەوتەوە، ئەوەبوو هێزێکی

---

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ٧ .

گەورەی تــری مەغۆلەکــان هــاتن و کەوتـــنە نێــوان قەڵاو پشــتی هێــزی ســەمەرقەندییەکان، ئینجــا هێــزەکەی تــری مەغــۆل کە وایــان نیشــاندابوو شکاون، ئەوانیش گەڕانەوەو لەدوولاوە هێرشێکی زۆر گەورە کرایە سەر ئەو لەشـکرە هێرشـبەرەی موسـڵمانان بەداخەوە بەتەواوی شـکان تەنها لەو شـەڕە هەندێك لەسـەرچاوەکان دەڵێن نـزیکەی پەنجا هەزار موسـڵمان شـەهید کـران بەجارێك نزیکەی نیوەی تەواوی سوپای سەمەرقەندییەکان لەناو چوو، کە ئەوەش بووە هۆکاری ئەوەی ورەی خەڵکی شارەکە بڕوخێ، ڕۆژی سێیەم و چوارەم قەبیلە تورکەکانی ئەو شارە بەنهێنی پەیوەندیان بە(جەنگیزخان) کرد و پێیـان گـوت، کە ئێمەی تـورك لە گەڵ مەغۆلەکان لە یەك ڕەچەڵەکەوە هاتووین، پێمـان خۆشـە قبولمـان کەی و ئێمە شـارەکە جێدەهێڵین لەهەنـدێك سـەرچاوە هـاتووە ئەو قەبـیلە تورکـانەی پەیوەنـدیان بە(جەنگیزخـان)ەوە کـرد بەسەرکردایەتی (توغـای خـان) بـوو کە دەکـاتە بـرای (ترکـان خـاتوون) واتە خــاڵی خەواریــزم شــاه[(١)] ئەوە بــوو جەنگیزخــان پێشــنیارەکەی قبــوڵکردن، تورکەکـان خۆیـان و بنەماڵەکانینـان چـونە ڕیـزی مەغۆلەکـان، ئینجـا ئەو خەڵـکەی تـری شـارەکە ئەوانـیش نوێنەریـان نـارد بـۆ لای جەنگیزخـان و ئامـادەیی خۆیـان دەربـڕی بەوەی کەشـارەکە تەسـلیم بەجەنگیزخـان بـکەن بەمەرجی سەلامەتی خەڵکی شارەکە، جەنگیزخان پێشنیارەکە قبوڵ دەکـاو، هێزی مەغـۆل دەچێـتە شـارەکە، بەڵام جەنگیزخـان و مەغۆلەکـان زۆربەی

(١) تاريخ المغول، عباس اقبال، لاپەڕە ٧٢.

جاران خاوەن پەیمانی خۆیان نەبووینە، بۆیە دەستدەکەن بەکوشتنی ئەوانەی بەرەنگاری هێزەکانیان ببونەوەو لەو بەینە خەڵکێکی یەکجار زۆری شارەکە دەکوژن و ئافرەتەکان بەکەنیزە دەبەن و دابەشیان دەکەن بەسەر سەربازە مەغۆلەکان (ولاحول ولا قوة الا بالله العلی العظیم).کەوتنی ئەو شارە لەسەرتای ساڵی (٦١٧) کۆچی دەبێ.[١]ئیمام ابن الاثیر ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمێ تەنها لەو شارە نزیکەی حەفتا هەزار کەس کوژرا.[٢]دواتر جەنگیزخان ڕێ دەدات ئەو خەڵکەی کەماون بگەڕێنەوە شوێنی خۆیان بەو مەرجەی باجی ساڵانە بدەن کە بڕەکەی سی هەزار دینار بووە، هەروەها جەنگیزخان صەنعەت کارێکی زۆریش لەو شارەوە دەبا بۆ (قەرەقورم) بۆ دروستکردنی کۆشك و پەرەپێدانی صەنعەت لە پایتەختی دەوڵەتی مەغۆل، ئەو هەنگاوەی مەغۆل ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە جەنگیزخان سودی لەعەقڵ و ئەزمونە پیشەسازییەکانی ئەو شوێنانە وەردەگرت کە داگیری دەکردن ئەهلی صەنعەتی نەدەکوشت و بۆ ئاوەدان کردنەوەی شارەکانی خۆیان و پەرەپێدانی کەرەستەی سەربازی سودی لێوەردەگرتن، بەو جۆرە بەکەوتنی سەمەرقەند تەواوی شارەکانی ئەودیوی ڕوبار (ماوراء النهر)[٣]دەکەوێتە

(١) الدولة الاسلامیة والمغول، لاپەڕە ١٤٧.
(٢) الکامل في التاریخ (١٠/ ٣٤١).
(٣) مەبەست لە (ماوراء النهر) هەردوو ڕووباری جەیحون کە ڕووسەکان ناویان ناوە(أمور داریا) وە ڕوباری (سارداریا) کە مبەست پێی (سەیحۆنە) ئەو شارانەی دەکەوێتە نێوان ئەو دوو ڕووبارە پێی گوتراوە بلاد ما وراء النهر، هەروەها بەو ناوچەیەگوتراوە (الصغد) کە ئێستا جگە لە ئوزباکستان بەشێکی دەکەوێتە وڵاتی (طاجیکستان) .

دەست مەغۆلەکان، دوای گرتنی سەمەرقەند جەنگیزخان بڕیارێك دەردەکا بەگرتنی (سوڵتان خەواریزم شاە) داوا لەدوو سەرکردەی سەربازی خۆی دەکا یەکیان بەناوی (شپی) ئەوەی تر بەناوی (سوبوتای) دەڵێ بەدوای خەواریزم شاە بگەڕێن و بۆمی بهێنن لەهەر کوێ بێ، پێیان دەڵێ ئەگەر پێی گەیشتن سوپایەکی گەورەی پێبوو هەواڵم بۆ بنێرن خۆم بۆ ڕووبەڕووبونەوەی دێم، ئەگەر زانیشتان ڕادەکا ڕووی لەهەرکوێ کرد، بچون بەشوێنی تاوەکو دەیگرن، لەهەمان کاتدا سوپایەکی گەورە ئامادە دەکا بەسەرکردایەتی هەردوو کوڕی (جغتای) و (ئەقتای) و بەرەو شاری (جورجانییە) دەیانێرێ، کە پایتەختی مەملەکەتی خەواریزم شاە بوو، ئەو کاتەی ئۆتراڕو بوخاراو سەمەرقەند یەك بەدوای یەك کەوتن (خەواریزم شاە) لە شاری (بەلخ) بوو کەدەکەوێتە ئەفغانستانی ئێستا و نزیك شاری (مەزاری شەریف).

(عەلائەدین خواریزم شاە)، لەگەڵ سەرکردە سەربازییەکانی خۆی کۆبویەوە سەرکردە سەربازییەکان هەندێکیان پێیان باش بوو، (خەواریزم شاە) بچێتە شاری (غەزنە) لەوێوە دیسان سوپاکەی ڕێکبخاتەوە و ڕوو بەڕووی مەغۆل ببنەوە، ئەگەر لە (غەزنە) شکان ئەوا دەتوانن بەئاسانی بگەنە (هیند)، بەڵام لەبەر خێرایی ڕووداوەکان و مەشورەتی یەکێك لە وەزیرەکانی کوڕی خەواریزم شاە (ڕوکنەدین) کە حاکمی عێراقی عەجەم بوو ئەو وەزیرە ناوی (عماد الملك)ە، قەناعەت بە خەواریزم شاە دەکات کەبێتە ناوچەکەی

ئەوان و ئەوە بوو بەرەو عێراقی عەجەم کەوتەڕێ[(١)].

خەواریزم شاە ورەی زۆر ڕووخا بوو، پێی وابوو شکەستی ئەو جارەی زۆر گەورەیە و ناتوانێ جارەکی تر، ئەو شوێنانە بگێڕیتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی کە کەوتـونەتە دەسـت مەغـۆل، بـۆیە لە هـیچ شـوێنێك ئـۆقرە نـاگرێ، ماوەیەکی کەم لە نەیسابوور دەمێنێتەوە[(٢)]، ئینجا بەرەو ناوچەی (بەستام) دەکەوێتەڕێ خەواریزم شاە لەکاتی ڕاکردنی لەڕووی مەغۆلەکان دە سندوق (ئـاڵتون و دڕی) زۆر گـران بەهـای پێبـوو، لە نـاوچەی (بەسـتام) هەر دە سـندوق ئـاڵتون تەسـلیم بەپێیـاوێکی زۆر نزیکـی خـۆی دەکـا، دەڵـێ ئەو سـنوقانە بـبە قەڵای (ئەردەهەن) کە قەڵایەك بـووە نزیکـی مازەنـدەران، و ماوەی سێ ڕۆژە ڕێ لە شاری (ڕەیی) دور بووە، بەڵام ئەو پیاوە ناتوانێ سـنوقەکان ڕزگـار بکـاو هەمـوی دەکەوێـتە دەسـت مەغـۆل و ئەوانـیش بـۆ

(١) مێژوونوسان کاتی خۆی (کوفە)و (بەسرا)یان بەعراقەین (عراقین) ناو دەبرد، بەڵام عێراقی عەجەم مەبەست پێی ئێران بووە تا دەگاتە خوراسان هەندێکیش ڕووباری (جەیحۆن)یان کردۆتە دوا سنوری عێراقی عەجەم گوتویانە ئەوە سنوری نێوان ئێران و وڵاتی تورکە کە بە ئیقلیمی (تۆران) ناویان بردوە. هەروەها زۆر جار بە (اقليم الجبال) یش ناویان بردوە، ئەو کات تەواوی (کوردستان)یشی گرتۆتەوە. (معجم البلدان، ٥/ ٤٧١، الروض المعطار في خبر الأقطار، ص ٥٩٦، بلدان الخلافة الشرقية، ص ٢٢٩، ٢٢١). حاشية العطار على شرح الجلال المحلي على جمع الجوامع (٢/ ١٩٦).

(٢) نەیسابوور یان (نەیشابوور) ئەو کات بە پایتەختی خوراسان هەژمار دەکرا ئێستا دەکەوێتە ئێران لە نێوان شاری مەشهەد و سەبزوار دایە.

جەنگیزخـــانی ڕەوانە دەکەن.[١] هەر لەو نـــاوچەیە زۆرێـــك لە ســـەرکردە سـەربازییەکانی خەوارێـزم شـاە هەوڵـدەدەن قەنـاعەتی پێـبکەن کە باشـترین شـوێن بـۆڕوو بەڕووبـونەوەی سـوپای مەغـۆل نـاوچەی عێراقـی عەجەمە، بەڵام خەوارێــزم شــاە قەنــاعەت ناکــاو بەتەواوی ورەی ڕوخــابوو، ئەوە لەکاتێکدا هێزەکانی مەغۆل بەردەوام بوون لە کاوڵکردنی ئەو شوێنانەی کە دەیانگرت و شوێن بەشوێنیش بەدوای (خەوارێزم شاە) دەگەڕان، هێزەکانی مەغـۆل دەگەنە نـاوچەی (ڕەی) و (ئامـل) و تەواوی ئەو شـوێنانە داگیـر دەکەن، خەوارزیـم شـا بەرەو (مازەنـدەران) دەکەوێـتە ڕێ. لەڕێـی ڕاکردنـی (خەوارێزم شاە) سوپایەکی نزیکەی بیست هەزار کەسی لەگەڵدا بـوو، بەڵام سـوپاکەی هەمـوی لەناوچەکـان پەرت ببـون و چەنـد جـارەکیش کەوتـنە بۆسـەی مەغۆلەکـان تـا زۆرێـك لەسـەرکردەکانی خەوارێـزم شـاە دەکـوژرێن، یەکێـك لەو سـەرکردانەی خەوارزیـم شـاە کەدەکـوژرێ (عمـاد الملـك) بـوو گەورە وەزیری (ڕوکنەدینی) کوڕی خەوارێزم شاە و هەتـا لەشـەڕێك تیـرەك بەر ئەسپەکەی خەوارێز شاە دەکەوێ، خەوارێزم شاە خۆی و چەند کەسێکی دەورور بەری ڕزگاریـان دەبـێ بەرەو مازەنـدەران دەکەونە ڕێ، مەغۆلەکـان بەوە دەزانـن و ئینجـا (خەوارێـزم شـاە) لەوێـش بەرەو دێیەکـی بچـوك لەسـەر (دەریـای قەزویـن، خەزەر) جێگیـر دەبـێ ئەو دێـیە نـاوی (ئابەسـکون)ە،

(١) التاريخ السياسى للدولة الخوارزمية، لاپەڕە ١٨٧. هەروەها کتێبی تاريخ المغول عباس اقبال، لاپەڕە ٧٦.

خەواریزم شاه لەو دێیە بچوکە ماوەیەك دەمێنێتەوە و لەمزگەوت لەگەڵ خەڵکی دێیەکە نوێژدەکا و زۆر جار لەخوا دەپاڕایەوە ئەگەر ئەو جارەی لەو میحنەتە ڕزگاری بێ ئەوا بەڵێن بێ حوکمێکی دادوەرانە لە مەملەکەتەکەی بگێڕێ، ئالەو کاتە کە خۆی لەو دێیە بچوکە حەشار داوە، هەندێك لە پیاوەکانی بەنهێنی پەیوەندی بە مەغۆلەکان دەکەن، یەکێك لەوکەسانە سەرکردەیەك بەناوی (ركن الدين كبودخان) بوو، کاتی خۆی کە (خەواریزم شاه)، مازەندەران دەگری مام و کوڕە مامی ئەو کەسە دەکوژێ، ئەویش ئەوە بەهەل دەزانێ و هەوڵدەدا تۆڵەی خۆی لە (خەواریزم شاه) بکاتەوەو دەچێتە ڕیزی مەغۆلەکان و لەگەڵ ئەوان هێرش دەکەنە سەر ئەو دێیە بچوکە، بەڵام خەواریزم شایان بۆ ناگیرێ، خەواریزم شاه بە کەشتییێکی بچوك ڕوو لە دورگەیەکی بچوك دەکات بەناوی (ئابەسکون) کە ئێستا پیی دەگوترێ (ئاشورادە) دەکەوێتە ولاتی ئیران، مەغۆلەکان دەزانن ئەو کەشتیە بچوکە خەواریزم شاهی تێدایە زۆر هەوڵدەدەن دەستگیری بکەن، بەڵام نایگەنێ و خەواریزم شایان لێ وون دەبێ و سوپاکەی مەغۆل دەگەڕێنەوە بۆ لای جەنگیزخان، لەو کاتەشە خەواریزم شاه بەوەش دەزانێ کە تەواوی ماڵ و کچەکانی و دایك و خێزانەکانی لەمازەندەران کەوتونەتە دەست مەغۆلەکان خەفەتی ئەو شکەستە گەورەیەو لەدەستدانی تەواوی بنەماڵەکەی لە (خەواریزم شاه) کۆدەبنەوە و لەهەمان کاتدا توشی نەخۆشیەکی سەخت دەبێ و هەر لەو (دورگە) بچوکە وەفات

دەکاو هیچیان دەست ناکەوێ (خەواریزم شا)ی پێ کفن بکەن تەنها بەرگێکی کۆنی کەسێك نەبێ بەناوی (شمس الدين محمود الجاويش) هەر ئەو کەسە خەواریزم شاە دەشوات و لەو دورگە بچوکە دەینێژن ئەوە لەساڵی (٦١٧) کۆچی بوو.[١] ئینجا (نەسەوی) لەکتێبەکەی (سيرة جلال الدين المنكبرتي لاپەڕە ١٢٠ دەڵێ: خەواریزم شاە کە زانی ئەجەلی نزیك بۆتەوە کوڕەکانی بانگ دەکا واتە (جلال الدين منکبرتی و ئەزلاغ و شاو ئاق شا) وەپێیان دەڵێ: ان عرى السلطنة قد انفصمت والدولة قد وهت قواعدها وتهدمت، و هذا العدو قد تأكدت أسبابه و تشبثت بالملك أظفاره و تعلقت أنيابه وليس ياخذ ثأري الا ولدي منكبرتي، وها انا ذا موليه العهد فعليكما بطاعته، والانخراط في سلك تباعته و شد سيفه بيده على وسط جلال الدين .

گرێی دەسەڵات و مەملەکەتی ئێمە کرانەوە بنچینە و بنەڕەتی هەڵوەشایەوە، ئەو دوژمنەش لە زیاد و بەهێز بوون دایە تۆڵەی منیش تەنها (مونکەبرتی) کوڕم لییان دەسەنێتەوە، بۆیە ئەوە ئەو دەکەم بە جێنشینی خۆم دوای مردنم، وە داوا لەهەردوو کوڕەکەی تری دەکات لە گوێڕایەڵی (جلال الدين)ی برایان دەرنەچن و ئینجا بەخۆی شمشێرەکەی لە قەد کوڕەکەی دەبەستێ ئەوەش نیشانەی گواستنەوەی موڵك ودەسەڵاتی خەواریزمە لەباوکەوە بۆکوڕ، هەر لەو دورگەیە سوڵتان خەواریزم دەنێژرێ،

(١) التاريخ السياسى للدولة الخوارزميه، لاپەڕە ١٨٩.

دواتر جلال الدینی کوڕی گۆڕەکەی دەگوازێتەوە بۆ قەڵای (قلعة أزدهـن) کە هەر لە ناوچەی مازەندەران بوو، بەڵام ئەو کاتەی مەغۆلەکان تەواوی ئێـران داگیـر دەکەن بە شـوێنی گـۆڕەکەی سـوڵتان خەواریـزم دەزانــن، گۆڕەکەی هەڵدەدەنەوەو ئیسك و پڕوسکەکەی دەسوتێنن، بەم جۆرە کۆتـایی بە ژیانی (محمد خەواریزم شاه) هات، ئینجا قۆناغێکی تـازە دەستپێدەکات لە بەرەنگـار بـوونەوەی مەغۆلەکـان بەسـەرکردایەتی کـوڕی خەواریـزم شـاه سـوڵتان جەلالەدینــی مــونکەبرتی، بەڵام بەر لەوەی بچیــنە ســەر باســی بەرەنگار بوونەوەو ژیانی (مونکەبرتی) گرنگە باسی بەسەر هـاتی دایکـی سوڵتان خەواریزم شاه بکەین (ترکان خاتوون).

# بەسەر هاتی (ترکان خاتون)
# دایکی سوڵتان خەواریزم شاه

(ترکان خاتون) لە هۆزی (بیاووت)ە، کچی (خان جەنکشییە) کەیەکێك بووە لە پاداشای تورکەکان، شوو بە (تەکش کوڕی ئیل) دەکا کوڕی ئەرسەلان، کە دەکاتە باوکی سوڵتان خەواریزم شاه، واتە کچە پادشایەو شوو بەکوڕ پادشا دەکا، دوای ئەوەی دەسەڵات دەکەوێتە دەست پیاوەکەی واتە سوڵتان (تەکش)ی خەواریزمی، زۆرێك لە عەشیرەت و بنەماڵەی ترکان خاتوون، تێکەڵ بەدەسەڵات دەبن و گەورەسەرکردەو پیاوە گەورەکانی دەوڵەت لە عەشیرەتی ئەو ئافرەتە بوون، هەر لەبەرئەوەش بوو (ترکان خاتون) قسەی زۆر دەڕۆیی و جەمسەرێکی بەهێزی دەسەڵات بوو لە دەوڵەتی خەواریزمی هەتا دوای مردنی سوڵتان (تەکش) و گواستنەوەی دەسەڵات بۆ کورەکەی سوڵتان محمد خەواریزم شاه، ترکان خاتوون بەهۆی ئەو دەسەڵاتە بەهێزەی هەیبو، نازناوی (خداوەندی جیهان) لێنرا بوو واتە خاوەنی جیهان، ئافرەتێك بوو خاوەن کەسایەتێکی بەهێز بوو لەگەڵ ئەوەش بکوژو خوێنڕێژیکی گەورەش بوو، سەرەڕای ئەوەی حەزی نەدەکرد کەس ستەم لەکەس بکا، بەڵام خۆی ستەمکارێکی گەورە بوو، دەست وەردانی

ئەو ئافرەتە لە دەسەڵات زۆر جار سوڵتان خەواریزمی نیگەران دەکرد، بۆیە کێشەیەك کەوتبوە نێوان (ترکان خاتون) و سوڵتان خەواریزمی کوڕی، دوای ئەوەی (ئۆترار)گیرا و برای ترکان خاتون (ینال خان) کوژرا، گەرچی هەندێك لەسەر چاوەکان دەڵێن (یەنال خان) برازای (تورکان خان) بوە نەك برای، کەسێك بەناوی (بدر الدین العمید) کەیەکێك بوو لە پیاوەگەورەکانی خەواریزم شاه، ئەو پیاوە دەچێتە لای (جەنگیزخان) و بەجەنگیزخان دەڵێ: سوڵتان خەواریزم باوك و مام و کوڕە مام و کەسێکی زۆری بنەماڵەکەمی کوشتوە، ئێستاش من لە هەمووکەس زیاتر ڕقم لە خەواریزم شایە، بۆتۆڵە سەندنەوە لە خەواریزم ئامادەم هەموو کارێك ئەنجام بدەم و بە جەنگیزخان ڕادەگەیەنێ کە خەواریزم شاه خاوەن هێزێکی گەورەیە و کێشەیەکی زۆریشی لەگەڵ (ترکان خاتون)ی دایکی هەیە، ڕێم پێبدە با لەو بەینە من ڕۆڵی خۆم ببینم و کێشەی نێوان (ترکان خاتون) و (خەواریزم شای) کوڕی گەورە تر کەم، بەو ئومێدەی بەبێ شەڕ (خەواریزم) بگرین کە پایتەختی دەسەڵاتی خەواریزم شایە، جەنگیزخان ڕێی پێدەداو، بەدرەدین عەمید چەند نامەیەك لەسەر زاری گەورە پیاوانی دەسەڵاتی دەوڵەتی خەواریزم دەنوسێ و دەینێرێ بۆ (ترکان خان) لەنامەکاندا هاتوە، ئەوە سوڵتان خەواریزمی کوڕت بەتەنها جێی هێشتوی و با ئێمە بەدوای ڕێگە چارەیەکی تر بگەڕێن دەسەڵاتی تۆ بمێنێ و ڕێش نەدەین شەڕ بکەوێتە ناوچەکەی ئێمە، هەر لەو کاتەش (جەنگیزخان) حاجبەکەی خۆی

دەرگەوانەکەی خــۆی بــۆ لای (تورکــان خــاتون) دەنێــرێ کەنــاوی (دانشــمند)بوو، دانشــمەند لەســەر زاری جەنگیزخـان، بە(تورکـان خـاتون) ڕادەگەیەنــێ ئەوە کــوڕەکەت لە فەرمــانی تــۆ دەرچــوەو تــۆی بەتەنهـا جێهێشــتوە، بەڵێنــی ئەوەت پێــدەدەین کە خەواریــزم و خوراســان ودەوروبەی تەسلیم بەتۆ دەکەین، بەو مەرجەی بەبێ شەڕ خەواریزممان تەسلیم بکەن، تورکان متمانە بەبەڵێنەکەی (جەنگیزخان) ناکاو، خۆی و کەسە نزیکەکانی دەورو بەری بڕیـار دەدەن شـارەکە بەجێ بهـێڵن و بەرەو نـاوچەی مازەنـدەران بکەونە ڕێ.

## تاوانە گەورەکەی(تورکان خاتون)

تورکــان خــاتوون پێــی وابــوو، ئەو بــاروودۆخەی ڕوی لەدەســەڵاتی (خەواریزم) کردوە باروودۆخێکی کاتییە و بەو زووانە کۆتایی پێدێ، کاتی خۆشـی پیـاوەکەی واتە سـوڵتان (تەکـش) کە نـاوچەکەی لەژێـر دەسـەڵاتی سـەلجوقییەکان دەرهێنـا، چەنـد کەسـێکی زۆری لە کـوڕە پادشـاو گەورە پیاوانی (سەلجوقی ) دەستگیرکردبوو لە (خەواریـزم) زینـدانی کرابـوون وەکـو هەردوو کوڕی سوڵتان (طغـرل) سـەلجوقی و (عمـاد الـدین) والـی بەلـخ و کورەکەی عماد الدین کە والی (ترمذ)بوو وە والی (بامیان) کەناوی عـلاء الــدین بــوو، وە هەردوو کــوڕی والــی (ســقناق) و زۆر لەکــوڕە پادشــاو پلەدارەکــانی دەوڵەتــی ســەلجوقی، تورکــان خــاتون بەرلەوەی خەواریــزم بەجێبهێڵـێ فەرمـان دەکـا بەکوشـتنی هەمـوو ئەوانە، کە زۆربەیـان هـیچ

تاوانیان نەبوو، بەڵام تورکان خاتون گوتی ئەگەر ئەوانە ئازاد بکرێن، دور نییە لەگەڵ مەغۆلەکان هەوڵی زیندووکردنەوەی دەسەڵاتی (سەلجوقی) بدەن، بۆیە هەر هەموویان دەکوژێ[١].

لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە ئەو بنەماڵەیە بنەماڵەی دەسەڵات بووە، نەك بنەماڵەیەك لەخەمی بڵاو کردنەوەی ئەو ئیسلامە بێ، ئەو کوشتن و کاولکاریەی بنەماڵەی خەواریزم کردیان لە هیچ شوێنێکی ئەو ئیسلامە جێی نابێتەوە، بەداخەوە مێژووی ئەو بنەماڵانە مێژوویێکی ڕەشە، ئەوەندەی خەریکی کوشتن و نەهێشتنی یەکتر بووینەو ئەوەندە خەریکی گەیاندنی ئەو ئیسلامە نەبووینە، هەر لەبەرئەوەیە دەتوانین بڵێین، دەوڵەتی ئەوانە ڕاستە بەناوی ئیسلام بووە، بەڵام تاوانێکی گەورەیە رەفتارو هەڵسوکەوتی ئەو جۆرە بنەماڵەیە بدرێتە پاڵ ئیسلام، دەسەڵاتی ئەوانە دەسەڵاتی بڵاو بوونەوەو موڵکداری و خۆسەپاندن بووە، نەك دەسەڵاتێك لە خزمەت ئیسلام و شەریعەتی خوا.

بەو جۆرە (تورکان خاتون) خەواریزم جێدەهێڵێ، تەواوی منداڵەکانی سوڵتان خەواریزم لە کچ و کوڕی لەگەڵ خۆی دەبا هەرچی ئاڵتون و دڕو مەرجانی هەبوو هەرهەموو لەگەڵ خۆی بردو خەواریزمی جێهێشت، چەند پاسەوانێکی لەگەڵ بوون بۆ پاراستنی ئەو ئافرەت و منداڵانەو شارەزای ڕێگایەکەش بوون، یەکێك لەهەموان دڵسۆز تر بۆ (ترکان خاتون) کەسێك

(١) سیرة جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ٩٤.

بوو بەناوی (عمرخان) کوڕی والی ناوچەی (یازر)بوو، عومەر خان زۆر شارەزای ڕێگایەکە بوو (ترکان خاتون)یش زۆر متمانەی پێدەکرد، عومەرخان نازناوی (صبورخان) بوو، ئەوپیاوە کەباوکی دەمرێ، دەچێتە شوێنی باوکی و دەبێتە خاوەنەی ناو چەی (یازر)، بەڵام دواتر براکەی کەناوی (هندۆخانە) بەپیلانێك عومەر خان لە دەسەڵات لادەدا و خۆی دەچێتە سەر کورسی دەسەڵات، کە(هندۆخان) دەگاتە سەر کورسی دەسەڵات فەرمان دەکا، چاوی (عومەرخان)ی برای کۆرە بکەن، ئەو کەسەی بەفەرمانەکە هەڵدەستێ عومەرخانی خۆش دەوێ بۆیە دەیبەن، بەڵام چاوی کۆر ناکەن و (عومەرخان)یش وا نیشان دەدا کە چاوی کۆرکراوە، ئەوەبوو یانزە ساڵی ڕێك عومەرخان لە ترسی براکەی، خۆی بەکۆرنیشان دەدا، تا (هیندۆخان) وەفات دەکا، ئینجا(تورکان خاتون) ناوچەکەی (هیندۆخان)یش دەخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆی، بەبەهانەی ئەوەی کە خێزانی (هیندۆخان) ئافرەتێك بووە لە عەشیرەتی (تورکان خاتون)، ئەو کات عومەرخان چاوی خۆی دەکاتەوە و بەو ئومێدەی کە (تورکان خاتون) بیگێڕیتەوە سەر کورسی دەسەڵات، بەڵام تورکان خاتوون ئەوە ناکات و تەنها نازناوی خانی پێدەبەخشێ و ناوی دەنێ (صبورخان)، ئەوپیاوە زۆر دڵسۆزانە لەگەڵ تورکان خاتون دەبێ، ئەو کاتەی شاری (خەواریزم) جێدەهێڵن و لە سنوری (یازر)نزیك دەبنەوە، تورکان خاتون ترسی ئەوەی هەیە (عومەرخان) نەبادا بەجێی بهێڵێ بۆیە فەرمان دەکا و

دەڵـێ: لەگەردەنـی بـدەن، عومەرخـان لەوێ دەکـوژن بەبـێ ئەوەی هـیچ تـاوانێکی کردبێ، بەوەش تورکـان خـاتون تـاوانێکی تـریش دەخـاتە سـەر ئەو هەموو تاوانانەی کە ئەنجامی دابوون، دواتر (تورکان خاتون) و منداڵەکانی دەگەنە قەڵای (ئیلال، لال) قەڵایەکی سەختی ناو چەی (مازەندەران)[*] دەبـێ کە دەکەوێـتە (لاریجـان)ی ئێسـتا لەئێـران[1] مەغۆلەکـان دەگەنە شـوێنەکە و قەڵاکە گەمـارۆ دەدەن ئەو قەڵایە دەتـوانێ چـوار مانـگ بەرەنگاری مەغۆلەکان ببێتەوە، ئەوەی کە زۆر سەیرە هەروەکو نەسەوی[2] دەگێڕێتەوە و دەڵێ: ئەو قەڵایە لەشوێنێکی عاسێ بوو، ئەو ناو چەیەش بەناو بانگ بوو بەبارانی زۆر، بۆیە خەڵکی ناوچەکە زۆر خەمی ئاویان نەبـوو و ئـاوی زۆریـان گـل نەدەدایەوە، تـاوەکو تورکـان خـان دەگـاتە ئەو قەڵایە، بەقەدری خوای گەورە ئەو چەند مـانگەی مەغۆلەکان قەڵاکەیان گەمـارۆ دابـوو دڵۆپێـك بـاران نەبـاری، خەڵکـی قەڵاکە ڕۆژ بەڕۆژ لاوازو بێهێـز تردەبـوون تـائەو ڕادەیەی بـێ ئـاوی تینیـان بـۆ دێنـێ و بەناچـاری خۆیـان بەدەست هێزەکەی مەغـۆل دەدەن، ئەو ڕۆژەی کە (تورکـان خـاتون) خـۆی ڕادەسـتی هێـزەکەی مەغـۆل دەکـا، هەر ئەو ڕۆژە بـارانێکی زۆر بەگـوڕ دەبـارێ. سـبحان اللـه خـوای گەورە سـتەمی لەخـۆ حەرامکـردوە لەکەسیشی قبوڵ ناکا، زۆرجار ستەمکاران دواڕۆژیکی تاریك و نـاخۆش

---

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ٨ .

(١) تاریخ المغول، لاپەڕە ٨٣ .

(٢) کتێبی سیرة جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ٩٦.

چاوەڕوانیان دەکا، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ئەو کاتەی مەعازی نارد بۆ یەمەن پێی فەرموو: ... واتق دعوة المظلوم فانه ليس بينه وبين الله حجاب.[1] مانای ئەو فەرمودە ئەوەیە: کە نەکەن ستەم بکەن، لەبەر ئەوەی لەنێوان نزاو پاڕانەوەی کەسی ستەم لێکراو و خوای گەورە هیچ پەردەیەك نییە، خوای گەورە نزاکەی قبوڵ دەکا.

(تورکان خاتون) و کچەکان و منداڵە بچوکەکانی (خەواریزم شاه) هەرهەمویان دەنێردرین بۆلای جەنگیزخان، کە ئەو کات لەدەوروبەری شاری (طالقان) بوو، (جەنگیزخان) فەرمانی کوشتنی دەست بەجێی هەموو ئەوانە دەردەکا کە لەگەڵ (تورکان خاتون) بوون، یەکێك لەوانەی لەگەڵی بوو وەزیرێك بوو بەناوی (نظام الملك، محمد کوڕی صالح)، هەر هەموویان لەوێ دەکوژرێن هەتا مناله بچوکەکانی (خەواریزم شاه) تەنها تورکان خاتون و کچەکانی و کوڕێکی بچوکی (خەواریزم شاه) ناکوژرێن، هەمویان دەنێردرێن بۆ (قەراقروم)ی پایتەختی مەغۆل، کچەکانی سوڵتان دەدرێنە ئەو سەرکردە موسڵمانانەی چونەتە ڕیز مەغۆلەکان، تەنها کچێکی بەناوی (خان سوڵتان) کوڕەکەی جەنگیزخان (جوجی) بۆخۆی دەیبا، ئەو ئافرەتە کە دەکاتە خوشکی سوڵتان جلال الدین منکبرتی چەند منداڵەکی لەکوڕەکەی (جەنگیزخان) دەبێ و نامە بۆ براکەی واتە بۆ جلال الدین دەنێرێ کە منداڵەکانی موسڵمانن و جوجی قەدەغەی نەکردون لەوەی فێری

(١) رواه البخاري.

قورئــان بــبن، دواتــریش لە باســی (جــلال الــدین منكبرتــی) باســی ئەو خوشكەی دەكەین[١].

(توركان خاتون) ئافرەتێكی ستەمكار بوو، هەڵسوكەوتەكانی یەكێك بوو لەو هۆكارەكانی ڕوخاندنی دەوڵەتی خەواریزمەكان، كاتی خۆی هەرشوێنێك هێزەكانی (خواریزم شاه) بیان خستبا ژێر دەسەلآتی خۆیان، توركان خاتون كەسێكی لە عەشیرەتەكەی خۆی دەنارده ئەوێ بۆ ئەوەی سەرپەرشتی ناوچەكە بكا، ئینجا زۆر جار ئەو دیلانەی خەواریزم شاه دەیگرتن و دەیهێنان بۆ (خەواریزم) توركان خاتون بەشەو پاسەوانەكانی خۆی دەناردو دیلەكانیان دەكوشت و فڕێی دەدانە ڕوبارەوە، بۆ ئەوەی هیچ كەسێك نەتوانێ ڕوو بەڕووی دەسەلآتی خەواریزمەكان ببێتەوە، توركان خاتون ببوە جەمسەرێكی گەورەی دەسەلآت بەتایبەت لە سنوری شاری (خەواریزم) كە بە پایتەختی خەواریزمییەكان هەژمار دەكرا، بۆیە فشاری خستە سەر محمدی كوڕی كەدەبێ (ئۆزلاغ شاه) كوڕی بكاتە جێنشین و وەلی عەهدی خۆی، سەرەڕای ئەوەی سوڵتان محمد خەواریزم شاه سێ كوڕی هەبوون جلال الدین و ڕوكنەدین و اوزلاغ شاه، (ئۆزلاغ شاه) لە هەرسێ كوڕی بچوك تر بوو، بەلآم لەبەر ئەوەی دایكی ئۆزلاغ شاه، كچی گەورە پیاوێكی عەشیرەتی (توركان خاتون) بوو، بۆیە ئەوی كرد بەوەلی عەهدی (خەواریزم شاه)، ئینجا توركان خاتون لەگەڵ (جلال الدین منكبرتی) كە

---

(١) سیرة جلال الدین منكبرتی، لاپەڕە ٣٠٠

دەكا كوڕی كوڕی ناكۆك بوو، (نەسەوی) كە نوسەری كتێبی ژیاننامەی جلال الدین مونكەبرتیە، دەڵێ: یەكێك لەخزمەت كارەكانی (توركان خاتون) بەناوی (بدر الدین هلال) بۆی گێرامەوە، گوتی بە (تركان خاتون)م گوت بڕۆ باخۆمان بگەیەنینە كوڕی كوڕت (جلال الین منكبرتی) ئەو سەركردەیەكی ئازایەو ئێمە هەواڵمان پێگەیشتوە كە ئەو پیاوە خەریكە سوپایەكی گەورە كۆدەكاتەوەو دەتوانێ ڕوو بەڕووی مەغۆلەكان ببێتەوە، دەڵێ توركان خاتون وەڵامی دامەوە گوتی: پێم خۆشە بكەومە بەردەستی جەنگیزخان بەس، نەچمە سێبەری كوڕی (جیجاك) جیجاك دایكی جلال الدین مونكەبرتیە، واتە (توركان خاتون) ڕقی زۆری لەبوكەكەی دەبێتەوە كە دەكاتە دایكی جلال الدین منكبرتی، بۆیە (بەدرەدین)ی خزمەتكار دەڵێ: خۆم دزیەوەو توانیم لەدەستی ڕابكەم و خۆم گەیاندە سوپاكەی سوڵتان جلال الدین منكبرتی، ئینجا (نەسەوی) لەكتێبەكەی ژیاننامەی جلال الدین منكبرتی لاپەڕە ٩٧ دەگێڕیتەوە دەڵێ: توركان خاتون ئەو كاتەی بردرا (قەراقروم) زۆر جار لەبرسا دەچوە سەر سفرەكەی (جەنگیزخان) و خواردنی چەند ڕۆژیكی دەبرد، دەڵێ: لەو غوربەتە تەنها كوڕێكی بچوكی سوڵتان خەواریزم شاهی لەگەڵ بوو منداڵێك بوو بەناوی (كماخی شاە)، دڵی زۆر بەو منداڵە خۆش بوو، بۆیە زۆر جار قژی ئەو منداڵەی شانە دەكردو سێبورێكی گەورە بوو بۆی، ڕۆژێكیان لەخەو هەڵساو قژی ئەو منالە بچوكەی شانە دەكرد لەپێشە خۆی گوتی نازانم هۆكاری

چییە ئەو ڕۆ دڵم زۆر توندە، دەڵێ خەریکی ئەو قسانە بوو، چەند پیاوێکی (جەنگیزخان)ی لێبەدەرکەوت و گوتیان فەرمانمان پیکراوە ئەو منالە بخنکێنین، منالەکەیان گرت و لەبەر چاوی (تورکان خاتون) خنکاندیان، (تورکان خاتون) باجی ستەمەکانی دەدا و ئاوا بەزەلیلی لە (قەراقورم) ژیان دەباتە سەر تالەساڵی (٦٣٠) هەر لەوێ وەفات دەکا.

## کەوتنی ئیقلیمی (خەواریزم)و کاولکردنی پایتەختەکەی (جورجانییە) کە بە (ئۆرگەنج) یان (گرگانج) ناسراوە. (*)

پایتەختی خەواریزم (جورجانییە) هەر لەسەردەمی (ئۆتسز خەواریزم شاه) بەیەکێك لەگەورەترین و گرنگترین شارەکانی ئەو سەردەم و بەسەنتەری زانست و ئەدەب و بەدوا داچون و لێکۆڵینەوە هەژماردەکرا، ئەو شارە دەیان کتێبخانەی گەورەی لەخۆ گرتبوو، زانایان لە عیراق و خوراسان و باقی شارەکانی تری ئەو دیوی ڕوبارِ، بۆ زانست ڕوویان لەو شارەدەکر، جگە لەوەش ڕێگای بازرگانەکان بوو لە بیابانی قەفقاسەوە بۆ باشوری ڕوسیای ئێستا، ئەوشارە لەگەورەیی و چالاکی لەهەموو بوارەکان کێبڕکێی لەگەڵ شاری (مەڕو)دەکرد، بۆنمونە کەسێکی وەکو ئیمام جارو الله محمودی کوڕی عومەری خەواریزمی زەمەخشەڕی (٤٦٧-٥٣٨) لەو شارە دەژیا، هەروەها ئیمام محمد ی کوڕی عومەری ڕازی خاوەنی تەفسیری (مفاتح

---

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ٩ .

الغیب) لەو شارە دەژیا، سەدان و دەیان زانای تر کە بەهەڵگری مەشخەڵی زانست هەژمار دەکران جێنشینی ئەو شارە بوون، دوای ئەوەی (تورکان خاتون) خەواریزمی بەجێهێشت و خەڵکی خەواریزم بەشێوەیەکی گشتی وخەڵکی پایتەختی خەواریزم (جورجانییە) بەبێ سەر دەمێننەوە، ڕوویان کردە کەسێك، بەناوی (علی کوە دروٚخان) ئەو پیاوە کەسێکی هەوەس ویست بوو، کەسێکی زۆر درۆزن بوو لەبەر ئەوەش ناوی بە درۆزن دەرکردبوو، ئەوماوەیەی کە دەسەڵاتی خەواریزمی کەوتە دەست، دەستی کرد بەدزین و پارەی دەوڵەتی تەخشان و پەخشان کرد تا ئەو کاتەی (جلال الدین منکبرتی) دەگەڕێتەوە خەواریزم.[1] جەنگیزخان دەیزانی خواریزم و پایتەختەکەی (جرجانییە) بنکەی دەسەڵاتی خەواریزم شایەو لەو شارەش هۆزەکەی (ترکان خاتون) کەناوی (قنقلی) یە، خاوەن دەسەڵاتن و گرتنی ئەو شارە ئەوەندە ئاسان نابێ بۆیە هەر لەسەرەتاوە و بەر لەوەی (تورکان خاتون) شارەکە جێبهێڵێ هەوڵی گرتنی ئاشتیانە و بەبێ شەڕی ئەو شارەی دا و بەڵێنیشی بە (تورکان خاتون) دا کە دەسەڵاتی ئەو ناوچەیە تەسلیم بەو بکا، بەڵام (تورکان خاتون) متمانەی بە بەڵێنەکانی (جەنگیزخان) نەکرد و شارەکەی بەجێهێشت، ئەوەبوو دواتر (تورکان خاتون) دەکەوێتە دەست سوپاکەی جەنگیزخان هەروەکو باسمان کرد.

---

(١) سیرە جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ١٢٢.

سوڵتان (محمدی خەواریزم) بەر لەوەی وەفات بکا هەواڵی ناردبوو بۆ خەڵکی خەواریزم کە نەکەن بەرەنگاری هێزەکانی جەنگیزخان ببنەوە لەبەر ئەوەی ئەو شەڕە زۆر لەتوانای ئەوان گەورەترە، دوای ئەوەی سوڵتان محمد خەواریزم شاە وەفات دەکا هەروەکو باسمان کرد، و کوڕە گەورەکەی (جلال الدین) شوێنی باوکی دەگرێتەوە، کوڕەکانی سولتان محمد خەواریزم شاە، بەسەرپەرشتی (جلال الدین) دەگەڕێنەوە ئیقلیمی (خەواریزم)، خەڵکەکەی خەواریزم کەدزانن سولتان (جلال الدین) گەڕاوەتەوە دڵیان بەهاتنەوەی سوڵتان زۆر خۆش دەبێ و ورەیان بەرز دەبێتەوەو سوپایەکی گەورە بەهاتنەوەی (جلال الدین) ساز دەبێ، بەڵام ئەوەی ئەو حاڵەتەی تێکدا گەورە سەرکردەکانی ئیقلیمی خەواریزم و بەتایبەتی، پایتەخت (جرجانییە) لەقەبیلەی (قنقلی)بوون کە کەس و کاری (ترکان خاتون) بوون ئەوان گوتیان، ئێمە قبوڵمان نییە (جلال الدین) بچێتە شوێنی باوکی و دەبێ بەیعەت بە (ئۆزلاغ شاە) بدرێ، لەبەر ئەوەی کاتی خۆی (ترکان خاتون) قبوڵی نەبووە (جلال الدین) ببێتە میراتگری کورسی سوڵتان، ئەوەبوو(ئۆزلاغ شاە) دەکەنەوە بە سوڵتان و میراتگری (خەواریزم شاە) و هەوڵی گرتنی سوڵتان (جلال الدین)یان دا، سوڵتان جەلالەدین کەبەوەی زانی خۆی و (تیمور مەلیك) کە کاتی خۆی حاکمی (جەند) بوو، لەگەڵ (٣٠٠) کەس، ئیقلیمی خەواریزمیان بەجێهێشت و بەرەو (نەیسابور) کەوتنەڕێ، هەر لەو کاتەش (جەنگیزخان) هەر سێ کوڕی (جوجی و

جغتـای و ئۆختـای) بەرەو شـاری جورجـانییە دەنێـرێ بەهەرسـێ کـوڕی توانیـان سـوپایەك ئامـادە بـکەن ژمـارەکەی نـزیکەی (١٠٠) هەزار کەس بوو.[1] لەڕێگای بەرەو نەیسابوور، ئەو (٣٠٠) کەسەی لەگەڵ سوڵتان جلال الـدین بـوون، گەیشـتنە نزیـك شـاری (نەسـا) کە دەکەوێـتە وڵاتـی تورکمانسـتانی ئێسـتا و نـزیکە لە پـایتەختەکەی (عیشـق ئابـاد) سـوڵتان (جلال الدین منکبرتی) و ئەو هێزە بچوکەی لەگەڵی بوون، لەو دەورو بەرە بۆسەیەك دادەنێنەوە بۆ کەرتێکی (٧٠٠) کەسی مەغۆلەکان، هەر هەمویان دەکوژن، (محمدی کوڕی احمدی) نەسەوی خاوەنی کتێبی (سیرة جلال الـدین منکبرتـی) دەڵـێ: یەکەم تۆڵەوسـەرکەوتن ئەو تۆڵەیەبوو بەکوشـتنی ئەو (٧٠٠) کەسە لە مەغۆلەکـان، ئینجا هێزەکەی جلال الـدین منکبرتـی دەگەنە ئەو شارە واتە شاری (نەسا) لەوێ وەکو ویستگەیەك لەو شارە بۆ ماوەیەك دەحەسێنەوەو دواتر بەرەو (نەیسابور، نەیشابور) دەکەونەڕێ.

## کوشتنی براکانی سوڵتان جلال الدین منکبرتی

بەچەنـد ڕۆژێك دوای ئەوەی جـلال الـدین منکبرتـی خەواریـزم جێدەهێڵێ، براکانیشـی (ئـۆزلاغ شـاه و ئـاق شـاه) ڕادەکەن و شـارەکە بەجـێ دەهـێڵن، لەدەورو بەری شاری (نەسا) ڕوو بەڕووی هێزێکی مەغۆل دەبنەوە سەرەتا، هێزە مەغۆلەکە دەشکێنن و موسـڵمانەکان سـەردەکەون، دواتـر هێزێکـی تـری

(١) کتاب المغول فی التاریخ، فواد عبدالمعطی الصیاد، لاپەڕە ١٢٧.

مەغۆل دەگاتە ناوچەکە و هەردوو کوڕی خەواریـزم شاه دەکوژن و سـەریان پەل دەدەن و دەیخەنە سەر ڕمێك و لەشارەکانی تـر دەیگێڕن، لێرە دا ئەگەر سـەرنج بـدەیتە ئەو هەڵە گەورەیەی کوڕەکـانی خەوارزیـم شـاه کردیـان خـۆ ئەگەر لەوەسیەتی باوکیان دەرنەچوبان و (جلال الدين منكبرتي) یـان قبـوڵ بـوایە بە سـوڵتان، ئەوا بێگومـان ڕووداوەکـان بەئاڕاسـتەیەکی تـردا دەڕۆیـی، بەڵام (قدر الله وماشـاء فعـل)، هەڵەی بنەمـاڵەی خەواریـزم شـاه ڕۆڵێکـی زۆر سەرەکی دیت لەو میحنەتەی ڕوی لە جیهانی ئیسلامی کرد.[١]

## کەوتنی شاری (جورجانییە) پایتەختی خەواریزم

دوای ئەوەی کوڕەکانی خەواریزم شاه جورجانییە بەجێدەهێڵن، خەڵکەکەی ئەو شـاره کەسـێك بەسـەرکردە هەڵـدەبژێرن بەناوی (خمـارتكين) ئەو پیـاوە یەکێـك بـوو لە خزم و سـەرکردە زۆر نزیکەکـانی تورکـان خـاتون وە دەتـوانی سوپایەکی نزیکەی نۆوەد هەزار کەسی ئامادە بکا جگە لەو خۆبەخشـانەی ئامادەی خۆیان نیشاندابوو بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی مەغۆلەکان.[٢] هێزەکـانی مەغــۆل هەروەکــو باســمان کــرد نــزیکەی (١٠٠) هەزار کەس دەبــوون، بەسەرپەرشتی کوڕەکانی جەنگیزخان، گەمارۆی پایتەختی خەواریزمیـان دا (جرجانيــة، ئورجەنــدە) گەمــارۆکە بەشــێوەیەکی ئــاوا بــوو، ئەو شــارە گەورەیەیــان نەفەس بــڕ کــرد و لە جیهــانی دەرەوەیــان بەتەواوی دابــڕی

(١) سيرة جلال الدين منكبرتي، لاپەڕە ١٧٢ .

(٢) تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية، لاپەڕە ٨٢. عباس اقبال.

نـــزیکەی حەوت مانـــگ بەو جـــۆرە ئەو شـــارەیان گەمـــارۆ دا، ئینجـــا مەغۆلەکـان بەمەنجەنیـق بەردێکـی زۆریـان لە دیـواری شـارەکە دا، ئەو کـاتەی بەردیشیان نەمـا ڕوویـانکردە دارتـووە گەورەکـان و بڕیـانەوەو کـۆڵکە دارەکانیـان دەخسـتە نـاو ئـاو بـۆئەوەی ئـاو بکێشـێ و قـورس بـێ و ئینجا ڕایاندەوەشـاندە سـەر شـارەکە، تـاوەکو توانینـان دیـواری شـارەکە بـڕوخێنن وبگەنە ناو شارەکە، خەڵکی شارەکە ئازایەتێکی زۆریان نواند تەنها لەیەك شـەڕ نـزیکەی (٣٠٠٠) مەغۆلیـان کوشـت و شـەڕی گەڕەك بەگەڕەکـی مەغۆلەکانیـان کـرد لەو بەینـە ئەو سـەرکردەیەی خۆیـان هەڵیـان بژاردبـوو (خمـارتکین) ژێـر بەژێـری پەیوەنـدی بە مەغۆلەکـان دەکـات و شـارەکە جێــدەهێڵێ، بەڵام خەڵکــی شــارەکە بەردەوام دەبــن لە بەرەنگــاربوونەوەی مەغۆلەکـان، سـەرچاوەکان باسـی پـاڵەوانێتی چەنـد کەسێك دەکەن یەکێك لەوانە، زانایەکی بەناو بانگی صۆفی بووە بەناوی (شێخ نجم الـدین کبـری ) دوای ئەوەی داوای لێــدەکرێ خــۆی ڕزگــار بکــاو شــارەکە جێبهێڵــێ، لەوەڵامــدا دەڵــێ نەخێــر، مــن خــۆم ئامــادەکردوە بــۆ شــەهیدی، چەنــد قوتابییەکیشی لەگەڵی دەمێننەوەو شەڕدەکەن تاوەکو شەهید دەکرێن.[١] شەڕ بەو جۆرە بەردەوام دەبێ تاوەکو تەنها سێ گەڕەك بەدەستی خەڵکی شارەکە مـایەوە گەڕەکەکـانی تـر هەر هەمـوی کەوتە دەسـت مەغۆلەکـان، خەڵکـی شارەکە کەزانیـان تـازە نـاتوانن بەردەوام بـن لەو شـەڕە بڕیاریـان دا دانوسـاندن

---

(١)کتێبی المغول فی التاریخ / فؤاد عبدالعطی الصیاد، لاپەڕە ١٢٧

بکەن لەگەڵ هێزی مەغۆڵەکان، نوێنەرێکیان نارد بەناوی (عالی الدین الخیاطی) ئەو کەسە یەکێك بوو لەزاناکانی خەواریزم، (عالی الدین) لەگەڵ (جوجی)ی کوڕی، جەنگیزخان دادەنیشێ و دەڵێ: شارەکەتان تەسلیم دەکەین لەبەرامبەرئەوەی خەڵکی شارەکە سەلامەت بن، ئینجا (عالی الدین) لە قسەکانی بە (جوجی) دەڵێ: ئێمەی خەڵکی خەواریزم هەیبەتی سوپاکەی تۆمان بینی، ئێستا کاتی ئەوەیە سۆزو بەزەیی سوپاکەت ببینین، (جوجی) لەوەڵام دا دەڵێ: کامە هەیبەت ئێوە تاکرا لە سەربازەکانی منتان کوشت و بەپێچەوانەوە من هەیبەتی ئێوەم بینی، بۆیە دەبێ لێرە بەدواوە، هەیبەتی سوپاکەم ببینن، ئینجا خەڵکی شارەکە قەتڵو عام دەکا هەتا ئەوانەی بەدیل گیرابوون هەر هەمویان دەباتە دەرەوەی شارەکە لەگەردەنیان دەدرێ، تا دەگاتە ئەو ئاستەی هەر سەربازێکی مەغۆل ئەرکی کوشتنی بیست و چوار خەواریزمی پێدەسپێردێ، کوشتاری خەواریزمییەکان هەندە زۆر دەبێ مێژوو نوسێکی وەکو (جوەینی) لەکتێبی (تاریخ فاتح العالم) بەرگی یەکەم لاپەڕە ١٥١ دەڵێ: کوشتار هەندە زۆر بوون بەژمار نەدەهاتن، جگە لەوەش بەنداوێك لەسەر ڕووباری جیحون بو، ئەو بەنداوە دەڕوخێنن ئەو خەڵکەی لەشارەکە لەژێر زەمینەکان خۆیان حەشاردابوو هەر هەمویان دەخنکێن، شاری (جورجانییە) کەشاری عیلم بوو، بەتەواوی ژێر ئاو دەکەوێ، ئەوانەی لەو شارە ڕزگاریان دەبێ، تەنها پیشەوەرەکان بوون ئەوانەی جۆرێك لە جۆرەکانی صەنعەتیان دەزانی

کـۆدەکرێنەوە، هەنـدێکیان دنێـردرێنە پـایتەختی مەغۆلەکـان بـۆ ئـاوەدان کـردنەوەی ئەویَ، ئەوانـی تـر لەسـوپاکانی مەغـۆل بـۆ دروسـتکردنی کەرستەی سـەربازی بەکـار دەهێنـرێن، بەم شێوەیە شتێك نـامێنیَ بەنـاوی جورجانییە و تەواوی خەواریزم دەبێتە موڵکی (جوجی) کوڕی جەنگیزخان و هەر دوو کـوڕەکەی تـری (جغتـای و ئۆکتـای) دەگەڕێـنەوە لای جەنگیزخـان کە ئەو کـات گەمـارۆی (طالقـان)ی دابـوو، گەمـارۆی جورجـانییەو کەوتنـی لە مـانگی (ذی القعـدةی سـاڵی (٦١٧) تـاوەکو مانگی سەفەری ساڵی ٦١٨) خایاند[١].

(١) المغول – د السید باز العرینی، لاپەڕە ١٢٨. تاریخ المغول منذ حملة جنکیز خان حتی قیام الدولة التیموریة، لاپەڕە ٨٢. عباس اقبال.

# سوڵتان جلال الدین و کەوتنی (شاری نەیسابور) لەساڵی (٦١٨)کۆچی

شاری (نەیسابور، نەیشابور) یەکێکە لەو چوار شارەی کە ویلایەتی خوراسانی پێك دەهێنا، واتە (نەیسابور، مەرو، بەلخ، هرات) لەسەردەمی سامانییەکان و غەزنەوییەکان ئەو شارە بنکەی سەربازی سوڵتانەکانی ئەو بنەماڵانە بوون، سەرەتا ئەو شارە تەسلیم بە هێزەکانی مەغۆل ببون، بەفەرمانی مەغۆلەکان قەڵای شارەکەیان ڕووخاند، ئەوە بەر لەوەی سوڵتان (جەلالەدین) دەربکەوێ، دوای دەرکەوتنی سوڵتان (جلال الدین) خەڵکی ئەو ناوچانە دەستیان کرد بە چاککردنەوەی قەڵاکانیان و بڕیاڕی شەڕی مەغۆلەکانیان دا لەو بەینەش، سوڵتان جلال الدین دەگاتە نەیسابور، یەك مانگ لەوێ دەمێنیتەوە لەو مانگە دەتوانێ پەیوەندی بەزۆربەی سەرکردەکانی بکا، وە ئەو خەڵکەی لەڕوی هێرشەکانی تەتار ڕایان کردبوو لەوێدا کۆیان دەکاتەوە، خەریکی خۆکۆکردنەوەی هێزەکانیان دەبن، ئالەو کاتە مەغۆلەکان بە شوێنی سوڵتان جەلالەدین دەزانن، سوپایەکی گەورە دەنێرنە سەر شاری نەیسابور، سوڵتان (جلال الدین) بڕیار دەدا، نەیسابور بەجێبهێڵی و بەرەو (غەزنە) بکەوێتەڕێ، سەرەتا خەڵکی نەیسابور توانیان

چەند هێزێکی بچوکی مەغۆلەکان بشکێنن، دواتر هێزێکی مەغۆلەکان بەسەرکردایەتی (تغاجارنویان) کەزاوای جەنگیزخان بوو گەیشتە (نەیسابور) و ئەو شارەیان گەمارۆدا، ئەوە لەمانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦١٧) کۆچی بوو، لەڕۆژی سێەمی گەمارۆکە، تیرێك بە (تغاجار نویان) دەکەوێ و دەکوژرێ، سوپاکەی مەغۆل سەرەتا لە نەیسابور دەشکێن، سەرکردەیەکی تری مەغۆلەکان بەناوی (تورکای نویان) سەرکردایەتی ئەو سوپایە دەکات و هێزەکەی مەغۆل دەکا بە دوو بەش، بەشێکیان ڕوو دەکەنە شاری (طوس) بەشەکەی تر ڕوو دەکەنە شاری (سبزوار) دوای شەڕێکی سێ ڕۆژە دەتوانن شاری (سەبزوار) بگرن، قەتلوعامی خەڵکەکە دەکەن تەنها لەو شارە نزیکەی (٧٠) هەزار کەس دەکوژن، بەم شێوەیە هەردوو لای شاری نەیسابوور (طوس) و (سبزوار) دەکەوێتە دەست مەغۆل، [1]لەو کاتە کوڕەکەی جەنگیزخان(تولی) خەریکی گرتنی شاری (مەرو) دەبێ، دوای گرتنی شاری (مەرو) بە هێزێکی گەورە لەساڵی (٦١٨) بەرەو شاری (نەیسابور) دێ و ئەو شارە گەمارۆ دەدا، شاری نەیسابور ئازایەتییێکی بێوێنەیان نواند، بەڵام دواتر زانیان کە شەڕەکە زۆر لەهێزو توانای ئەوان گەورە ترەو بڕیاری خۆ بەدەستدانیان دا، نوێنەرێکیان ڕەوانی لای(تولی) کوڕی جەنگیزخان کرد، نوێنەرەکە ناوی (قازی رکن الدین علی بن ابراهیم المغیشی) بوو، نوێنەر ئامادەی ئەوەبوو

---

(١) هەرسێ شار ئیستا لەسنوری ئێران دایە.

شارەکە تەسلیم بە (تولی)بکات، بەڵام کوڕەکەی جەنگیزخان خۆتەسلیم کردنەکەی ئەوانی قبوڵ نەکرد و نوێنەرەکەی لای خۆی گێڕایەوەو بەردەوام بوو لە هێرشکردنە سەر شارەکە، شاری نەیسابور نزیکەی (٣٠٠) مەنجەنیق و زیاتر لە سێ هەزار ئامێری وەشاندنی تیریان هەبوو، [١] بەڵام دوای سێ ڕۆژ لە شەڕ تەواوی نەیسابور دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان، خەڵکەکەی بەدیل دەگرن و دەیانبەنە دەرەوەی شارەکە، هەر هەمویان دەکوژن دواتر هەندێ لەبریندارەکان خۆیان لەناو کوژراوەکان شاردبووەوە تاوەکو مەغۆلەکان پێیان نەزانن، مەغۆلەکان بەوە دە زانن ئینجا بڕیار دەدەن پازدە ڕۆژیك لەو شارە بمێننەوە و بڕیاریاندا ئەوانەی کوشتویانە سەریان لە لاشەیان جودا بکرێتەوە نەوەك بریندارێك نەمردبێ و ئەوان پێیان نەزانی بێ، ئەوەبوو سەری هەر هەمویان لە لاشە جوداکرایەوە، ئینجا کچەکەی جەنگیزخان کەخێزانی (تغاجر) بوو، لەبەر ئەوەی پیاوەکەی لە نەیسابور کوژرابوو دووپاتی کردەوە کە نابێ هیچ کەس لەو شارە بەزیندویی دەرچی هەتا ئاژەڵەکانیشیان کوشت و نەك هەر مرۆڤەکان، بەڵکو فەرمانی کرد هەتا سەگ و پشیلەی شارەکەش بکوژن، ئینجا فەرمانی داو تەواوی شارەکەیان تەخت کرد.[٢]

---

(١) تاريخ فاتح العالم الجويني، ج ١ لاپەڕە ١٩٢.

(٢) تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية عباس اقبال، لاپەڕە ٩٢.

## کەوتنی (هیرات) ساڵی (٦١٨) کۆچی

لەدوای کۆمەڵکوژیەکەی نەیشابور(تولی) کوڕی جەنگیزخان بەرەو (هیرات) دەکەوێتەڕێ، کە ئێستا دەکەوێتە وڵاتی ئەفغانستان و لەسنوری ئێرانەوە نزیکە، سەرەتا (تولی) نوێنەرێکی خۆی دەنێرێ بۆ شارەکە و داوایان لێدەکات خۆیان بەدەست بدەن، بەڵام والی (هیرات) (مەلیك شمس الدین الجوزجانی) ئەوە قبوڵ ناکات و نوێنەرەکەی مەغۆل دەکوژێ، شەڕێکی گەورە دەکەوێتە نێوان خەڵکی هیرات و سوپاکەی مەغۆل حەوت ڕۆژی یەکەم زۆر لە سەربازەکانی مەغۆل دەکوژرێن، ڕۆژی هەشتەم تیرەك بەر مەلیك شمس الدین الجوزجانی دەکەوێ، بەسەختی بریندار دەبێ، دواتر دەمرێ مردنی شمس الدین الجوزجانی کاریگەرێکی زۆری هەبوو لەسەر ورەی خەڵکی شارەکە بۆیە بڕیاری خۆ بەدەستدانیان دا، هیرات کەوتە دەست سوپاکەی مەغۆل، تەنها لەو شارە دوازدە هەزار کەس دەکوژرێ لەبەر ئەوەی گومانی ئەوەیان لێدەکرا سەربەسوپاکەی سوڵتان جلال الدین منکبرتی بن، بەکەوتنی هیرات تەواوی خوراسان دەکەوێتە بەردەستی هێزەکانی مەغۆل.

ئەوەی شایەنی باسە لێرە ئاماژەی پێبکەین دوای ئەوەی تەواوی خوراسان دەکەوێتە بەردەستی هێزەکانی مەغۆل، هۆزێك لە هۆزە تورکمانییەکان کە جێنشینی دەورو بەری شاری (مەرو)بوون، لەترسی هێزەکانی مەغۆل شوین و جێگای خۆیان بەجێ دەهێڵن و دەگەنە

دەوروبەری (ئەنقەرە) ژمارەی ئەو هۆزە نزیکەی(٤٠٠ تا٥٠٠)کەس بوون، گەورەکەشیان کەسێك بوو بەناوی(ئورتوغرل) لەسنوری نێوان سەلجوقییە ڕۆمییەکان و بیزەنتییەکان، دواتر ئەوانەن دەوڵەتێك دادەمەزرێنن بەناوی دەوڵەتی عوسمانی ناوبانگ دەردەکا.[١]

دوای کەوتنی (هیرات) تولی کوڕی جەنگیزخان خۆی دەگەیەنێتە باوکی، ئەو کات جەنگیزخان شاری (طالقان)ی گەمارۆدابوو،[٢] دوای ئەوەی هێزەکانی تولی کوڕی جەنگیزخان دەگاتە لای هێزەکانی باوکی، هەردوو هێز بەماوەیەکی کەم دەتوانن شارەکانی (طالقان و باميان و طخارستان) داگیرکەن، ئەو شارانە یەك بەدوای یەك کەوتنە بەردەستی مەغۆل و قەتلوعامی خەڵکەکە دەکرێ، بەتایبەت شاری (باميان) هەر بەتەواوی کاولدەکرێ لەبەرئەوەی لەو شەڕە (موتجن) کەدەکا کوڕی (جغتای) کوڕی جەنگیزخان، تیرێکی بەردەکەوێ و دەکوژرێ، جەنگیزخان لەتۆڵەی کوڕی کوڕەکەی کە زۆری خۆشویستوە، فەرمان دەکا، کە هیچ کەس نابێ لەوشارە ڕزگاری بێ دوای کوشتنی ژن و منداڵ و پیاو پیرو پەك کەوتە، سەگ و پشیلەکانی ئەو شارەشیان نەهێشت، باميان

---

(١) الدولة الخوارزمية والمغول /حافظ أحمد حمدي، لاپەڕە ١٧٨. وە کتێبی اعصار من الشرق ثروت عكاشة، لاپەڕە ٢١٩.

(٢) ئەو (طالقانە) لە (مرو الروذ) نزیك بووە کەدەکەوێتە نێوان باکوری ئەفغانستان و باشوری تورکمانستان، دوو(طالقان)ی تریش هەن یەکیان دەکەوێتە ئێران لەنزیك تارانی پایتەختە، ئەوەی تر (طالقان طخارستان)ە کەدەکەوێتە ئەفغانستانی ئێستا نزیك شاری (قوندوز). تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية، لاپەڕە ١٠٦ .

بەشێوەیەکی وا کاوڵکرابوو پێنج ساڵ دوای ئەورووداوەش کەڵکی جێنیشنی نەمابوو.

لەو کاتە هەواڵ دەگاتە جەنگیزخان کە جلال الدین منکبرتی چەند سەرکەوتنێکی گەورەی بەدەست هێناوە بەتایبەتی لەناو چەی (غەزنە) بۆیە بڕیار دەدا بەرەو (غەزنە) بکەوێتە ڕێ.

## شاری غەزنە و شەڕی (پروان) [1]

لەساڵی (٦١٨) سوڵتان جلال الدین دەگاتە شاری غەزنە، خەڵکی غەزنە پێشوازێکی گەرمی لێدەکەن و بەهاتنی زۆر دڵخۆش دەبن، زۆربەی سەرکردەو سوپا شکاوەکانی ناوچەکانی پێشاورو کابل، لەغەزنە لەدەوری سوڵتان جلال الدین کۆدەبنەوە، ژمارەی سوپای جلال الدین بەپێی هەندێ سەرچاوە دەگاتە شەست هەزار کەسی پیادەو حەفتا هەزار سوار چاك، یەکێك لەسەرکردە ئازاو بەجەرگەکانی خەواریزمییەکان کوڕەخاڵی سوڵتان جلال الدین بوو بەناوی (امین مەلیك)خۆی و دە هەزار کەس دەگەنەلای سوڵتان جلال الدین، ئەو کات شاری (قەندەهار) لەلایەن مەغۆلەکان گەمارۆ درابوو، یەکەم هەنگاوی جلال الدین شکاندنی گەمارۆی سەر شاری قەندەهار بوو، مەغۆلەکان بەرگەی هێرشەکانی سوپاکەی جلال الدین ناگرن و دەشکێن و شارەکە جێدەهێڵن و دەگەڕێنەوە لای جەنگیزخان،

(١) پەڕوان شارێك بووە کەوتۆتە نێوان غەزنە و بامیان.

جەنگیزخان سوپایەکی نزیکەی سی تا چل و پێنج هەزار کەسی ڕەوانە غەزنە دەکا بەسەرکردایەتی سەرکردەیەکی سەربازی مەغۆل بەناوی (قوتوقو نویان)، شکاندنی گەمارۆکەی سەر قەندەهار ورەی سوپای خەواریزمەکانی زۆر بەرز کردبووەوە، بەتایبەت پاڵەوانێکی وەکو (سیف الدین أغراق) پەیوەندی بە سوپاکەی جلال الدین کردبوو کە پاڵەوانێکی بەناو بانگی ناوچەکە بوو، سوپای مەغۆل و سوپای خەواریزمییەکان دەگەنەیەك، سوڵتان (جلال الدین) سوپاکەی خۆی کردبوە سێ بەش لای ڕاستی سوپاکەی تەسلیم بە (ئەمین مەلیك) کردبوو، لای چەپی سوپاکەی تەسلیم بە (سەیفەددین ئەغراق) کردبوو، خۆشی لەناوەڕاستی سوپاکە بوو، شەڕێکی زۆر گەورە دەستی پێکرد، نزیکەی دوو ڕۆژ لەیەکیان دا، تا گەیشتە ئەوەی سوڵتان جلال الدین، فەرمانی کرد با سەربازەکان لە ئەسپەکانیان دابزن و هێرشێکی توند بۆ سەر سەرکردایەتی سوپاکەی مەغۆل بکەن، (سوڵتان جلال الدین) خۆی بەشداری هێرشە گەورەکەی کرد کە بووە مایەی بەرزبوونەوەی ورەی تەواوی سوپاکە ئەوەبوو بەفەزڵی خوای گەورە توانیان سوپاکەی مەغۆل بشکێنن، ئەوشکەستەی مەغۆل بەیەکەم شکەستی گەورەی مەغۆلەکان دادەنرێ، کە خەڵکی شوێنەکانی تریش بەو شکەستەی مەغۆلیان زانی ئەوانیش بەڕوی مەغۆلەکان ڕاپەڕین، مەغۆلەکان لەتەواوی ناوچەکە شلەژان، (قوتو نویان) بەشکەستێکی گەورەوە دەگەڕێتەوە لای جەنگیزخان، ئەو

شکەستە ئـازارێکی زۆری جەنگیزخـان دەدا، بـۆیە سـوپایەك ئامـادە دەکـاو خۆی سەرپەرشتی دەکا، بەرەو غەزنە دەکەوێتەڕێ.(*)

موسـڵمانەکان بەداخەوە نەیـانتوانی ئەو سـەرکەوتنە گەورەیە بقـۆزنەوەو، یەکڕیزی خۆیان پتەو تربکەن، بەڵکو ناکۆکییێکی زۆر گەورە کەوتە نێوان، سـەرکردەکانی سـوپاکەی (جـلال الـدین) لەسـەر ئەو(غەنـیمەیەی) لەمەغۆلەکان گیرابوو (ئەمین مەلیك) و (سەیفەددین ئەغراق) کێشەکەیان گەورە دەبێ، هەندێك دەڵێن کێشەکە لەسەر ئەسپێك بووە کە لەمەغۆلەکان گیراوە، (ئەمین مەلیك) بە قەمچیەکەی دەستی، قەمچیەك لە لەسەری (سـەیفەددین ئەغـراق) دەدا، کە بەداخەوە ئەو کـات، سـوڵتان جـلال الـدین بێدەنگی بەرامبەر بە (ئەمین مەلیك) دەنوێنێ کە دەکاتە کوڕە خاڵی، ئەوە دەبێتە هۆی ئەوەی (سەیفەددین ئەغراق) دڵی بشکێ و خۆی و ئەوانەی لەگەڵی بوون سوپاکە جێبهێڵن ودەگەڕێنەوە ناوچەی پێشاور، سـوڵتان جلال الدین دواتر زۆر هەوڵیدا دڵیان ڕازی بکا و بیانگێڕیتەوە بەڵام هیچ سودی نەبوو، سـوپاکەیان بەجێهێشت (سبحان الله) ئەو سوپایەی بەسـەرکردایەتی (سـەیفەددین ئەغـراق) بـوو لەدەوروبەری پێشـاور ئەوانـیش کێشـەیەکی نـاو خۆیـان بـۆ دروست دەبـێ شـەڕێکی زۆر گەورە دەکەوێـتە نێوانیـان و چەنـد سەرکردەیەك یەکتر دەکوژن، سوپاکەیان زۆر لاواز دەبێ و دوای سێ مانگ سـوپای مەغـۆل دەگـاتە سـەریان ئەوانەی مـاون لەشـەڕێکدا هەر هەمویـان

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٠ .

دەکوژن.[١] ئەوەش بەڵێنی خوای گەورەیە هەرکاتێك دووبەرەگی سەری هەڵداو یەکریزی موسڵمانان تێك چوو ئەو دوارۆژە تاریکە چاوەڕوانیان دەکا: {وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ (٤٦)}[٢] دوای لاوازبوونی سوپای موسڵمانان و هاتنی سوپای جەنگیزخان بۆ ناوچەکە سوڵتان جلال الدین دەگەڕێتەوە (غەزنە).

## شەڕی (سند) لە ٨ی مانگی شەوالی ساڵی (٦١٨) کۆچی

سوڵتان جلال الدین دەزانێ توانای ڕوو بەڕووبونەوەی سوپاکەی جەنگیزخانی نییە، بۆیە بڕیار دەدا (غەزنە) بەجێبهێڵێ و بچێتە ئەو بەری ڕوباری (سند) واتە سوڵتان جلال الدین مەبەستیەتی بەرەو هیند بڕوا، جەنگیزخان کە بەوە دەزانێ کەتیبەیەك دەنێرێ بۆ ڕێگرتن لە سوڵتان جلال الدین، کەتیبەکە لەناوچەی (جردیز)[٣] دەگاتە سوپاکەی جلال الدین، جلال الدین دەتوانێ ئەو کەتیبەیە بشکێنێ و بەرەو قەراغی ڕوباری سند دەکەوێتەڕێ، جەنگیزخان دوای پازدە ڕۆژ دەگاتە ناوچەی (غزنین) کە نزیك بووە لە(جردیز) ئینجا زۆر پەلە دەکەن بگەنە سوپای خەواریزمییەکان،

(١) تاريخ المغول منذ حملة جنگیز خان حتى قيام الدولة التيمورية، لاپەڕە ٩٦.
(٢) الأنفال: ٤٦.
(٣) دەکەوێتە وڵاتی ئەفغانستانی ئێستا و لەنزیك سنوری پاکستانە.

سوڵتان گەرچی خەڵکێکی زووتر ڕەوانەکرد بوو، کە کەشتی بۆ ئامادە بکەن و لە ڕووبارەکە بپەڕنەوە بەڵام، کاتیان زۆر کەم بەدەست مابوو، تەنها یەك کەشتیان بۆ ئامادە کرا و سوپاکەی جەنگیزخان گەیشتنە سوپاکەی جلال الدین، سوپاکەی مەغۆل سوپای موسڵمانانی گەمارۆدا بەشێوەیەکی ئاوا نیمچە بازنەیی کەپێشیان بوو بەمەغۆل و پشتیان بوو بەڕووباری سند، سوڵتان جلال الدین خێزان و دایکی و منداڵەکانی سواری کەشتیەکە کرد، بەڵام پێڕا نەگەیشتن بپەڕنەوە، دایکی سوڵتان جلال الدین و خێزان و کەس و کارەکەی هاواریان کرد بمانکوژن با بەدیل نەکەوینە دەست (جەنگیزخان) ئینجا سوڵتان جلال الدین ماڵئاوایان لێدەکا و فەرمان دەکا، کەشتیەکە نوقمی ئاو بکەن و دایکی و خێزان و کەس و کارەکەی هەر هەموویان لە ڕووباری (سند) دەخنکێن[١] سوڵتان جلال الدین کوڕێکی تەمەن حەفت ساڵەی لەگەڵ دەمێنی، ئەو کوڕەی دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان و جەنگیزخان فەرمان دەکا، هەر لەوێ لەگەردەنی بدەن، ئەو منداڵە تەمەن حەفت ساڵەشیان لەوێ کوشت، سەرەتا سوڵتان جلال الدین ئازایەتێکی زۆر نواند و شەڕێکی زۆر دلێرانەی کرد، تا ئەو کاتەی (ئەمین مەلیك) کە سەر کردایەتی لای ڕاستی سوپاکەی دەکرد، دەشکێ و بەرەو پێشاور ڕا دەکاو گۆڕەپانی جەنگ جێدەهێڵێ لەپێشاور دەکەوێتە بەردەستی مەغۆلەکان و لەوێ دەیکوژن، جەنگیزخان زۆر لە سوڵتان جلال الدین نزیك

(١) سيرة جلال الدين منكبرتی، لاپەڕە ١٥٩.

دەبێتەوە و خۆی سەیری دەکا کە چەن ئازایانە شەڕ دەکا بۆیە دەڵێ: دەمەوێ بەدەست بیگرن، خەریك دەبێ دەوری سوڵتان جلال الدین بدەن، بەڵام کە دەزانێ ناتوانێ چیتر بەرەنگاری هێزەکەی جەنگیزخان ببێتەوە خۆی و سەربازەکانی دوا هێرشی زۆر توند دەکەنە سەر پێشەوەی سوپاکەی جەنگیزخان و تۆزێکیان دور دەخەنەوە ئینجا سوڵتان جلال الدین بەسواری ئەسپەوە لە ڕوباری (سند) دەدا و لەگەڵ نزیکەی حەوسەد کەس ڕزگاریان دەبێ و دەگەنە ئەو بەری ڕووبارەکە دواتر هەندێکی تریش لە سەربازەکانی لەڕووبارەکە دەدەن بەهەمویان نزیکەی چوار هەزار کەس ڕزگاریان دەبێ، سوڵتان جلال الدین ئەو ئەسپەی زۆر خۆش ویستوە هەر لەگەڵی بووە تا ماوەیەکی زۆر[1] جەنگیزخان زۆر سەرسام دەبێ بەئازایەتی جلال الدین بۆیە دەڵێ: دەبێ کوڕی وامان هەبێ بتوانێ شوێنی باوکی بگرێتەوە.[2] سوڵتان جلال الدین بەرلەوەی خۆی لەڕووبارەکە بدا هەرچی ئاڵتون (دڕو و مەرجانی گران) بەهای لا بوو هەرهەموی هەڵدایە ناو ڕووبار، جەنگیزخان بەوە دەزانێ و چەند مەلەوان زانێك دەنێرێتە ڕوبارەکە بۆ ئەوەی بگەڕێن بەدوای ئەو ئاڵتون دڕو مەرجانانە، ئەوانەی نەیانتوانی لەڕوبارەکە بدەن هەر هەمویان کەوتنە بەردەستی جەنگیزخان و لەگەردنی هەموانی دا.[3]

---

(١) سيرة سلطان جلال الدين منكبرتي، لاپەڕە ١٦٠.

(٢)تاريخ فاتح العالم للجويني، لاپەڕە ١٥٧.

(٣) تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية، لاپەڕە ٩٧.

سوڵتان جلال الدین و نزیکەی چوار هەزار کەس لەسەربازەکانی ڕزگاریان دەبێ و دەگەنە وڵاتی هیند، حاکمی ویلایەتەکانی هیند وەکو حاکمی (کراتشی و لاهور و دهلی) کە بەهاتنی سوڵتان جلال الدین دەزانن یارمەتی بۆ دەنێرن، بەڵام پێشی ڕادەگەیەنن کە هاتنی تۆ بۆئێرە شتێکی باش نییە و لێرە سەرکەوتو نابی، سوڵتان جلال الدین بەقسەی ئەو حاکمانە دەکاو لە دەوروبەری (سند) دەمێنێتەوە، جەنگیزخان دوو لەسەرکردەکانی خۆی بەناوی (بیلا) و (تورتای) بەدوای، جلال الدین دەنێرێ ئەوانیش لە ڕوباری سند دەپەڕنەوە، بەڵام بەبێ ئەوەی هیچ وەدەست بێنن و دەگەڕێنەوەلای جەنگیزخان و لە بەرنامەی جەنگیزخانیش نەبوو هێرش بکاتە سەر وڵاتی هیند بۆیە ترسی مەغۆلەکان لەو ناوچەیە کەم دەبێتەوە.[(١)] لەساڵی (٦٢٠) جەنگیزخان لەعنەتی خوای لێبێ بڕیار دەدا بگەڕێتەوە (مەنغۆلیا) و دەتوانین بڵێن سنوری ڕوباری (سند) دوا شوێن بوو کە سوپای مەغۆلەکانی پێگەیشت، سەرەتا جەنگیزخان ویستی لەڕێی هیندەوە بگەڕێتەوە مەنغۆلیا، بەڵام کەزانی ڕێگایەکی زۆر سەختە بۆیە هەمان ڕێ گرتە بەر کە پێی هاتبوو هەر بەو ڕێگایەش گەڕایەوە، ساڵی (٦٢١) جەنگیزخان لەڕێ گەڕانەوە دەبێ بۆ (مەنغۆلیا) لەڕێگا دا هەردوو کوڕی کوڕەکانی دەچنە پێشوازی یەکیان بەناوی (کۆبلای) کەتەمەنی یازدە ساڵ بوو لەگەڵ (هۆلاکۆ) کە ئەو کات تەمەنی نۆ ساڵ

(١) الدولة الخوارزمية/ حافظ أحمد حمدي، لاپەڕە ١٩٢.

بوو، بەگەڕانەوەی جەنگیزخان بۆ مەنغۆلیا دەتوانین بڵێین، هێرشی یەکەمی مەغۆلەکان بۆسەر جیهانی ئیسلامی کۆتایی پێدێ، لەساڵی (٦٢٤) جەنگیزخان لەتەمەنی (٧٢) ساڵیدا دەمرێ لەعنەتی خوای لێبێ، مەملەکەتەکەی دابەشی سەر کوڕەکانی دەکا، لەدوای مردنی جەنگیزخان بە شەش مانگ کوڕە گەورەکەی جەنگیزخان (جوجی) دەمرێ هەندێك لەسەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن کێشەیەك هەبوو لەنێوان، جوجی و جەنگیزخانی باوکی وبراکانی تری بۆیە ئەو سەرچاوانە دەڵێن جەنگیزخان دەستی هەبووە لە ژەهر خواردکردنی (جوجی) کە کاریگەریەکەی دوای شەش مانگ دەرکەوت.[1] هەندێکیش لەسەر چاوەکان دەڵێن (جوجی) بەر لەباوکی مردوە و موڵکەکەشی دەدرێتە کوڕەکەی بەناوی (باتو)، [2] بەڵام ئەو بۆ چونە هەڵەیە (والله أعلم) لەبەر ئەوەی زۆربەی سەر چاوەکان باس لەمردنی ئەو کوڕەی دەکەن دوای باوکی[3] دوای مردنی (جەنگیزخان) دوو ساڵی ڕێك کورسی جەنگیزخان بەتاڵ دەمێنێ و دوای ئەو دوو ساڵە بنەماڵەی جەنگیزخان بڕیارڕ دەدەن (ئۆکتای) جەنگیزخان بچێتە شوێن باوکی و ببێ بە (خانی) گەورە، ئەوەی لێرە جێی ئەسەفە لەساڵی (٦٢٤-٦٢٦) مەغۆلەکان بەمردنی جەنگیزخان و دانانی جێگرەکەی خەریك دەبن، کەچی خیلافەتی ئیسلامی لەبەغدا لەو غەفڵەتەیان بەئاگا نەهاتونەتەوە،

---

(١) تاريخ المغول، لاپەڕە ١٣٠.

(٢) الدولة الخوارزميه والمغول، لاپەڕە ١٩٤.

(٣) المغول فى التاريخ فؤاد عبدالمعطى الصياد.

خەلـیفە هەر خەریکـی ڕابـواردن و خۆشـگوزەرانی خـۆیەتی و سـوڵتان و حاکمەکانیش بە دووبەرکی نێو خۆییدا خەریك بووینە، هەربۆنمونە وێنەیەك لە وێنەکانی ئەو غەفڵەتەی ئەو ئوممەتە تێی کەوتبوو: مەعلومە دوای وەفـاتی (صـلاح الـدین)ی ئەییـوبی ڕەزاو ڕەحمەتـی خـوای گەورەی لەسـەربێ کوڕەکـانی نـاتوانن وڵات بەڕێـوە بـبەن و حـوکم دەکەوێـتە دەست براکەی (الملك عادل سیف الدین احمد کوڕی ایوب کوڕی شادی) ناسراوە بە (الملك عادل) مەلیك عادل یش بەر لەمردنی سنوری دەسەڵاتی دابەش دەکاتە سەر کوڕەکانی، میسرتەسلیم بە (الملك الکامـل) دەکات و وڵاتـی شـامیش بەسـەر هەردوو کـوڕەکەی تـری دابەش دەکـات، (المعظـم) و (الاشـرف) دواتـر مەلیـك ئەشـرەف دەبێـتە خـاوەنی (خـیلات)، ئینجا ئەو کوڕانەش دوای باوکیان ئیختلاف و کێشەی زۆریان دەکەوێتە نێوان لەساڵی (٦٢٤) نێـوان هەرسـێ بـرا بەتەواوی تێـك دەچـێ، مەلیـك کامـل ترسـی ئەوەی پێدەگا کە براکەی (المعظم) پەیوەندی بە سوڵتان جلال الدین بکاو شام تەسلیم بەخەواریزمەکان بکات، بۆیە وەفدێك دەنێرێ بۆ ئیمپراتۆری سەڵیبییەکان و پێـی دەڵـێ ئامـادەم چەنـد ناوچەیەکـت لە قەڕاغـی شـام تەسلیم بکەم، ئەو هەنگاوەی تەنها بۆ ئەوە بووە کە براکەی سەرقاڵی ئەو هێزە بێت و شام تەسلیم بە جلال الدینی خەواریزم شاە نەکات، هێزەکانی سـەلیبی دەگەنە نـاوچەی قەراغ ئینجـا ئەوەی زۆر سـەیرە ئیمپراتـۆڕ نـامەیەك دەنێـرێ بـۆ (مەلیـك عـادل) و پێـی دەڵـێ: دەبـوایە موسـڵمانان

کێشەی خۆیان بەخۆیان چارەسەر بکەن نەك پەنا بۆ من بێنن ئێستا ئەوە هاتووم بەناچاری ناوچەی (صەیدا) تەسلیم بە سەڵیبییەکان دەکرێ و لەوێ دەمێننەوە، ئەوە حاڵی شام ومیسرِ ئاوایە بەدەست حاکمەکانیان لەو کاتەی خۆرهەڵاتی ئیسلامی هەرهەموی کەوتۆتە دەست مەغۆلەکان کەچی ململانێی نێوان دوو برا دەگاتە ئەو ئاستەی کە هانا بۆ هێزێکی سەلیبی ببەن.[1] ئینجا ئیمراتۆرِ بەوەندەش نەوەستا، بەڵکو لەساڵی (٦٢٦) مەلیك کامیل قودس تەسلیم بەئیمپراتۆر (فریدریك) دەکات بەپێی پەیمانێك لەنێوان هەردولا واژۆ دەکری، بەڵێ مزگەوتەکە لەدەست موسڵمانان بوو و شاری (قودس)یش بەتەواوی کاولکرابوو واتە ئیمراتۆر، شارێکی کاوڵکراوی کەوتە دەست مزگەوتەکەش لەلایەن موسڵمانان سەرپەرشتی دەکرا، بەڵام ئەو پەیمانە بۆ ئیمراتۆر، سەرکەوتنێکی گەورە بوو بەدەستی هێناو لە ئەوروپا بڵاو بوویەوە کە قودس کەوتەوە دەست سەڵیبییەکان.[2] لەگەرمەی ئەو هەموو ڕوداوانە خەلیفە لە بەغدا هیچ ڕۆڵێکی نییە، بەڵکو خەریکی زیاتر خۆ قایم کردنی کورسی خیلافەتە.

---

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك المقريزی، ج ١ لاپەڕە٣٤٥.

(٢) الكامل فی التاريخ، ج ٩ لاپەڕە ٧٨٢.

## سوڵتان جەلالەدین دەگاتە (کرمان) لەساڵی (٦١٩)

دوای شەڕی (سند) سوڵتان جلالەدین و ئەو سوپایەی پێکی هینابوو، (هیند) بەجێدەهێڵن بەرەو ناوچەی (کرمان) دەکەونە ڕێ کەدەکەوێتە باشوری ئیستای ئێران، ڕیگاکە زۆر سەخت بووە تا دەگەنە (کرمان) تەنها چوار هەزار کەس ڕزگاریان دەبێ، حاکمی ئەو کاتی (کرمان) کەسێك بوو بەناوی (براق الحاجب) دوای مانەوەیەکی کەم لە (کرمان) بەرەو ناوچەی (شیراز) دەکەوێتەڕێ، حاکمی شیراز ناوی (الاتابك سعد) ئەو حاکمە کوڕەکەی خۆی دەنێرێتە لای سوڵتان جلال الدین و دەچێتە ژێر فەرمانی سوڵتان، ئەوە لەکاتێك ناوچەکانی شیرازو ڕەیی و عیراقی عەجەم، لەژێر دەسەڵاتی سوڵتان غیاث الدینی برای سوڵتان جلالەدینە، سوڵتان (غیاث الدین) کە هەواڵی ئەوەی پێدەگا سوڵتان جلال الدین ی برای گەڕاوەتەوە سوپایەکی (٣٠)هەزار کەسی ئامادە دەکا بۆئەوەی ڕێ لە جلال الدین برای بگرێ، بەڵام زۆربەی سەرکردە سەربازییەکان متمانەیان بە سوڵتان جلال الدین هەبوو بۆیە ڕیزی سوڵتان غیاث الدین بەجێدەهێڵن و دەچنە ڕێز سوپاکەی سوڵتان جلال الدین، (غیاث الدین) بەناچاری ئەو ناوچانە بەجێدە هێڵێ، لەڕوو سوپاکەی (جلال الدین)ی برای ڕادەکا، ئینجا سوڵتان جلال الدین نوێنەر دەنێرێ و بەڵێن بەبراکەی دەدەن کە بگەڕێتەوە و ڕۆحی پارێزراوە، ئەوە بوو (غیاث الدین) دەگەڕێتەوە لای سوڵتان ولەناوچەی (ئەلرِەی )دەمێنێتەوە لەکۆشکێك ژیان بەسەر دەبا، تاوەکو

جارێکیان سەرخۆش دەبێ و کەسێکی نزیکی سوڵتان جلال الدین دەکوژێ، ئینجا لەترسی سوڵتان (جلال الدین) ناوچەکە بەجێدەهێڵێ و لەگەڵ دایکی دەچنە ناوچەی (کرمان) واتە سوڵتان غیاث الدین لەگەڵ سوڵتان جلال الدین دایکیان جیاوازە، کەدەگەنە کرمان وماوەیەك لەوێ دەمێننەوە، تا ساڵی (٦٢٥) ئەو کاتەی (براق الحاجب) حاکمی کرمان غیاث الدین و دایکی دەکوژێ و پەیوەندی بەمەغۆلەکان دەکاو بنەماڵەی (براق الحاجب) بەرەزامەندی مەغۆلەکان لەسەر حوکمی (کرمان) دەمێننەوە، [(١)] لەساڵی (٦١٩-٦٢١) سوڵتان جلال الدین خەریکی ڕێکخستنەوەی سوپاکەی دەبێ، بەتایبەت ئەو کاتەی دەچێتە خوزستان کە ئێستا لەوڵاتی ئێرانە و بەو شارە دەگوترێ (عربستان) عبادان و ئەهواز و دیزفول ی لێنزیکەو نزیکە لە کەنداوی فارس، سوڵتان جلال الدین لەشاری (شوشتر) نزیك دەبێتەوە و گەمارۆی ئەو شارە دەدا، حاکمی ئەو شارە کەسێکە بە ناوی (مظفرالدین وجە السبع) کە لەلایەن خەلیفەی عەبباسییەوە کراوەتە حاکمی ئەو شارە، شاری (شوشتر) بەڕوی سوپاکەی جلال الدین خەواریزم شاە دەوەستێ نزیکەی دوو مانگ گەمارۆ دەدری، بەڵام خەواریزم شاە ناتوانێ ئەو شارە بگرێ، ئینجا سوپاکەی جلال الدن خەواریزم شاە دەگەنە دەوروبەری شاری (بەصرە)و تالانی دەورو بەرو هەندێکی ئەو شارە دەکەن دواتر سوپایەك لە

---

(١)کتێبی تاريخ المغول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية عباس اقبال، لاپەڕە ١٤٢.

خەڵکی شاری (بەصرە) خەواریزمییەکان دەشکێنن[1] سوڵتان جلال الدین نیازی گرتنی بەغدای دەبێ، پێی وابوو خەلیفەی عەبباسی ڕۆڵێکی زۆر سلبی گێڕاوە لەو ڕووداوانە، بۆیە لەپڕ فەرمان دەدا کەبەرەو بەغدا بکەونە ڕێ، خەلیفە لەبەغداوە سوپایەك دەنێرێ بۆئەوەی بەری سوپاکەی سوڵتان جلال الدین بگرێ، سوپاکەی خەلیفە نزیکەی بیست هەزار کەس دەبوون و بەسەرپەرشتی کەسێك بەناوی (جمال الدین قشتمر) لەهەمان کاتدا خەلیفە نامەیەك دەنێری بۆ حاکمی هەولێر (سوڵتان مزەفەر) داوای لێدەکات سوپایەکی دە هەزار کەسی ئامادە بکات و بتوانێ ڕێ لە سوپاکەی جلال الدین خەواریزم شاە بگرێ[2] لەیەکێك لە ڕووبەروو بونەوەی سوپای خەواریزم شاوو سوپاکەی خەلیفە، سەرکردەی سوپاکەی خەلیفە (جمال الدین قشتمر) دەکوژرێ، ئینجا سوپای خەواریزمییەکان دەگەنە دەورو بەری شاری بەغدا، خەلیفە بەغدای قایم کردبوو، جلال الدین کە زانی گرتنی بەغدا شتێکی ئاسان نییە، بەناچاری کەوتە دانوساندن لەگەڵ خەلیفە و بڕیاری دا لە بەغدا بکشێتەوە، بەڵام خەواریزمییەکان گەیشتبونە شاری بەعقوبەو لەوێوەش بۆ داقوق، لێرە زۆر گرنگە ئاماژە بەچەند خاڵێك بکەین.

---

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٣٨٩)

(٢) الدولة الخوارزمية والمغول / حافظ وهبة، لاپەڕە ٢٠٦.

## یەکەم: تاوانە گەورەکەی سوڵتان جلال الدین بەکاوڵکردنی شاری (داقوق).

ئەو کاتەی خەواریزمییەکان شاری داقوقیان گەمارۆدابوو خەڵکەکە لەسەربان و شورەی شارەکەوە بەرەنگاری هێزەکانی جلال الدین خەواریزم شاه بوونەوە و لەو دیوی دیوارەکانەوە جنێوێیان بە خەواریزم شاهو سوپاکەی دەدا، بۆیە خەواریزم شاه ڕقێکی زۆری لەسەر خەڵکی ئەو شارە هەڵسا، لەمانگی ڕەبیعی یەکەمی ساڵی (٦٢٢) کۆچی، هێزەکانی خەواریزم شاه، سەرەتا شاری داقوقیان گەمارۆدا، دواتر توانیان بچنە شارەکەو گەورەترین تاوانیان ئەنجام دا، زۆربەی زۆری خەڵکی ئەوشارەیان کوشت، ماڵەکانییشیان تالانکرد و ئافرەتەکانیشیان بەکەنیزە گرت، دەستدرێژی کرایە سەر هەزاران ئافرەتی ئەو شارە پیرومناڵ و پەککەوتەی ئەو شارەیان کوشت و دواتر سوتاندیان، دیواری شارەکەشیان بەتەواوی ڕوخاند و داقوقیان کاوڵکرد، ئەوەی سوپاکەی جلال الدین بە شاری داقوقی کرد مەگەر مەغۆلەکانیش هەر ئەوەندەیان کردبێ، ئینجا ئیمام (سبط ابن الجوزي) خاوەنی کتێبی (مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٢٧٣) دەربارەی ئەورووداوە دەفەرمێ: السنة الثانية والعشرون وست مئة في ربيع الاول وصل خوارزم شاه جلال الدين الى دقوقا، ففتحها عنوة، واوقع السيف في أهلها، ونهب أموالهم وسبى حريمهم، وهتك نساءهم، وأحرق البلد، وهدم سوره وكانوا قد عصوا عليه وسبوه من الاسوار.

لەدوای ئەوە دەفەرمێ: موعەزەم (المعظم عیسی کوڕی أحمد کوڕی أیوب) کەدەکا برازای (صلاح الدین ئەییوبی) ئەو کات حاکمی دیمەشق بوو بۆی گێرامەوە، خەواریزم شاە بۆی نوسیم : وەرە با پێکەوە لەگەڵ ئەوانەی خاوەن پەیمانن لەگەڵ من کۆببینەوەو، هێرش بکەینە سەر خەلیفە لە بەغدا، لەبەر ئەوەی خەلیفە هۆکاری ئەو کارەساتە بوو کە بەسەر بنەماڵەی ئێمە داهات، خەلیفە بوو نامەی بۆ کافرەکان نوسیبوو کە هێرش بکەنە سەر مەملەکەتی ئێمە، نامەکانی خەلیفە بە واژۆی خۆی لەبەر دەستی ئێمەیە، (موعەزەم) یش وەڵامی نامەکەی دەداتەوەو بۆ خەواریزم شاە دەنوسێ: أنا معك على كلِّ أحدٍ الا على الخليفة، فانه امام المسلمين. من لەگەڵتم لەسەر هەموو کەسێك جگە لەخەلیفە لەبەر ئەوەی خەلیفە ئیمامی موسڵمانانە، ئەوە هەڵوێستی مەلیك (موعەزەم) بووە کە لە بنەماڵەی ئەییوبییەکانە و کوردە، کە بەداخەوە نە دکتۆر (علی الصلابی) لەکتێبەکەی وە نە (راغب السرجانی) هیچ ئاماژە بەو هەڵوێستە جوانانەی ئەو بنەماڵەیە ناکەن، هیچ ئاماژەش بە تاوانی خەواریزم شاە ناکەن کە چۆن شاری داقوقی کاولکردو ئافرەتی موسڵمانی بەجاریە و کەنیزەگرتوە، بۆیە (أبو المحاسن جمال الدین یوسف کوڕی تەغری بەردی ئەتابکی) لەکتیبەکەی (النجوم الزاهرة) بەرگی ٦ لاپەڕە ٢٦١ دەڵێ: فی شهر ربيع الاول وصل السلطان جلال الدين بن خوارزم شاه الى دقوقا فافتحها بالسيف، وأحرق البلد ونهب أهلها، وفعل فيها مالا تفعله الكفار لكونهم

شتموه ولعنوه على الاسوار) شارەکەی کاوڵکرد و سوتاندی و سەروماڵی ئەو خەڵکەی تاڵانکرد و کارێکی بەخەڵکی ئەو شارە کرد کافرەکان پێیان نەکردبێ، تەنها لەبەر ئەوەی خەڵکی شارەکە لەکاتی گەمارۆدانەکەی جنێویان بە سوڵتان جلال الدين خوارزم دابوو، هەروەها لەکتێبی (شذرات الذهب) بەرگی ٧ لاپەڕە ١٧١ کەباسی ڕووداوەکانی ساڵی (٦٢٢) کۆچی دەکات دەفەرمێ: فبذل السيف في دقوقا وفعل ما لاتفعله الكفرة واحرق دقوقا. کارێکی بەو شارەکرد کافرەکان ئەو جۆرە کارە ئەنجام نادەن .

دووەم: عەبباس اقبال لەکتێبەکەی (تاريخ المغول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية) لاپەڕە ١٤٣. دەڵێ: شاری (شوشتر) دەکەوێتە دەست سوڵتان خەواریزم شاە و دواتر سوپاکەی حاکمی هەولێریش دەشکێنێ و حاكمي هەولێر (مظفر) دیل دەکرێ لەلایەن سوپاکەی جلال الدين خەواریزم شاە، دواتر سوڵتان جەلالەدین ئازادی دەکات، دیلکردنی سوڵتان مزەفەری حاکمی هەولێر لەلایەن خەواریزمییەکان لە هیچ سەرچاوەیەك نەهاتوە، بگرە هەتا شاری (شوشتر)یش نەکەوتە بەردەستی خەواریزمییەکان هەروەکو لەسەرچاوەکان ئاماژەی پێکراوە دوای بەرەنگاربونەوەی شارەکەو نزیکەی ٢ مانگی ڕەبەق گەمارۆدرا دواتر خەواریزمییەکان شارەکەیان بەجێهێشت بەرەو بەعقوبە کەوتنە ڕێ، ئینجا عەبباس ئیقبال ئەسەف دەکێشێ و دەڵێ: ... الا انه بدلا من ان يخلص بغداد من سطوة الخليفة الحقود ويثأر للكوارث التي حاقت بجده و ابيه على يديه، مضى الى دقوقا

وحاصرها واستولى عليها .

خەواریـزم شـاه لە بـری ئەوەی بەغـدا ڕزگـار بکـا لە سـتەمی خەلـیفە و تـۆڵەی ئەو هەمـوو دەردەسـەریەی لێبەسـەنێتەوە کە خەلـیفە بەسـەر بـاوك و باپیری خەواریزم شای هێنابوو کەچی ڕووی کردە داقوق ئەوێی داگیرکرد، پـێم وایە (عبـاس اقبـال) بەنەفەسـێکی شـیعی قسـەی لەسـەر ڕووداوە مێژووییەکـان کـردوە، بـۆیە ئەسـەف لەوە دەکێشـێ کە چۆن سوڵتان خوارزم شـاری بەغـدای نەگرتـوەو تـۆڵەی لە خەلـیفە نەسـەندۆتەوە لەبەر ئەوەی دەیزانـی ئەگەر خـوارزم شـاە بەغـدای بگرتبـا خـیلافەی ئیسلامیشـی دەگـۆڕی و لە بنەمـاڵەی عەبباسـییەکانی دەسـەندەوەو دەیـدایە دەسـت عەلەوییەکان.

سـێیەم: ئەو تاوانـانەی خەواریـزم شـاە و سـوپاکەی ئەنجامیـان دا دواتـر دەبێـتە هـۆی ئەوەی، کەسـی بەدەور نەمێنـێ و هەرهەمـوو سـوڵتان و پادشاکانی ناوچەکە ببن بەدوژمنی و لەکـاتی تەنگـانە بەهانـایەوە نەچن و بەشداری هیچ پەیمانێك نەکەن لەگەڵ خەواریزم شاە، لەبەر ئەوەی جگە لە خـۆی کە کەسـێکی خوانەنـاس و سـتەمکار بـوو زۆربەی سـەرکردەکانی سوپاکەشی هەر لەو بنەمـاڵەیە بـوون کە بـوونە هۆکـاری ڕوخـانی دەوڵەتـی خەواریزمی هەر لەکوشتنی بازرگـانە مەغۆلەکـانەوە تـاوەکو کوشـتنی جلال الـدین خەواریـزم شـاە، جـالێرە زۆرم پـێ سـەیرە (محمـد علـی الصـلابی) لەکتێبی (دولة المغول والتتار بين الانتشار والانكسار) لەلاپەڕە ١٤٤ دەڵێ:

(...سرعان مابادر هذا الاخير (مەبەستی خواریزم شایە) رغم الخلاف الى مكاتبة الخليفة مستنصر بالله والملك الاشرف الايوبي صاحب ديمشق والجزيرة والسلطان علاء الدين كيقباذ سلطان سلاجقة الروم وغيرهم من امراء المسلمين، حكام ميافارقين وماردين وامد استنجد بهم كي يرسلوا اليه جيوشا من عندهم تعاونه على مجابهة هذا الخطر الذي يتهدد المسلمين جميعا فاحجم هؤلاء كلهم عن مناصرته) واتە سەرەڕای ئەو هەموو دووبەرەکییە، سوڵتان جلال الدین خەواریزم شاە ناردی بەدوای خەلیفە و زۆربەی مەلیك و پادشاکان بۆئەوەی سوپای بۆ بنێرن و ڕووبەڕوی ئەو هەڕەشە گەورەییە ببنەوە، مەغۆلەکان کە هەڕەشەن بۆسەر تەواوی موسڵمانان کەچی هەر هەموویان پشتیان لێکرد و هیچ پشتیوانیێکیان نەکرد، محمد علی الصلابی ئەو دەقەی لەکتێبی (الاتراك الخوارزمیون) نەقل کردوە کەنوسەرەکەی ناوی د. صبری سلیم لە کۆلێژی (دار العلوم)ی قاهیرە سەر بەزانکۆی (عین الشمس)ە، ئەو دکتۆرەش دەڵێ لەدوو سەرچاوەم نەقڵکردوە یەکیان تاریخ الجوینی بەرگی ٢ لاپەڕە ٨٦ سەرچاوەکەی تر نهایة الأرب ج ٢٧ لاپەڕە ٢٩٤. بەگەڕانەوە بۆ سەر ئەو دوو سەرچاوەیە، هیچ لەو سەرچاوانە وایان باس نەکردوە وەکو ئەوەی خاوەنی کتێبی (الاتراك الخوارزمیون) نەقلی کردوە، ئەوەش دیسان لەگەڵ ئەمانەتی زانستی جوت نایەتەوە چۆن دەکرێ، بابەتێك نەقڵ کەی لە سەرچاوەیەك کە ئەو سەر چاوەیە بەوشێوەیە باسی نەکردوە، بەڵی

سەرچاوەکان باس لەنامەکەی جلال الدین خەواریزم شاە دەکەن بۆ (الملك الافضل) ناردوە و داوای لێکردوە، هاوپەیمانی بێ بۆلێدانی خەلیفە لەبەغدا، (الملك الافضل) وەڵامی دەداتەوە کە ئەو ئامادەی هەموو یارمەتی یێکە، بەڵام نەك دژ بەخیلافەتی ئیسلامی و لەبەر ئەوەی خەلیفە لای ئەو ئیمامی موسڵمانانەو ناکرێ خیانەتی لێبکرێ، کە ئەوەش هەڵوێستێکی دلێرانەیە و سەروەرێکی گەورەیە مێژوو بۆ مەلیك ئەفزەڵی تۆمارکردوە، ئینجا جارێکی تریش جلال الدین داوای یارمەتی لە سلجوقە ڕۆمییەکان و مەلیك و پادشاکانی شام کرد، بەڵام نەك بۆشەڕی مەغۆل، بەڵکو بۆ شەڕی (کورجەکان) کە دەکاتە وڵاتی (ئازەربایجان وجۆرجیا)ی ئێستا لەبەرئەوەی خەڵکی ئەو ناوچانە زۆربەیان نەسڕانی بوون و زانیان سوڵتان جلال الدین سەرقاڵی شەڕی خیلافەیە و هەوڵی گرتنی بەغدا دەدا بۆیە ئەوان هێرشیان کردە سەر سنوری دەوڵەتی خەواریزمییەکان، سەرکردەکانی سوپای خەواریزم هەواڵیان بۆ سوڵتان جلال الدین خەواریزم شاە نارد، کە ئەگەر زوو نەگەیتە ناو چەکەمان ئەوا (کورجەکان)ناوچەیەکی زۆری دەسەڵاتی دەوڵەتی خەواریزم داگیر دەکەن بەتایبەتی مازەندەران و دەوروبەری تا دەگاتە تەبریزو مەڕاغە، ئینجا پێیان گوت کە (بەغدا) هەردەمێنێ، دەتوانی دوای شکاندنی (کورجەکان) بەرەو بەغدا بگەڕێتەوە، بۆیە (جلال الدین خەواریزم شاە) بەناچاری دوای کاوڵکردنی داقوق بەرەو شەڕی (کورج) کەوتە ڕێ کە دەکاتە (ئازەربایجان

و جۆرجیـــا)ی ئێســـتا، دوای شـــەڕێکی زۆر گەورە تـــوانی ســـوپای (کورجەکان) بشکێنێ و (تەفلیس) داگیر بکات، کە پایتەختی ئەو کاتی کورجەکـان بـوو.[1] سـوڵتان جـلال الـدین تـوانی سـەرکەوتنێکی زۆر گەورە بەدەسـت بێنـێ، یەکێـك لەهۆکارەکـانی کێشـە ناوخۆییەکـانی ئازەربایجـان، بێئاگـــایی حـــاکمی ئەو نـــاوچەیە بـــوو لە سیاســـەت و پاراســـتنی مەملەکەتەکەی، حاکمی (ئازەربایجانی خۆرئاوا) ئەو کات ناوی (ئەتابك ئوزبەك کوڕی بەهلەوان) بوو، کەسێکی بەتەمەن، سەرچاوەکان دەڵێن زیـاتر خەریکـی خـواردنەوەی مەی و ڕابـواردن بـوو، ئاگـای لەبەڕێـوبردنی ئەو ئیقلیمە نەمـابوو، خێزانەکەی کارەکـانی ڕاپەدەپەڕاند کە کچی (طغرل)ی سـەلجوقی بـوو، طغـرل دوا سـوڵتانی دەوڵەتـی سـەلجوقییەکانە، کە لەسـاڵی (٥٩٠) کوژرا، ئینجا ئازەربایجان و جۆرجیا خەڵکەکەی زۆربەی نەسڕانی بـوون و زۆر جـار هێرشـەکانیان دەگەیشـتە سـنوری نـاوچەی (مـراغە) و هەڕەشەیەکی بەردەوام بوون لەسەر موسوڵمانەکانی ئەو نـاوچەیە، بەگرتنـی (تەفلـیس) تـا ڕادەیەك هەڕەشـەی نەسڕانییەکان لەسـەر ئەو نـاوچەیە کەم بوویەوە.[2] کەوابوو هەم (محمد علی الصلابی) و خاوەنی کتێبی الاتـراك الخوارزمیـون بەهەڵە باسـی ئەو بابەتەیـان کـردوە، ستایشـێکی بەنـاهەقی سـوڵتان جـلال الـدین یـان کـردوە، سـوڵتان جـلال الـدین داوای یـارمەتی لە

---

(١) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٢٧٣) تاريخ المغول، لاپەڕە ١٤٤.

(٢)الدولة الخوارزميه والمغول حافظ أحمد حمدي، لاپەڕە ٢١١.

(مەلیك ئەشرەفی ئەییوبی کە حاکمی دیمەشق و جەزیرە بوو هەروەها (کی قباذ) سوڵتانی سەلجوقییە ڕۆمییەکان بوو وە حاکمی میا فارقین و ماردین و ئامەد) کردوە، بەڵام داوای یارمەتی لێکردوون بۆ ئەوەی پشتگیری بکەن لەشەڕی (ئازەربایجان و جۆرجیا) بۆئەوەی دەستی بەتاڵ بێ و بگەڕێتەوە بەغدا، هەر لەبەر ئەوەش بوو هیچ لەو پادشایانەی باسمان کردن ئامادەی ئەوە نەبوون یارمەتی سوڵتان جلال الدین بدەن.

گرتنی تەفلیس لەساڵی (٦٢٣) کۆچی بوو، ساڵێ (٦٢٤) سوڵتان جلال الدین لەناوچەی ئازەربایجان و تەبریزو مراغەو دەورو بەری دەمێنێتەوە تاساڵی (٦٢٥) لەو ساڵە هەواڵی ئەوەی پێدەگا کە هێزێکی گەورەی مەغۆلەکان بەسەر پەرشتی پێنج سەرکردەی گەوریی مەغۆل بەڕێ کەوتونە بەرەو عێراق، سوڵتان لە تەورێزەوە بەرەو عێراق کەوتە ڕێ و نزیکەی چوار هەزار سەربازی لە نێوان (ڕەی) و (دامغان) بەجێهێشت بۆ ئەوەی ئاگاداری کەنەوەی لە لەشکرکێشی مەغۆلەکان، خۆشی لەگەڵ زۆرێك لەسەرکردەکانی لە ناوچەی (ئەصفەهان) جێگیر دەبێ، هێزەکەی مەغۆل دەگەنە دەورو بەری دێیەك لە دێیەکانی (ئەصفەهان) جلال الدین خەواریزم دانیشتنێکی لەگەڵ سەرکردەکانی سوپاکەی کرد و بەکۆمەڵ بەیعەتیان لەسەر مردن دا و گوتیان بەهێچ جۆرێك و هیچ کەس نابێ و بۆی نییە گۆڕەپانی جەنگ بەجێبهێڵێ، سوڵتان جەلالەدین داوای یارمەتی لە قازی ئەسفەهان کرد، کە داوا لەو خەڵکە بکا با خۆبەخشانە

بێن بۆ شەڕی مەغۆل، هەندێ ئەستێرە ناس (فالْچی) لە شارەکە بوون داوایان لە سولْتان جلال الدین کرد کە سێ ڕۆژ ڕوو بە ڕوو بونەوەی لەگەلْ مەغۆل دوا بخا لەبەر ئەوەی بەپێی زانیاری ئەوان وا چاکە دوای ئەو سێ ڕۆژە شەڕ لەگەلْ مەغۆلەکان بکرێ، ئینجا هەر ئەو ئەستێرە ناسانە لەڕۆژی چوارەم کاتێکیان بۆ سولْتان دیاری کردو گوتیان لەو کاتە ڕوو بەڕووی مەغۆلەکان ببنەوە، سبحان الله ئەوەی سەیرە بزانن لەو کات خوڕافە تا چەند زالْ بووە بەسەر عەقلْیەتی سەرکردەو خەلْکی ئەو سەردەمە، لەسەر دەمی خەلیفەی عەبباسی (موعتەسیم) ئەو کاتەی ویستی بۆ شەڕی (عەموریە) بکەوێتە ڕێ، هەندێك لەو فالْچی و ئەستێرە ناسانە گوتیان بەپێی زانیاری ئێمە کاتێکی خراپەو مەڕۆ بۆ ئەو شەڕە، ئینجا (ابو تمام) شاعیر کە ئەوەی بیست ڕووی کردە موعتەسیم لە هۆنراوەیەکی زۆرکاریگەردا پێی گوت، هەوالْی شمشێر ڕاسترە لەهەوالْی ئەو فالْچیانە.

السيف اصدق انباء من الكتب  في حده الحد بين الجد واللعب

بيض الصفائح لاسودو الصحائف  في متونهن جلاء الشك والريب

والعلم في شهب الارماح لامعة  بين الخميسين لا في السبعة الشهب

ئەوە بوو خەلیفەی عەبباسی (موعتەسیم) بەرەو (عەموریە) کەوتە ڕێی و لەشەڕەکەش سەرکەوت و توانی شاری عەموریە فەتح بکا، بەهەر حالْ جلال الدین خەواریزم بەقسەی ئەو (فالْچی و ئەستێرەناسانە) سێ ڕۆژ

شەڕەکەی تاخیر کرد، لەڕۆژی چوارەم لەو کاتەی کە (فاڵچییەکان) دیارییان کردبوو دەستی بەشەڕی مەغۆلەکان کرد، مەغۆلەکان کەتیبەیەکی گەورەیان ڕەوانەی ناوچەی (لوڕستان)کرد بۆ ئەوەی ئازوقەیان بۆ کۆبکەنەوەو لەبەرئەوەی دەیانزانی گەمارۆدانی شاری (ئەصفەهان) کاتێکی زۆری دەوێ، بەڵام سوڵتان جلال الدین هێزێکی نزیکەی سێ هەزار کەسی بەدوای ئەو کەتیبەیە نارد و توانیان لەماوەیەکی کەم ئەو هێزەی مەغۆل تێکبشکێنن و زۆریان لێدیل کردو هێنایانە ئەصفەهان و لەوێ لەگەردەنیان درا، لە ٢٢ مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٢٥) کۆچی، سوڵتان جلالەدین هێزەکەی کردە سێ بەش، بەشی ڕاستی سوپاکەی تەسلیم بەبرایەکەی کرد (غیاث الدین) خۆشی لە ناوەڕاستی سوپاکە بوو، چەپی سوپاکەشی تەسلیم بەسەرکردەیەکی ترکرد، هەر لەسەرەتای شەڕەکەوە براکەی سوڵتان جلال الدین (غیاث الدین) گۆڕەپانی جەنگی جێهێشت و خۆی و چەند کەسێکی دەوروبەری ڕایان کرد، سوڵتان جلال الدین کەبەوەی زانی خۆی گەیاندە لای ڕاستی سوپاکەو شەڕێکی زۆر گەورە لەنێوان موسڵمانان و مەغۆلەکان ڕوویدا موسڵمانەکان توانیان لای چەپی سوپای مەغۆلەکان بشکێنن و پاشەکشەیان پێکردن تا گەیشتنە ناوچەی (کاشان) سوڵتان جلال الدین دەگەڕێتەوە ناوەڕاستی سوپاکە، لەو کاتە چەپی سوپای موسڵمانان بەدەستی مەغۆلەکان دەشکێ دواتر بەشی دەستە ڕاستی سوپای

موسڵمانان ئەویش دەشکێ سوڵتان جلال الدین خۆی وچەند سەرکردەیەك لە ناوەڕاستی سوپاکە دەمێنن و ئاگایان لە ڕاست و چەپی سوپاکەیان نامێنێ، زۆرێك لەسەرکردەکانی سوپای جلال الدین شەهید دەکرێن، خەڵکێکی زۆریش ڕادەکەن بەرەو ناوچەی (فارس) و (کرمان) هەندێکیشیان ڕوو لەئازەربایجان دەکەن، بەڵام لەبەر ئەوەی سوپاکەی مەغۆل زۆر ماندوو شەکەت بوون و زۆریشیان لێکوژاربوو بەبێ ئەوەی دەستکەوتی گەورە بەدەستبێنن گەڕانەوە، ناوچەی ئەودیوی ڕووبار، خەڵکی ئەصفەهانیش لە حاڵەتێکی زۆر ناخۆش دەژیان لایان ڕوون نەبوو سوڵتان چی بەسەر هاتوە و دواڕۆژی شارەکەیان بەرەو کوێ دەڕوات، دوای نزیکەی هەشت ڕۆژ سوڵتان جەلالەدین دەگەڕێتەوە شاری (ئەصفەهان) و ئینجا دیسان خەریکی ڕێك خستنەوەی سوپاکەی دەبێ، لەو کاتەش هەواڵی ئەوەی پێدەگا کە (کورجەکان) واتە خەڵکی جۆرجیا لەدەوری سەرکردەیەکیان کۆبونەتەوە بەناوی (ئیڤان) سوڵتان جلال الدین بەناچاری ئەو جارەی بۆ شەڕی جۆرجییەکان دەکەوێتە ڕێ و لەشەڕێکی گەورە دەتوانێ سوپای جۆرجییەکان بشکێنێ و (ئیڤان)ی سەرکردەو هەرسێ کوڕی بکوژێ، ئەو حاڵەتە نزیکەی دوو ساڵ دەخایەنێ، (سوڵتان جلال الدین) لەوناوچەیە هەرجارەو بەشەڕێکی لاوەکی خەریك دەبێ تا دەگاتە ساڵی (٦٢٧) کە دوای کوشتارێکی زۆر (خیلات) داگیر و کاوڵدەکا.[١]

---

(١) تاريخ المغول منذ حملة جنكيزخان حتى قيام الدولة التيمورية عباس اقبال، لاپەڕە ١٥٥.

# گرتنی (خیلاط) لەساڵی (٦٢٧)کۆچی (*)

لەساڵی (٦٢٣) تاوەکو ساڵی (٦٢٧)چەند ڕووداوێکی جۆراو جۆر لەژیانی جلال الدین منکبرتی ڕوویدا گرنگترینیان گرتنی جۆرجیاو ئازەربایجان لە باکور و ناوچەی فارس و کرمان لەباشور، لەو ماوەیە سوڵتان جلال الدین هەوڵێکی زۆری دا بوونی خۆی دیسان وەکو تاکە سوڵتان لەناوچەکە بسەلمێنێ، لەهەمووش گرنگتر ئەوەبوو کەبەڵێ ڕاستە کەسێکی ئازاو بەتوانا بوو، بەڵام ڕۆژ بەڕۆژ دوژمنی زیاتری بۆ خۆی پەیدا دەکرد، ئەوە لەکاتێك هەڕەشەی مەغۆلەکانی هەر لەسەر مابوو، واتە ترسی ئەوە هەبوو کە مەغۆلەکان بۆ جارێکی تر هێرش بکەنەوە سەر جیهانی ئیسلامی، سوڵتان جلال الدین لەبری ئەوەی هەوڵی ڕێکخستنەوەی ڕیزی موسڵمانان بدات و پەیوەندییەکانی لەگەڵ خەلیفە چاکبکاتەوەو داوای یارمەتی بکا لە جیهانی ئیسلامی بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی مەغۆلەکان، لەبری ئەوە هەرجارەو تاوانێکی گەورەی ئەنجام دەداو چەند سوڵتان و مەلیکێکی تری ناوچەکەی دەکردە دوژمنی خۆی، یەکێك لەو تاوانەی ئەنجامی دا گرتنی شاری (خیلات) بوو، خیلات یان ئەخلات لەسەر دەریاچەی

---

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١١ .

(وان)ی تورکیە و دەکەوێتە خۆرئاوای ئەو دەریاچەیە و نزیکە لەسنوری جۆرجیاو ئەرمینیا و ئازەر بایجان، کاتی خۆشی سەر بەئقلیمی (ئەرمینیا)ی ئیسلامی هەژمار دەکرا، [1] ناسینی شوێنی ئەو شارانە بەپێی جوگرافیای ئەو کات زۆر جیاوازە لەگەڵ ناسینی شوێنی ئەو شارانە بەپێی جوگرافیای ئێستا، بونمونە کاتی خۆی دەگوترا (نینوی اربیل شهرزو ارومیە) و ئابەم شێوە ناوچەو شوێن و وێستگە سەرەکییەکان دیاری دەکرا، بۆیە (خیلات) وێستگەیەکی سەرەکی بوو لەسەر ڕێی ئەرمینیاو ئازەربایجان جۆرجیا، سوڵتان خەواریزم هەوڵی دەدا ئەو ناوچانە هەر هەموو کۆنترۆڵ کات بەو ئومێدەوە لەوێوە بەرەو شام بکەوێتە ڕێ و لەوێوەش بتوانێ فشارێکی تەواو بخاتە سەر بەغدا، مەلیکی خیلات ئەو کات ناوی (ئەشرەفی کوڕی مەلیك عادیل ئەیوب) بوو، یەکێکە لە مەلیکەکانی دەوڵەتی ئەییوبی، کەمەملەکەتی ئەییوبی لەلایەن سێ براوە بەڕێوە دەچوو (ئەشرەف و کامیل و موعەززەم) ئەشرەف پادشای جەزیرە و خیلات و میافارقین بوو (کامیل)یش خاوەنی میسڕبوو(موعەززەمیش) خاوەنی (شام) بوو، ئەو بنەماڵەیەش وەکو باقی بنەماڵەکانی تر کێشەیەکی زۆریان لەنێوان دابوو، ئەشرەف لە خیلاتەوە بەرەومیسڕدەکەوێتە ڕێ بۆ سەردانی براکەی (کامیل) کە خاوەنی (میسڕ) بوو، کە موعەزەم بەوەدەزانێ و واحاڵی دەکرێ کە هەردوو برا خەریکی پلانێکن بۆ ئەوەی

---

(١) بلدان الخلافة الشرقية، لاپەڕە ٢١٨.

موعەززەمی برایان لە حوکمی شام لابدەن پێشتریش باسی ئەوەمان کرد کە ئەو برایانە کێشەی نێوانیان زۆر گەورە بوو کار گەیشتە ئەو ئاستەی مەلیك (کامیل) خاوەنی میسرپەنا بۆ سەڵیبییەکان ببا بۆ ئەوەی بێنە شام نەبادا موعەززەم شام تەسلیم بە (خەواریزم شاه) بکات.[1]

ئەوە بوو (موعەززەم) پەیوندی بە (جلال الدين خەواریزم) دەکاو تەماعی ئەوەی دەداتێ کە (خیلاط) داگیر بکا و باسی پێکهێنانی بەرەیەك دەکا لەنێوان خۆی وخەواریزم شاه بەتایبەت لەوکاتە کە خەواریزم شاه ئازەربایجان و ئەرمیناو جۆرجیا داگیر دەکاو سنوری دەسەڵاتی دەکەوێتە سەر شاری خیلاط کە دەسەڵاتی مەلیك ئەشرەفە، بەم شێوەیەش مەلیك ئەشرەف کەوتە نێوان دوو ناحەزی خۆی یەکیان براکەیەتی کە خاوەنی شامە ئەوەی تر جلال الدين خەواریزم شایە کە خاوەنی ئازەربایجان و ئەرمینیاو جۆرجیایە، ئەوەی جێی ئاماژەیە لەساڵی (٦٢٣) خەواریزمییەکان هەوڵی گرتنی شاری خیلاتیاندا، بەڵام خەڵکەکە زۆر بەتوندی بەرەنگاری هێزی خەواریزمییەکان بوونەوەو سەرمای زستانیشی بەسەر هات، خەوارریزمییەکان نەیان توانی شاری خیلات بگرن گەرچی گوندو دێهاتەکانی دەورو بەری خیلاتیان تالانکرد، لەو بەینە نێوان براکان چاك دەبێتەوە واتە: (کامیل و ئەشرەف و موعەززەم) بۆیە ئەو جارەی کە خەواریزم شاه گەمارۆی خیلاتی دا، موعەززەم زۆری هەوڵدا قەناعەت بە

---

(١) بگەڕێوە لاپەرە ٧١.

خەواریزم شاه بکا، کە واز لەخیلات بێنێ و دەست لەگەمارۆی ئەو شارە هەڵگرێ، بەڵام خەواریزم شاه بڕیاری دابوو کە دەبێ، خیلات بگیرێ، ئەوەش عەقلیەتی خەواریزمییەکان بوە هەر لەو دیوی ڕوبارەوە تاوەکو سنوری شام دەوروبەری بەغدا هەرچی هێز هەبوو کردبویانە دوژمنی خۆیان، عەقلیەتی خەواریزمییەکان وابووکەنابێ هیچ جەمسەری هێز جگە لەوان هەبێ، بەهەر حاڵ ئەو جارەی خەواریزم شاه زۆر بەتوندی گەمارۆی (خیلات)ی دا سەرەڕای سەختەی زستان، بەڵام هێزەکانی لەدەوروبەری ئەوشارە نەکشاندەوە، گەمارۆکە شەش مانگی خایاند، خەڵکی شارەکە بەرەنگاربوونەوەیەکی زۆری خەواریزمەکانیان کرد و خۆراکیان نەما هەرچی سەگ و پشیلەی ئەو شارەش هەبوو خواردیان، لەکۆتاییی بەناچاری (خیلات) تەسلیم دەبێ و هێزەکانی خەواریزم شاه دەچنە نێو شارەکەو (خیلات) سێ ڕۆژ بۆ خەواریزمییەکان حەڵاڵ دەکرێ، بەسەدان ئافرەتیان کردە جاریەو بەدەیان منالیان ڕفاند سەدان کەسیان کوشت و ئەوەی خەواریزمییەکان بەخیلاتیان کرد، کافرەکانی ئەرمەنی و سەلیبییەکانیش لەوەیان زیاتر بەخەڵکی موسڵمانی ئەو شارە نەدەکرد، (خیلات و داقوق) دووپەڵەی ڕەشی زۆر گەورەن لەپەڕاوی مێژووی خەواریزمییەکان کەبەداخەوە کەم تیشکی دەخرێتەسەر، تالان و فەرهودی و ڕفاندنی منال و بەکەنیزە کردنی ئافرەت لای ئەوان زۆر ئاسایی بوو چۆن جورئەتێك بووە کارێکی ئاوا بەخلکی موسڵمانی ئەو شارە بکەن، ئینجا

لەهەموی سەیر تر خێزانی (مەلیك ئەشرەف) بەدیل دەگیرێ، کە خەواریزم شاه بەوە دەزانێ، ژنەکە دەباو هەر هەمان شەو مارەی دەکاو دەیگوازێتەوە، [(١)] ئەوەش دیسان ئاماژەیەکی زۆر گەورەیە بەتاوانی جلال الدین خەواریزم شاه و پابەند نەبونیەتی بەشەرعی خوای گەورە، بەتاوانێکی زۆر گەورەی دەزانم مێژووی جلال الدین خەواریزم شاه بەمێژووی سوڵتانێکی موسڵمان هەژماربکرێ، کەشەڕی کوفر و ئیمانی کردبێ! ئێمەباسی ئازایەتی و لێهاتویی سوڵتان جلال الدین ناکەین، بەڵام دەبێ ئەوە بزانێن کە ئەو جۆرە سوڵتان و مەلیکانە لەمێژووی ئیسلامی تاوانێکی گەورەیە لەسەر ئیسلام هەژمار بکرێن.

دوای گرتنی (خیلات) سوڵتان خەواریزم شاه داوای بەرەیەك دەکا لە (علاءالدین کەی قباز) سوڵتانی سەلجوقییە ڕۆمییەکان کە ئەوکات خاوەنی ئالانیاو ئەنتالیای ئیستا بوو دەکەونە قەراغ دەریای ناوەڕاست، سوڵتان (عەلائەددین کەی قوباز) ڕازی دەبێ بەوەی بەرەیەك دروست بکەن بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی هێزەکانی مەغۆل، بۆئەو مەبەستەش وەفدێك دەنێری بۆلای خەوارزیم شاه و چەندین دیاری بەنرخ بۆ سوڵتان خەواریزم شاه دەنێرێ، بەڵام دەورو بەرەکەی سوڵتان خەوارزیم دەڵێن ئەو دیاریانە شایەستەی سوڵتان نینەو بێڕێزی بەرامبەر بە وەفدەکەی (عەلائەددین کەی قوباز) دەکەن، کەئەوە یەکێکە لەو هۆکارانەی ئەو بەرەیە دانامەزرێ.

---

(١) الدولة الخوارزمية والمغول، لاپەڕە ٢١٣.

ڕوداوێكی تریش لەو كاتە ڕوویدا كە جلال الدین خەواریزم شاە خیلاتی گەمارۆدابوو، نامەیەكی بۆ هات لە خوشكە گەورەكەی بەناوی (خان سوڵتان) كاتی خۆی ئەو كچە لەلای مەغۆلەكان بەدیل دەگیرێ و (دوشی) كوڕی جەنگیزخان ئەو كچە بۆ خۆی دەبا، ئینجا چەند منداڵێكی لێدەبێ و ئەو كچە نامە بۆ براكەی دەنێرێ پێی دەڵێ: پیاوەكەم ڕێی پێداوم منداڵەكانم فێری قورئان بكەم و ئێستاش پێی خۆشە ئەگەر تۆ حەز بكەی دانوساندێك لەگەڵ (دوشی) بكەی دەگەڕێتەوە سەر دەسەلاتی خۆت لە خەواریزم، بەلام جلال الدین خەواریزم شاە وەلام نامەی خوشكەكەی ناداتەوە. دیارە ئەو هەڵوێستەی جلال الدین منكبرتی كاریگەری زۆر نەرێنی لەسەر (نەسەوی) دەبێ كەخۆی لەگەڵ جلال الدین منكبرتی بووە، بۆیە لەكتێبەكەی دوای ئەوەی باسی وەلام نەدانەوەی جلال الدین بۆ خوشكەكەی دەكات و ئینجا بەیتە شیعرێك دێنیتەوە و كە ئەو دێرە شیعرە شیعری (ابن هرمە)یە كەباسی گێلی و گەمژەیی (نەعامە) دەكات و دەڵێ: ئەو باڵندەیە كەهێلكەكەی خۆی بەجێدەهێڵێ بۆ گەران بەدوای خۆراك لەڕێی گەران بەدوای خۆراك چاوی دەكەوێ بەهێلكەیەكی تر ئیتر ئەوەی خۆی لەبیر دەچێ و باڵی بەسەر هێلكە دۆزراوەكە دەكێشێ :

كتاركة بيضها بالعراء وملبسة بيض اخرى جناحا

جلال الدین مونکەبرتی لەبری ئەوەی ئەو هەڵە بقۆزێتەوە لەگەڵ (دوشی) دانیشتباو ڕێگا چارەیەکی بۆ دەوڵەتەکەی خۆی بدۆزیبایەوە کەچی خەریکی کاوڵکردنی (خیلاتە)[1] ئیمام (ابن الاثیر) کە باسی ڕووداوی خیلات دەکا دەفەرمێ: وخربوا خلات واكثروا القتل فيها ومن سلم هرب في البلاد وسبوا الحريم واسترقوا الاولاد وباعوا الجميع فتمزق كل ممزق وتفرقوا في البلاد ونهبوا الاموال وجرى على أهلها مالم يسمع بمثله احد.[2].خەڵکی شارەکەیان کوشت ئافرەتەکانیان بە کەنیزە گرت هەرچی ماڵ و موڵکی ئەو خەڵکە هەبوو بردیان شتێکی ئاوایان بەسەر ئەو خەڵکە هێنا بەسەر خەڵکی هیچ شوێنی تر نەهاتبێ، ئینجا ئەوەی لای من سەیرە (نەسەوی) لەکتێبی (سيرة جلال الدين منكبرتي لاپەڕە٣٢١ دەڵێ: ئەوەی لەسەر خیلات باس دەکرێ بەو شێوەیە نییە، بەڵام خەڵکێکی زۆر لەژێر سزاو و ئەشکەنجە مردن. دیارە (نەسەوی) بەحوکمی ئەوەی لە جلال الدين منكبرتي نزیکەو بەهانەی بۆ دێنیتەوە وەکو بڵێی وەڵامی قسەکانی ئیمام ابن الاثیر دەداتەوە کە بەوشێوەیە نییە، کەچی عوزری لە قەباحەتەکە گەورە ترە و دەڵێ: والذي شاع عند الناس انه امر بقتل من بها حتى استولى عليها فغير صحيح لكن جماعة كثيرة هلكوا بالعقوبات. خەڵکێکی زۆر بە سزا مردن، وەکو بڵێی باسی کۆمەڵە ئاژەڵێك دەکا و گیانیان

(١) سيرة جلال الدين منكبرتي، لاپەڕە ٣٠٠.
(٢) الكامل في التاريخ (١٠/ ٤٣٩).

لەدەست داوە، بۆیە ئەگەر ڕووداوەکان لەچەند سەرچاوەیەکەوە وەرنەگری بەرەو هەڵەی گەورەت دەبا بەڵێ (نەسەوی) ناڕاستەوخۆ جارجارە گلەیی لە (جلال الدین منکبرتی) دەکا، بەڵام بەحوکمی ئەوەی زۆر لێی نزیك بووە زۆر بەقوڵی ناچێتە نێو تاوانەکانی سوڵتان، ئینجا (عیزەدین ئەیبەك) لەبری (مەلیك ئەشرەف) حاکمی خیلات بوو دەگیرێ و دەهێنرێتە بەر دەستی (جەلالەدین مونکەبیرتی) هەوڵێکی زۆر دەدا کە سوڵتان ڕازی بێ دەستی ماچ بکات و لێی ببورێ، بەڵام سوڵتان ڕازی نابێ و دوای هەوڵێکی زۆر ڕازی دەبێ قاچی ماچ بکات! و لێی خۆش بێ لەبەر ئەوەی پێی وابوە کە (عیزەدین ئەیبەك) لەوە زۆر بچوکترە بگاتە مەقامی دەست ماچکردنی سوڵتان.

خوێندنەوەی مێژووی ئەو جۆرە دەوڵەت و سوڵتانانە ئەوەت بۆ دەردەخا کە ئەو جۆرە سوڵتانە هیچ پەیوەندیان بە ئیسلام و ئەحکامی شەریعەت نەماوە، تەنها بەناو موسڵمان بووینە و بەکردەوە لە ئیسلام دابڕاون، ئەوەی سەیرە جۆرە نوسەرێك کەباسی ئەو کەسانە دەکەن تەنها شەڕەکانیان دەخوێننەوە دژ بە کافرەکانی ئەرمەنی و جۆرجی لای ئەوان تەنها ئەوە گرنگ بووە، کەباسی ئەو جۆرە کەسە دەکەن خۆ بە دوردەگرن لەو بنەمایەی ئەهلی (سوننەو جەماعەت) کە ئیمان نییەتی دڵ و گوتەی زوبان و کردەوەیە، ئەو بنەماشەرعییە تەنها لەسەر خەڵکی بێ دەسەڵات و عەوامی ئەو خەڵکە دەسەپێنن، بەڵام کەباسی سوڵتان ئەمیرو حاکم و پادشا

دەکەن خۆیان بەدور دەگرن لەو جۆرە بنەمایە، ولاحول ولاقوة الا بالله العلی العظیم .

دوای کـــاوڵکردنی خـــیلات و کوشـــتنی خەڵـــکەکەی (جەلالەددیـــن مـونکەبیرتی) فەرمـان دەکـا بە چاککردنەوەی دیـوارە ڕووخاوەکـانی شـاری خـیلات و دیسـان ئـاوەدان کـردنەوەی ئەو شـارە ئینجـا (نەسـەوی) لەکتێبـی سیرة جلال الدین منکبرتـی لاپەڕە ٣٢٥ دەڵـێ: دوای کـاوڵکردنی ئەو شـارە (منکبرتی)پەشـیمان دەبێـتەوە لەوەی بەو شـارەی کـرد. سـەیرە پەشـیمان بـــوونەوە چ ســـودێکی هەیە دوای کوشـــتنی ئەو هەمـــوو خەڵـــکەو بەکەنیزەکردنـــی ئـــافرەتی موســـلمان و ڕفانـــدی منـــاڵە موســـڵمانەکان و فرۆشتنیان، باسی قیصاص و حـوکمی شـەریعەتیش لەو بـوارەوە هەرنـاکرێ، وەکـو بڵێـی ئەو جـۆرە سـوڵتانە بەدەر بـووینە لە پابەنـد بـوون بەئەحکـامی شەریعەت!.

ئیمـام (سـبط ابـن الجـوزی) لەکتێبـی مـرآة الزمـان فـي تـواريخ الأعيـان بەرگی ٢٢ لاپەڕە ٣١٢ دەفەرمێ : خاڵم ابو محمد یوسف محی الدین ابن الجوزی بۆی گێرامەوە نامەی خەلـیفەم برد بۆ جەلالەددیـن مـونکەبیرتی ئەو کاتەی خیلاتی گەمارۆ دابوو، چومە لای بینیم قورئان دەخوێنیتەوە و دەگریـــێ، پـــێم گـــوت ئەوە خەریکـــی قورئـــان خوێنـــدنەوەی و ئەو کـــارە بەموســـڵمانان دەکەی بەس نیـــیە بیســـت هەزار کەســـت لە داقـــوق کوشـــت خێزانەکانیانـت بە جـاریە بـرد و ئەو هەمـوو تـاوانەت ئەنجـام دا، ئەویـش

وەڵامی دامەوەو گوتی سوپایەکەم سوپایەکی گەورەیە و پێنج ڕۆژە ڕێیە بەقسەم ناکەن و زۆر جار لە فەرمانم دەردەچن، ئەو ڕیوایەتە مێژووییانە ئەوەت بۆ دەردەخا خەواریزمییەکان و سوپاکانیان سوپای جیهاد و موجاهیدان نەبووە، خەمی گەورەیان بڵاوکردنەوەی ئیسلام وفتوحاتی ئیسلامی نەبووە، بەڵکو سوپایەکی گەورەی ڕێگرو چەتە و دز و جەردە بووە، هەرشارێکیان گرتوە سەرەتا فەرهودیان کردوە ودەستدرێژیان کردۆتە سەر ناموس و ماڵی خەڵکە موسڵمانەکە.

# نێوان سوڵتان جەلالەددین مونکەبیرتی و خیلافەتی عەبباسی

لەساڵی (٦٢٣) خەلیفە(الظاهربأمرالله)وەفات دەکا، ماوەی حوکمی ئەو خەلیفەیە تەنها ٩ مانگ و ٢٤ ڕۆژ بوو، ئەو خەلیفەیە یەکێك بوو لەو خەلیفانەی هەوڵی چاکسازی دەداو کەسێکی زۆر باش بوو بۆیە ئیمام (ابن الاثير) دەفەرمێ: ولم أزل علم الله سبحانه منذ ولي الخلافة أخاف عليه قصر المدة لخبث الزمان وفساد اهله واقول لكثير من أصدقائنا: وما اخوفني ان تقصر مدة خلافته لان زماننا وأهله لايستحقون خلافته، فكان كذلك.[1] واتە: هەر لەو کاتەی بوو بەخەلیفە زۆری لێدەترسام کەماوەی کەم بێت لەبەرئەوەی کەسێکی زۆر باش بوو خەڵکی ئەو زەمەنەی ئێستای ئێمە ئەوەندە خراپ بوون، شایستەی ئەو خەلیفە باشە نەبوون، لەدوای ئەو کوڕەکەی (المستنصر بالله) دەبێتە خەلیفە، ئەویش بەهەمان شیوە هەوڵی چاکسازی دا یەکێك لەهەوڵەکانی نەهێشتنی ئەو گرژیە بوو لەگەڵ خەواریزمییەکان، بۆیە ئەو کاتەی هێزی خەواریزمییەکان گەمارۆی شاری (خیلات)یان دابوو، خەلیفە وەفدێك بەسەر پەرشتی (سعدالدين الحاجب)

---

(١) الكامل في التاريخ (١٠/ ٤١٣).

ڕەوانە دەکـا بـۆ لای جـلال الـدین منکبرتـی، داوای چـاککردنەوەی پەیوەندییەکانی کرد لەگەڵ خەواریزمییەکان لەبەرامبەر چەند داواکاریەك، وەفـدەکە گـوتی ئەگەر ئەو داواکاریـانە قبـوڵ بـکەن ئـێمە لەبەغـدا دان بەدەسـەڵاتان دەنێین و ئامـادەین پێشـوازی لە نوێنەرتـان بکەیـن، دواکـاری خەلیفە دەتوانین بڵێین لەدووخاڵ کورت کرابوەوە.

یەکەم: خەواریزم شاە دەستدرێژی نەکاتە سەر سنوری دەسـەڵاتی هەندێك پادشـاو مەلیـك کە زۆر نـزیکن لە خەلـیفە وەکـو بۆنمـونە بدرالـدین لؤلـؤ خاوەنی موصل و مظفر الدین کوکبري خاوەنی هەولێر.

دووەم: لە وتاری هەینی ناوی خەلیفە بهێنرێ لە تەواوی مزگەوتەکانی ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی خەواریزمی.

سـوڵتان جەلالەددیـن مـونکەبیرتی ئەو مەرجـانەی قبـوڵ کـرد و وەفـدێکی ڕەوانەی بەغـدا کـرد بەسـەر پەرشـتی (محمـد النسـوی) خـاوەنی کتێبـی (سیرة جلال الـدین منکبرتـی) ئینجا نەسەوی خۆی باسـی سـەردانەکەی کردوە بۆ بەغـدا پایتەختی خیلافەتـی ئیسـلامی و باسـی ئەوە دەکا دەڵـێ: کە گەیشتینە کۆشکی خیلافەت، شـەو ئەوەندە مـۆمە هەڵگیرسابوو وەکـو وێنەی ئاسـمانێکی پڕ ئەسـتێرە لەئـاودا هـاتە بەرچـاوم، ئینجا باسـی ئەوە دەکـا کە دەگـاتە خزمەت خەلـیفە بەر لەوەی سـەر بەرزکـاتەوە عەرزی بەر پێی خەلیفەی ماچ کردوە، دواتر خەلیفە کتێبێکی پێدەدا و کتێبەکە دەخاتە سەرسەری و دیسان زەوی بەرپێی خەلیفە ماچ دەکاو دوای چەند قسـەیەك

(نەسەوی ) دەگەڕێتەوەلای سولْتان جلال الدین، خەلیفە وەفدێکی تر دەنێرێ بۆلای سولْتان جەلالەددین مونکەبیرتی، چەند دیاریەکی بەنرخ لەگەڵ خۆیان دەبن بۆ سولْتان، لەو دیاریانە چەند شمشێرێك بەئاڵتون و دڕو مەرجان نەقشاندرابوون، چەند ئەسپێکی عەرەبی زۆر چاك و چەندین خزمەت کارو چەند بەرگێك لە ئاوریشم چنرابوو ئەوانە دیاری خەلیفەیە بۆ سولْتان جلال الدین، ئینجا خەلیفە داوا لە سولْتان جلال الدین دەکا کە گەمارۆی سەر (خیلات) هەڵگرێ، بەڵام سولْتان جەلالەدین بەقسەی خەلیفە ناکا و (خیلات)ی داگیرکرد و ئەو شارەی کاوڵکرد.

## شکەستە گەورەکەو کوشتنی سوڵتان جەلالەدین(٦٢٧ – ٦٢٨)کۆچی

دوای گرتنی خیلات و ئەو تاوانەی سوپای خەواریزمییەکان لەو شارە ئەنجامیان دا، پادشاو سوڵتانەکانی دەوروبەری (خیلات) تا دەگاتە موصل بیریان لەبەرەیەك کردەوە بۆ وەستان بەڕوی خەواریزمییەکان، بەرەیەکیان دروستکرد و سوپایەکی گەورەیان ئامادەکرد و علاء الدین (کی قباذ) سوڵتانی سەلجوقییە ڕۆمییەکان ئەویش بەشداری ئەو بەرەیەی کرد، بەرەکە بە سەرپەرشتی (ئەشرەف) بوو، ئیمام (ابن کثیر) دەگێڕیتەوە و دەفەرمێ: بەر لەشەڕەکە مەلیك موسا ئەشرەف پێغەمبەری خوای لەخەو بینی (صلى

الله عليه وسلم) و مژدەی سەرکەوتنی پێدا: يَا مُوسَى أَنْتَ مَنْصُورٌ عَلَيْهِمْ[١]. ئەو سوپایە بەڕێکەوت بۆڕزگار کردنی شاری (خیلات) لەدەست خەواریزمییەکان و لەنزیك شاری (خیلات) توانییان شکەستێکی گەورە بەسەر سوپای خەواریزمەکان بینن، ئیمام شمس الدين ناسراو بە(سبط ابن الجوزي) لەکتێبی مرآة الزمان في تواريخ الأعيان ج ٢٢ لاپەڕە ٣٠٥ دەفەرمێ: ئەوڕۆژەی کە سوپای مەلیك ئەشرەف ڕوو بەڕووی سوپای جلال الدين خەواریزمی بویەوە ڕۆژێکی تەماوی بوو، دانیشتبوم لە مزگەوتی دیمەشق نوێنەری مەلیك ئەشرەف هاتە مزگەوتەکەو داوای لێکردین دوعا بکەین بۆ مەلیك ئەشرەف، ئێمەش دوعایەکی زۆرمان کرد الحمدللە خوای گەورە سوپای مەلیك ئەشرەفی سەرخست بەسەر خەواریزمییەکان، سولتان جەلالەدین لەشەڕەکە ڕایکردو خۆی گەیاندە ئازەربایجان و مەلیك ئەشرەفیش گەڕایەوە شاری (خیلات) و خەڵکی شارەکە ئاهەنگی گەورەیان گێرا بەسەر کەوتنی (مەلیك ئەشرەف) و شکەستی خەواریزمییەکان، دوای ئەو شکەستەی بەسەر خەواریزمییەکان هات، مەلیك ئەشرەف پەیمانێك واژۆ دەکا لەگەڵ سولتان خەواریزم کەئەو لەسنوری (ئازەربایجان) بمێنێتەوەو ڕوو لە ناوچەی خیلات و دەورو بەری نەکات، مەلیك ئەشرەف نەیویستوە سولتان جەلالەدین خەواریزم بەجارەکی نەمێنێ لەبەر ئەوەی پێی وابوو خەواریزمییەکان دیوارێکی گەورەن لەنێوان

---

(١) البداية والنهاية (١٣/ ١٤٩).

ئەوان و تەتارەکـان بەنەمـان و ڕوخـانی دەوڵەتـی خەواریزمـی هەڕەشـەی مەغۆلەکـان ڕاسـتەوخۆ ڕوو بەڕووی خـیلات و بـاقی دەوڵەتەکـانی تـری جیهـانی ئیسـلامی دەبێـتەوە، سـوپای خەواریزمییەکـان دوای ئەو شکەسـتە پەرت بـوو، سـوڵتان جـلال الـدین زۆربەلاوازی لە ئازەربایجـان مـایەوە، ئـالەو کـاتە مەغۆلەکـان بـۆ جـارێکی تـر زۆر بەگەورەیـی دێـنەوە مەیـدان و سـوپایەکی گەورە دەنێـرن بۆسـەر جیهـانی ئیسـلامی، (ئیسـماعیلییەکان) هەواڵ بـۆ تەتارەکـان دەنێـرن کە جـلال الـدین ی خەواریزمـی شکسـتێکی گەورەی هێناوە بەدەست (مەلیك ئەشرەف) و ئێستا سـوڵتان جلالەدیـن زۆر لاواز بـــووەو هێزەســـەربازییەکەی پەرتەیـــان لێکـــردووەو دەوروبەرەکەشـــی لە پادشـــاکانی نـــاوچەکە هەر هەمـــوی بـــوونەتە دوژمنـــی، مەغۆلەکـــان بەســـوپایەکی گەورە بەرەو جیهـــانی ئیســـلامی کەوتـــنە ڕێ.[1] هەر لەمـــاوەیەکی زۆر کەم دەتـــوانن (ڕەیـــی) و (هەمەدان) داگیـــر بـــکەن، و بەمـاوەیەکی زۆر کەم و لەسـەرتای سـاڵی (٦٢٨) کـۆچی توانیـان بـگەنە سـەر سنوری ئازەربایجـان، ئامـانجی سـەرەکی مەغۆلەکـان گرتنـی سـوڵتان جەلالەدین بوو، بۆیە سوڵتان لە ئازەربایجانەوە دەچێتە (تەبرێز) مەغۆلەکـان بەدوای سـوڵتان جەلالەدیـن خۆیـان دەگەیەنـنە (تەبرێـز) سـوڵتان جلالەدیـن بەناچاری ئەوێش بەجێدەهێڵێ و بەوە ڕاناگات هیچ لەهێزەکـانی کۆبکـاتەوە هەتا هەندێ لەڕیوایەتەکـان دەڵـێن پێڕاناگـا خێزانەکانیشـی ڕزگـار بکـات و

(١) البداية والنهاية (١٣/ ١٥٠).

هەموییان لە (تەبریز) جێدەهێڵێ و دەچێتە دەشتی (موقان) کەدەکەوێتە خۆرئاوای دەریای (قەزوین)، بەڵام مەغۆڵەکان دەچنە ئەو شوێنەش، جلال الدین بەناچاری دەگەڕێتەوە ئازەربایجان و لەوێوەش خۆی دەگەیەنێتە ناوچەی (ئامەد) ئالەو کاتە سوڵتان جلال الدین داوای یارمەتی لەخەلیفەو پادشاکانی ناوچەی (دیاربەکرو جەزیرە) دەکات، بەڵام هیچ یەکێك لەوانە بەهانای نایەن لەبەر ئەوەی لەو چەند ساڵەی ڕابردوو سوڵتان جەلالەدین سوپاکەی تەنها ناوچەکەیان کاولکردوەو ستەمێکی زۆریان لەخەڵکی ئەو ناوچەیە کردوە، دوای ئەوەی سوڵتان دەگاتە ناوچەی (ئامەد) مەغۆلەکان هەر زوو دەگەنە سوپاکەی و لەشەڕێکدا سوپای خەوارزیم شاه تێکدەشکێنن و خەواریزم شاه خۆی و چەند کەسێکی دەوروبەری ڕادەکەن و دەگەنە ناوچەیەکی شاخاوی لە (ئامەد) لێرە (نەسەوی) نوسەری کتێبی (سیرة جلال الدین منکبرتی) دەگێڕیتەوە دەڵێ: ئەو شەوە خەریکی نوسینەوە بووم زۆر ماندوو بووم خەوم لێکەوت، لەپڕ بانگیان کردم گوتیان هەڵسە قیامەت هەڵساو مەغۆڵەکان گەیشتنە سەرمان، ئینجا (نەسەوی) دەڵێ: خۆم گەیاندە ئەسپەکەو سەیرمان کرد سوڵتان جلال الدین سەرخۆشە، هەر چۆنێك بێ ئەسپمان ئامادەکرد بۆی و سوڵتان بەیەکێك لەسەرکردەکانی گوت کە ناوی (ئەوترخان) بوو ئەو خەڵکە لەگەڵ خۆت ببەو بەرەو ئاڕاستەیەك ڕابکەن با مەغۆڵەکان وا حاڵی ببن کە منم بەو ئاڕاستەیە ڕامکردوە ئەوە بوو خۆی بەتەنها بەرەو شوێنێکی تر ڕایکرد و ئەوانەی لەگەڵی بوون

بەرەو شوێنێکی تر ڕایانکرد، ئەوانە دواتر دەگەنە شاری هەولێر و نزیکەی چوار هەزار کەس کۆدەبنەوە ئینجا دەچنە شاری ئەصفەهان و لەوێوە بەرەو (مەیافارقین) دەکەونە ڕێ دەچنەلای شهاب الدین غازی کە ئەو کات ئەو خاوەنی (مەیافارقین) بوە، ئەو پیاوە تاسالَی (٦٣٩) دەمێنێ ئەو کاتەی (النسوی) کتێبەکەی دەنوسێ لەسەر ژیاننامەی جلال الدین منکبرتی.

(نەسەوی) دەڵێ منیش بەرەو شوێنێکی تر، ڕامکردو خۆم گەیاندە ئەشکەوتێك سێ ڕۆژ خۆم حەشاردا، دواتر بەرەو هەولێر کەوتمە ڕێ ماوەیەك لەهەولێر مامەوە لەوێوەش خۆم گەیاندە ئازەربایجان و دواتر چومە (مەیافارقین) کە ئێیستا (سەلوان)ی پێدەڵێن دەکەوێتە باکوری ڕۆژ هەلاَتی (وان)، سوڵتانیش بەتەنها لەو شاخە دەمێنێتەوە و ڕێ ون دەکا، ڕێی بەماڵە کوردێك دەکەوێ، دەڵێ: من سوڵتان جەلالەدینم ئەگەر یارمەتیم بدەی تادەگەمەوە شوێنی خۆم بەڵێنت پێدەدەم پاداشتێکی چاکت بکەم، کوردەکەش سوڵتان دەباتە ماڵەوە لای خێزانەکەی بەجێی دەهێڵێ و بەڕێ دەکەوێ کەرستە ئامادە بکاو سوڵتان جلالەدین بنێرێتەوە ئەصفەهان، ئالەو کاتە خزمێکی ئەو پیاوە دێتە ماڵەکەیان و کەدەبینی کەسێکی غەریب لەو ماڵەیە دەڵێ: ئەو خەواریزمییە چی دەکا لێرە؟ ئافرەتەکەش دەڵێ: ئەوە سوڵتانە و پیاوەکەم ئەمانی پێداوە، ئەویش دەڵێ: چۆن باوەڕی پێدەکەن ئەوە سوڵتان بێ، خەواریزمییەکان لە (خیلاَت) برایەکی منیان کوشت زۆر لەوە باشتر و چاکتر بوو، بۆیە بەڕمەکەی لە سوڵتان جەلالەدین

دەدات و هەر لەوێ دەیکوژێ.[١] گەر چی لەهەندێ سەرچاوە بەهەندێ گێرانەوەی تر هاتوە، بەڵام ئێمە گێرانەوەکەی (نەسەوی)یمان هەڵبژارد لەبەر ئەوەی ئەو لەگەڵی بووە تا دواساتی کوشتنی، بەکوشتنی سوڵتان (جلال الدین) کۆتایی بەدەوڵەتی خەواریزمی دێت، کەهەواڵی کوشتنی سوڵتان بڵاو دەبێتەوە هەندێك لەپادشاکان زۆریان پێناخۆش دەبێ و دەڵێن ئەو دیوارەی نێوان ئێمە و مەغۆلەکان بوو دیوارەکە ڕوخا.

ئیمام (ابن کثیر) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەربارەی سوڵتان جەلالەدین دەڵێ: هەندێ کردەوەی دەکرد بەڵگەی کەم عەقڵی بووە، بۆنمونە خزمەتکارێکی زۆر خۆش دەویست ناوی (قلج) بو، دوای ئەوەی ئەو خزمەتکارەی دەمرێ، لەهیچ کەس قبوڵ ناکا بڵێن مردوە ڕێی نەدەدا بینێژن کەسێك دەڵێ: قوربان ئەوە مردوە، سوڵتان هەندە تورە دەبێ یەکسەر فەرمان دەکا بەکوشتنی و هەر لەوێیا دەیکوژن، ئیمام (ابن کثیر) دەفەرموێ ئەوە بەڵگەی کەم دینی و کەم عەقڵی بوە (قبحه الله)[٢] ئیمام سبط ابن الجوزی دەربارەی کوشتنی جلال الدین منکبرتی دەڵێ: وكم فتك وقتل من المسلمين وسبى، وزالت أيامه وبقيت آثامه، وكان كثيرَ الفساد، أهلك عسكرُه البلادَ والعباد[٣]. چەند موسڵمانی کوشت و چەند ئافرەتی کرد بەجاریە،

---

(١) سيرة جلال الدين منكبرتى، لاپەڕە ٣٨٢. مرآة الزمان في تواريخ الأعيان، بەرگی ٢٢ لاپەڕە ٣١٢.

(٢) البداية والنهاية (١٣/ ١٥٠).

(٣) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٣١٢).

ڕۆژەکانی تێپەڕین و گوناهەکانی لە ئەستۆ ماون، فەسادێکی زۆری بڵاوکردەوە سوپاکەی کاوڵکاریان بەسەر خەڵك و وڵات داهێنا. دوای کوشتنی سوڵتان جلال الدين، هێزێکی مەغۆلەکان گەیشتنە تەورێزو تەورێزیان داگیر کرد لەوێوە بەرەو ئازەربایجان کەوتنە ڕێ، ئەو کات خاوەنی ئازەربایجان (مظفر الدين کوڕی بەهلەوان) بوو، تەتارەکان نوێنەرێکان ناردە لای و پێیان گوت ئەگەر لەگەڵ ئێمەی ئەوا هەر چی خەواریزمی هەیەدەبێ تەسلیم بەئێمەی کەی و نابێ هیچ خەواریزمیەك لەسەرکردەی سوپاکەت بێ، ئەویش مەرجەکانی تەتار قبوڵ دەکاو هەر چی خەواریزمی هەیە لەسنوری دەسەڵاتی خۆی دەستگیریان دەکا هەندێکیان دەکوژێ و سەرەکانیان بەدیاری بۆ مەغۆل دەنێرێ ئەوانی تر دەستگیر دەکات و تەسلیم بەمەغۆلەکانیان دەکات، ئەوەی جێی ئاماژەیە لێرە، ئەو سوپایەی هاتە ئازەربایجان داوای تەسلیم کردنی خەواریزمییەکانی کرد لە مزەفەری کوڕی بەهلەوان ژمارەیان تەنها هەزار کەس بوون، ئەوە لەکاتێك خەواریزمییەکان بەتەنها نزیکەی دە هەزار کەس بوون و سوپاکەی (مظفر الدين کوڕی بەهلەوان) لە ئازەربایجان نزیکەی بیست هەزار کەس دەبوون.[1] مەغۆلەکان گۆڕەپانەکەیان لەبەردەم چۆڵ دەبێ لەساڵی (٦٢٩) کۆچی هەندێك لە تەتارەکان دەگەنە شارەزور، ئەو کات خەلیفە داوا لەسوڵتان مزەفەری خاوەنی هەولێر دەکات ڕوو بەڕووی

(١) تاريخ مجموع النوادر مما جرى للاوائل والاواخر، لاپەڕە ٥٥.

تەتارەکان بێتەوەو خۆشی سوپایەکی لەبەغداوە بۆ دەنێرێ، سولْتان مزەفەر دەچێتە شارەزورو چەند مانگێکی لەوێیا دەمێنێتەوە، تەتارەکان کەبەو هێزە دەزانن هێزەکانیان دەکشێننەوەو دەگەڕێنەوە شوێنەکانی خۆیان، دواتر سولْتان مزەفەر وانیشان دەدا کەنەساغە و دەگەڕێتەوە هەولێر، هۆکاری ئەو هەڵوێستەی سولْتان مزفەر نادیارە لەبەر چی وای نیشان داوە کە نەساغە، هەموو ئەوانەی باسی سولْتان مزەفەریان کردوە بەکەسێکی ئازاو چاو نەترسیان ناساندوە، بەڵام ئیمام (ابن الاثیر) باسی ڕووداوێك دەكات بەزانینی ئەو ڕووداوە لەو هەڵوێستەی سولْتان مزەفەر دەگەی، کە ئەو بەتەنها لە مەیدانەکە بووە، خەلیفە نەیتوانیوە سوپایەکی گەورەی بۆ ئامادە بکاو پشتگیری ئەو سەرکردە گەورەیە بکات و نەیتوانیوە چۆن توانای سەرکردەکانی بقۆزێتەوەو سنورێك بۆ هێرشەکانی مەغۆل دابنێ، ئیمام ابن الاثیر لەکتێبی الکامل فی التاریخ بەرگی ٩ لاپەڕە ٦٩٥ دەفەرمێ:
تەتارەکان بەرەو شاری هەولێر هاتن ئێمە لە موصلەوە ترساین هەندێك لەخەڵکی خۆیان ئامادەکرد موصل بەجێبهێڵن، سولْتان مزەفەر نامەی بۆ (بەدرەدین لؤلؤ) نارد کەخاوەنی موصل بوو و داوای یارمەتی لێکرد، ئەوەبوو سوپایەك لەموصلەوە بەرێکەوت بۆ لای سولْتان مزەفەر دواتر خەلیفەی نامەی نارد بۆ سولْتان مزفەر و بدرالدین لؤلؤ خاوەنی موصل گوتی سوپاکانتان بێنن و لە(داقوق) کۆببنەوە دور نییە تەتارەکە خۆیان لە هەولێر نەدەن لەبەر سەختی شاخەکانی دەوروبەری، ڕاستەو خۆ بەرە و

بەغـدا بـکەونە ڕێ، خەلـیفە لەدوای مەلیـك (ئەشرەف)یشـی نـارد، بەڵام مەلیك ئەشرەف وەڵامی دایەوە گوتی کە سەڵیبییەکان خۆیان ئامـادە کردوە بۆ هێرش کردنە سەر (میسرِ) دەبێ مـن و (مـوعەززەمی) برام لەشامەوە بچین بۆمیسرِبەر لەهێزی سەڵیبییەکان بگـرین، ئەوە بـوو سـوڵتان مـزەفەر و سوپاکەی موصل و خەڵکێکی زۆری خۆبەخش لە (داقوق) کۆبونەوە، بەڵام ئەوەی سەیرە خەلیفە لەبەغداوە تەنها توانـای کـۆکردنەوەی (٨٠٠) کەسی هەبوو سەرکردەی هەموان سوڵتان مزەفەر بوو، سوڵتان مزەفەر وەڵامی نـارد بـۆ خەلـیفەو گـوتی قوربـان سـوپایەکەم بەژمـار زۆر کەمـن کەسـمان بـۆ کۆنەبۆتەوە ئێمە بەو سوپایە ناتوانین ڕووبەڕووی سوپاکەی تەتـار ببینـەوە، خۆ ئەگەر دە هەزار کەسم بۆکۆ ببێتەوە هەمـوو ئەو خاکانە دەگێرِمەوە کە تەتارەکـان داگیریـان کـردوە، سـەرەڕای ئەو سـوپایە بچـوکەی لە داقـوق کۆبـونەتەوە هەواڵ دەگـاتە مەغۆلەکـان کەسـوپای خەلـیفە لە داقـوق کۆبونەتەوە ئەوانیش کە بەوە دەزانن دەگەڕێنەوە شوێنی خۆیـان، جا ئەوەی سـەیرە خەلـیفە لەبەغـدا و پادشـاکان هەر کەس لەشـوێنی خۆیـان هیچیـان خەمی تەتارو مەغۆلیان نەبووە تـا ترسـەکە گەیشتۆتە سنوری دەسەڵاتی ئەوان ئینجـا هەسـتیان بەترسـناکی تەتـار کـردوە، ئەوەش ئامـاژەیە بـۆئەو پەرتەوازەیەی کە جیهانی ئیسلامی گرتبووەوە، دەبوایە هەر لەگەڵ کەوتنـی (ئۆترارِ) و(بوخـارا) نەك هەر خەلـیفە، بەڵکـو تەواوی پادشـاکان لەتەواوی جیهـانی ئیسـلامی خۆئامـادە بـکەن بـۆ گێـرانەوەی شـارەکانی ئەو دیـوی

ڕوبـار، بەڵام هەروەكـو باسـمان كـرد واقیعـی جیهـانی ئیسـلامی ئەو كـات واقیعێكی زۆر تاڵ بوە، خەڵكەكە بەتەواوی پەرتەوازە ببـون و كەس ئاگـای لەوەی تـر نەبـووە، هەر پادشـایەك كە مەغۆلەكـان لێـی نزیـك دەبـوونەوە ئەو كات داوایان لەوخەڵكە كردوە خۆتـان ئامـادە بـكەن، كەبەداخەوە ئەو درەنـگ بەخـۆ كەوتـنە هـیچ سـودی بۆیـان نەبـووە، تەتارەكـان لەو مـاوەیە زۆر بەئاسـانی دەگەنە بەدلـیس و دیـاربەكرو خـیلات و هەولێـر و داقـوق، بەبـێ ئەوەی هیچ هێزێك بەر بەستیان بێ، ئیمـام (ابـن الاثیـر) ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لەكتێبـی الكامـل فـی التـاریخ بەرگـی ٩ لاپەڕە ٧٢٠ دەفەرمـێ: نـامەی بازرگـانێكم كەوتە بەرچـاو ئەو بازرگـانە خەڵكـی نـاوچەی (ئەلڕەی)بـوو دواتـر دێـتە موصـل و ئینجـا دەگەڕێـتەوە شـارەكەی خـۆی (ئەلڕەی) دوای ئەوەی تەتارەكـان ئەو ناوچـانە داگیـر دەكەنەوە ئەو لەگەڵ تەتارەكـان دەچێـتە (تەبرێـز) و لەوێـوە نـامەیەك بـۆ دۆسـت و برادەرانـی لەموصل دەنوسـێ، و پێیـان دەڵـێ: ئەو هێـزەی مـن بینـیم هێزێكـی یەكجار زۆرو گەورەیە مەبەسـتم ترسـاندنی موسـڵمانان نیـیە، بەڵام ئەوە بـزانن ئەو كەتیبـانەی گەیشـتونەتە نـاو (خـیلات و، بەدلـیس و، هەولێـر و، داقـوق) ئەوانە تەنهـا بۆتـالان و دزی نەهـاتوون، بەڵكـو ئەوانە گەڕانەوە لای سـەركردەگەورەكانی خۆیـان پێیـان ڕاگەیانـدوون، كەهـیچ بەربەسـتان لەپێش نییەو موسڵمانان خـاوەن هـیچ هێزێكـی وا نـین بتـوانن ڕێگری لە سـوپای مەغـۆل بـكەن بـۆیە چـاوەڕوان بـن و لەبەهـاری ئەوسـاڵ هێرشـێكی گەورە

دەکریتە سەرتان، ئەو نامەیەی کە خودی ئیمام (ابن الاثیر) خوێندویەتیەوە، زانیارێکی زۆر ترسناکە لەسەر ئەو ئامادە باشییەی کە تەتارەکان کردویانە، بۆ گرتنی بەغداو گرتنی تەواوی وڵاتی موسڵمانان، بەڵام دیارە کەس نە بووە سود لەزانیاری گرنگ وەرگرێ، بەداخەوە موسڵمانەکان هەر خەریکی کاری لاوەکی بووینە، ئیمام ابن الاثیر ڕەحەتی خوای لێبێ لەساڵی (٦٣٠) وەفات دەکا، لەڕووداوەکانی کۆتا ساڵی (٦٢٨) باسی ئەو نامەیە دەکا، بەڵام کەس نەبووە گوێی لێبگرێ، سود لەو زانیارییە بەسودانە وەرگرێ، ئینجا ئیمام ابن الاثیر هەر لەو ساڵە واتە دوو ساڵ بەر لەوەفاتی دەفەرمێ: واشتد خوف الناس منهم باذربيجان فالله تعالى ينصر الاسلام والمسلمين نصرا من عنده فما نرى في ملوك الاسلام من له رغبة في الجهاد، ولا في نصرة الدين، بل كل منهم مقبل على لهوه ولعبه وظلم رعيته وهذا أخوف عندي من العدو وقال الله تعالى: {وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً}[1].[2] باسی ترسی ئەو خەڵکە دەکا لەتەتارەکان و دەفەرمێ خوای گەورە ئیسلام و موسڵمانان سەرخا، ئەوەندەی زەینی دەدەینێ پادشاکانی ئیسلام هیچ نییەتی جیهادو سەرخستنی دینیان نییە، هەر یەك لەوانە خەریکی هەوەس و خۆشگوزەرانی خۆیەتی و خەریکی ستەمکردنن لە خەڵکی ژێر دەستیان،

(١) الأنفال: ٢٥.

(٢) الكامل في التاريخ (١٠/ ٤٤٧).

ئەوەش لای من ترسناکترە لەدوژمن خوای گەورە دەفەرمێ: {وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً}.[1] لە ساڵی (٦٣٢) دیسان تەتارەکان هێرش دەکەنە سەر شاری هەولێر، دەتوانن دیواری شارەکە ببڕن و بگەنە ناو شارەکە، بەڵام خەڵکی شارەکە دەچنە سەر قەڵاکەو لەوێوە بەرەنگاری هێزەکانی مەغۆل دەبنەوە، یاقوتی حەمەوی دەربارەی هەولێر دەڵێ: شارێکی گەورەیە لە دەشتایەکە و قەڵایەکی گەورەی تێدایە لەو قەڵایەش بەقوڵایی خەندەقێکی گەورەی تێدایە قەڵایەکە دەکەوێتە لایەکی شارەکە.[2] بەپێی ئەو وەسفەی یاقوتی حەمەوی خەڵکەکەی هەولیر سودێکی زۆریان لەو ڕێگا قوڵە بینیوە کە لەسەروی قەڵاکەوە بۆ خوارەوە هەڵکەندراوە، بەتایبەتی لەکاتی گەمارۆدانی شارەکە، خەڵکە کە لەڕێی ئەو خەندەقەوە توانیویانە بگەنە دەرەوەی شارەکە واتە پشتی ئەو سوپایەی گەمارۆی داون.

---

(١) الأنفال: ٢٥.

(٢) معجم البلدان (١/ ١٣٨).

# گەمارۆدانی شاری هەولێر
# ساڵی (٦٣٤) کۆچی

لەحەفدەی مانگی شەوالی ساڵی (٦٣٤) هەواڵ دەگاتە بەغدا، کە سوپای مەغۆل گەمارۆی شاری هەولێری داوە، خەڵکی شارەکە چونە سەر قەڵایەکەو خۆیان قایم کرد، لە (٢٠)ی هەمان مانگ هێزێکی سێ هەزار کەسەی بەسەرپەرشتی شمس الدين اصلان تكين الناصرى بەرەو هەولێر کەوتە ڕێ، لەدوای ئەو هێزەش، ابن كر الاربيلي و مجاهد الدين أيبك الدويدار ئەوانیش بەهێزێکی بچوکەوە بەرەو هەولێر کەوتنە ڕێ، لەدوای ئەوان (شرف الدين الشرابي) ئەویش بەرەو هەولێر کەوتە ڕێ، لەبەغداش زاناو شەرعناسەکان کۆبونەوەو فەتوایان دا کەس ئەو ساڵ نەچێتە حەج لەبەرئەوەی لەوکاتە جیهاد فەرز ترە لەحەج، چەند سەربازگەیەکیان کردەوە مامۆستایانی ئاینی مەشق پێکران بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی هێزی مەغۆل، تا ئەو هێزانە دەگەنە هانای خەڵکی هەولیر، مەغۆلەکان دەتوانن دیواری شارەکە بشکێنن و دەگەنە ناو شاری هەولێر، خەڵکەکە زۆربەیان ڕوویان کردبوە سەرقەڵاکە، مەغۆلەکان مەنجەنیقیان دانابوو هەولێر یان پێ بەرد باران دەکرد، خەڵکێکی زۆر شەهید کران،

کەمــی خــۆراك وئــاویش زیــاتر خەڵــکەکەی شــەکەت کــردو بەتەمەن و نەخۆشێکی زۆریش بەهۆی نەبونی ئاو و خۆراك وەفاتیان کرد، ژمارەی ئەوانەی وەفاتیان کرد ئەوەندە زۆر بوو، نەتوانرا هەمویان لەسەر قەڵا بنێژن، بۆیە فەتوایاندا جەنازەکان بسوتێنن، جەنازەیەکی زۆر سوتێنرا، بەڵام قەڵاکە تەسـلیم بە مەغۆلەکـان نەکـرا، بدرالـدین لؤلـؤ خـاوەنی موصـڵ چەك و یـارمەتی دەنـارد بـۆ هیزەکـانی مەغـۆل، بـۆ ئەوەی بتـوانن لەگەمـارۆی هەولێـر سـەرکەوتوبن، لەکتێبـی (الفخـری لـلاداب السـلطانیة) لاپەڕە ٤٧ داهاتوە: خەلیفە موستەعصیم یەکێك بووە لەو خەلیفانەی نوقمی ڕابواردن و گـۆرانی ببـوو، دەورو بەرەکەشـی هەمـوی لەوجـۆرە بـوون، بۆنمـونە ئەو کـاتەی هێزەکـانی مەغـۆل گەمـارۆی شـاری هەولێریـان دابـوو، نـوێنەری خەلیفە هاتبوە موصل و بە (بەدرەدین)ی گوت خەلیفە داوای کردوە چەند گـۆرانی بێژێـك بـۆ بەغـدا بنێری، هەر لەهەمـان کاتـدا نـوێنەری هۆلاکـۆ هاتبوو داوای لە (بەدرەدین) دەکرد کە مەنجەنیق و چەکی بۆ بنێری بۆ گرتنـی شـاری هەولێر، دوای ئەوەی زیـانێکی زۆر بەشاری هەولێر کەوت مەغۆلەکان نەیانتوانی هەولێر بگرن و گەڕانەوە بنەکەکانی خۆیان.

# ململانێی نێوان سەلجوقی و ئەییوبییەکان

سەرەتا گرنگە بزانێن سەلجوقییە ڕۆمییەکان کێین؟

دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتە کەسێك بوو بەناوی (سلێمان کوڕی قتلمش) کە لە ساڵی (٤٧٩) کۆچی دەکوژرێ، لەساڵی (٤٧٠) ئەو دەوڵەتەی دامەزارند، ئەو کەسە یەکێك بوو لەسەرکردەکانی دەوڵەتی سەلجوقی، دواتر دەتوانێ لەناوچەی (اسیا الصغری) کە ئەنازۆرلێشی پێدەگوترێ، کە دەکاتە تورکیای ئێستا لەو شوێنە دەتوانێ دەوڵەتێکی بچوك دابمەزرێنێ و دواتر سنوری ئەو دەوڵەتە فراوان دەبێ تاوەکو دەگاتە سەر دەریای (ئیجە) لە ڕۆژهەڵاتیشەوە دەگاتە نزیك سنوری جۆرجیای ئێستا، سەلجوقییە ڕۆمییەکان و ئەییوبییەکان هەروەکو باسمانکرد، بەرەیەکیان پێکهێناو توانیان سوپای خەواریزمییەکان بشکێنن، دوای کوژرانی جلال الدین منکبرتی خەواریزمییەکان لەوناوچەیە دەمێننەوە پەرت دەبن و بێ خاوەنی ئەو ناوچەیە دەقۆزنەوە، سوڵتان کەی قباذی سەلجوقی دەتوانێ سودیان لێوەرگرێ بۆ پارستنی سنوری دەوڵەتەکەی، مەغۆلەکانیش لەو لاوە بەبێ ئەوەی هیچ بەربەستێکیان لەبەردەم بێ و توانیان جۆرجیای ئێستا و ئەرمینیا و ئازەربایجان بەتەواوی کۆنترۆل بکەن و ئینجا چاویان بڕیە

دەوڵەتی سەلجوقە ڕۆمییەکان و هێرشێکیان کردە سەر شاری (سیواس) کەئێستا ناوی (Sivas)ەو دەکەوێتە نزیك ئەنقەرە، ئەو کات سوڵتان (کەی قباذ)ی سەلجوقی فەرمان دەکاتە یەکێك لەسەرکردە سەربازییەکانی بەناوی کمال الدین کامیار، بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی سوپاکەی مەغۆل، کمال الدین بەسوپایەك گەیشتە شاری (سیواس) بەلاّم، مەغۆلەکان ئەو شارەیان جێهێشتبوو، گەڕابوونەوە ئەرمینیا، ئەو بێ خاوەنیەی ئەنادۆڵی گرتبوەوە جێی نیگەرانی دەوڵەتی سەلجوقییەکان بوو، بەتایبەت مەلیك ئەشرەف بەچەند کێشەیەکی ناوخۆیی بنەماڵەی ئەییوبییەکان خەریك بوو، ئاگای لەو سنورە نەمابوو کەتا خیلات هەر هەموی سەر بە دەسەلاّتی ئەییوبییەکان بوو، بۆیە سەلجوقییەکان سوپایەکی گەورەیان ئامادەکرد ڕەوانی ئەو ناوچەیان کرد، لەماوەیەکی کەم توانیان خیلات و بەدلیس و تەفلیس بخەنە ژێر دەسەلاّتی خۆیان، ئینجا (کەی قباذ)ی سەلجوقی چەند ناوچەیەکی دابەشکرد بەسەر خەواریزمییەکان، توانی سود لە خەواریزمییەکان وەرگرێ، بۆ پاراستنی سنوری دەوڵەتەکەی بەکاریان بێنێ، ئەو هەنگاوانەی سوڵتانی سەلجوقی بوە جێی نیگەرانی ئەییوبییەکان، بۆیە مەلیك کامیلی ئەییوبی لەمیسرەوە بەڕێ کەوت و پاداشاکانی بنەماڵەی ئەییوبی لەشام و ناوچەی جەزیرە کۆکردەوەو بۆ ڕوو بە ڕوو بونەوەی هێزی سەلجوقییەکان، مەلیك کامیل توانی نزیکەی شازدە پادشای ناوچەکە کۆبکاتەوە، مەلیك کامل لەڕێگا دەڵێ: ئەگەر مولْکی

ڕۆممان بکەوێتە بەردەست و لەو شەڕە سەرکەوین ئەو کات شام دەلکێنین بەمیسرو لەبری شام مەملەکەتی سەلجوقییەکان تەسلیم بە پادشاکانی شام دەکەین، ئەو قسەیە دەگاتە مەلیك ئەشرەف و پێی دەڵێن مەلیك کامیل بەنیازە شام لە ئێمە بسەنێتەوە، بۆیە ئیختلافێکی زۆر گەورە دەکەوێتە نێو بنەماڵەی ئەییوبییەکان و مەلیك ئەشرەف و چەند مەلیکێکی تر لەو بەرەیە دەکشێنەوە، ئەوە هۆکارێکی سەرەکی بوو کە هێزی ئەیبوبیەکان نەتوانن ڕوو بەڕوی سەلجوقییە ڕۆمییەکان ببنەوە، مەلیك کامیل لەنزیك (دیار بکر) توشی شکەستێکی گەورە دەبێ و هێزی سەلجوقییەکان دەتوانن (حران) و دەورو بەری داگیربکەن، هێزی ئەییوبییەکان دەگەڕێتەوە شام، ئەو ڕووداوانە لەساڵی (٦٣١) کۆچی دەبێ، دوو ساڵ دوای ئەوە واتە لەساڵی (٦٣٣) ئەییوبییەکان دیسان دەگەڕینەوە ناوچەکە وئەو جارەی مەلیك کامیل دەتوانێ ئەو ناوچانە بگێریتەوەو زۆرێك لەسەرکردەکانی سەلجوقی بەدیل دەگیرێن و دەیانباتە میسر، ناوچەکە بەو شێوەیە دەمێنێ و هەر جارەو دەکەوێتە دەست هێزێك خەواریزمییەکانیش چەند گروپ و جەماعەتێك پێك دێنن دەبنە سەرچاوەی ئاژاوە لەناوچەکە.(١) هەر لەساڵی (٦٣٣) بدرالدین لؤلؤ نامەیەك دەنێرێ بۆ مەلیك ئەشرەف و پێی دەڵێ: تەتارەکان گەیشتونەتە سنوری سنجار و خەڵکێکی زۆریان لەوێیا کوشتوە،

(١) تاريخ سلاجقة الروم فى اسيا الوسطى، لاپەڕە ٢٧٣. محمد سهيل طقوش.

مەلیك ئەشرەف سوپایەك ئامادە دەكاو تەتارەكان دەگەڕێنەوە.[1] لەساڵی (٦٣٤) تەتارەكان دەگەنە هەولێر و داگیر دەكەن و خەڵكێكی زۆر لەشاری هەولێر دەكوژن دواتر هەولێر بەجێدەهێڵن، ئەو هێرشە پچر پچرانەی تەتار بۆ سەر ناوچەكە هەر هەمووی بۆ زانینی توانای سەربازی ناوچەكەیە دواتر هەواڵ دەنێرن بۆ سەركردەكانی خۆیان كە ڕێگای بەغدا والآیە و ئینجا بەهێزێكی گەورە بەرەو بەغدا دەكەونەڕێ، لەساڵی (٦٣٥) مەلیك ئەشرەف وەفات دەكاو مەلیك كامیل یش خاونی میسرڕبەچەند مانگێك هەر لەهەمان ساڵ وەفات دەكا، مردنی ئەو دوو مەلیكە و ئەو فەڕاغەی ئەوان بەجێیان هێشت بە كوڕەكانیان پڕ نەكرایەوە، بۆیە دەتوانین بڵێین بەمردنی ئەو دووە سەرەتای كۆتایی حوكمی بنەماڵەی ئەییوبییەكان دەستی پێكرد، سەبارەت بە سەلجوقییەكان یش ئەو كات سوڵتانی سەلجوقییەكان كەسێك بوو بەناوی (كەیخوسرەوی دووەم) ئەو سوڵتانە بێ خاوەنی ناوچەكەی قۆزتەوەو هێزەكانی گەیشتە ناوچەی ئامەد و دیاربەكرو بەوەش دەوڵەتی سەلجوقی لەناوچەكە بوو بەهێزترین دەوڵەت و لەشاری دیمەشق لە وتاری هەینی دوعا بۆ (كەیخوسرەوی دووەمی) سەلجوقی دەكرا، ئالەو كاتە نامەی خەلیفە لەبەغداوە دەگاتە هەموو ئەو لایەنانەی لەو ناوچەیە ناكۆكن و داوای تەباییان لێدەكات پێیان دەڵێ: كە مەغۆل لەسنورەكە زۆر هاتونەتە پێش و ئێستا هەڕەشەی گرتنی بەغدا دەكەن. خەواریزمییەكانیش زیاتر

(١) النجوم الزاهرة، لاپەڕە ٢٩٦ بەرگی ٦.

ناوچەکەیـان ویـران کردبــوو لەکتێبــی النجــوم الزاهــرة دا هــاتوە: واما الخوارزمیية فانهم تغلبوا علی عده قلاع وعـاثوا وخربوا البلاد وكانوا شرا مـن التتـار لايعفـون عـن قتـل ولا عـن سبی ولا فـی قلـوبهم رحمـة.[١] خەواریزمییەکان چەند قەڵایەکیان لەناوچەکە داگیر کرد و ئەو ناوچەیەیان کـاوڵکرد و لە تەتارەکـان خراپتـر بـوون، دەسـتیان نەدەپاڕاسـت لە کوشـتن و ڕفاندنی ئافرەت، هیچ سۆزێکیان لەدڵ نەبوو.

## شەڕی (کوسی داغ) ساڵی (٦٤١)کۆچی نێوان مەغۆڵ و سەلجوقییەکان[*]

لەسـاڵی (٦٤٠) سـوپای مەغۆڵەکـان بەسـەرکردایەتی (بـایجۆ نـوین) هێرشـیان کـردە سـەر شـاری (ارزن روم) ئەرزەروم، بـۆ مـاوەی دوو مـانگی ڕێـك گەمـارۆی ئەو شـارەیان دا، لەو دوو مـانگە بەردەوام شـارەکەیان بە مەنجەنیـق بۆردومـان کـرد، سـەلجوقییەکان لەو شـارە سـەرەتا توانیـان زۆر دلێـرانە بەرەنگـاری هێرشـەکەی مەغـۆل ببـنەوە، سـوپای سـەلجوقییەکان بەسەرپەرشـتی کەسـێك بـوو بەنـاوی (سـنان الـدین یـاقوت)، هێـزی سـەلجوقییەکان دەچێـتە دەرەوەی شـارەکەو دەتـوانێ هێرشـی مەغۆلەکـان ڕابگـرێ کە نـزیکەی سـی هەزار کەس بـوون، لەو کـاتیش بـارانێکی زۆر

(١)النجوم الزاهرة، بەرگی ٦ لاپەڕە ٣٢١. جمال الدين ابی المحاسن يوسف بن تغری بردی الاتابكی ٨١٣-٨٧٤.
(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ١٢.

باری کەش و هەوایەکە لەبەرژەوەندی سەلجوقییەکان بوو، دواتر بەخیانەت ئەو شارە تەسلیم بە مەغۆلەکان دەکرێ و هێزی مەغۆلەکان دەگاتە نێو شارەکە، خەڵکی شارەکە لە گەرەك و سوچەو کۆڵانەکان بەرەنگاری هێزەکانی مەغۆل دەبنەوە، بەڵام دەرەنجام مەغۆلەکان شارەکە دەگرن و قەتلوعامی خەڵکی شارەکە دەکەن، سنان الدین یاقوت و کوڕەکەی بەدیل دەگیرێن و هەردوکیان لەگەردەنیان دەدرێ. دوای کاولکردنی تەواوی شارەکە و کوشتنی خەڵکەکە سوپاکەی مەغۆل دەگەڕێنەوە دەشتی (مۆقان) لە ئازەربایجان کە بنکەی سەرەکی هێزەکانی مەغۆل لەو دەشتە بو.[1]

لەکاتی بیستنی هێرشی مەغۆلەکان بۆسەر شارەکە سوڵتان (کەیخوسرەوی دوو) سوپایەکی نارد بۆ یارمەتی شارەکە، بەڵام بەدرەنگەوە گەیشتنە (ارزنجان)ی نزیك ئەرزەڕۆم، هەواڵی کەوتنی شارەکەیان پێگەیشت و هێزەکە گەڕایەوە شوێنی خۆی، سوڵتان (کەیخوسرەو) کە بەوەی زانی داوای کۆبونەوەی کرد لەتەواوی سەرکردە سەربازی و پیاوە گەورەکانی دەوڵەتی سەلجوقی، لەکۆبوونەوەکە بڕیار لەسەر دوو خاڵ درا.

یەکەم: سوڵتان نامەیەکی هەڕەشە ئامێزی بۆ (بایجۆنوین)ی سەرکردەی مەغۆل نارد.

(١) تاریخ سلاجقة الروم، لاپەڕە ٢٨٤ .

دووەم: نــامەی بــۆ تەواوی پادشــاکانی نــاوچەی جەزیــرە و حەلەب و ئەرمینیا ناردو، پێیڕاگەیاندن کە کاتی ئەوە هاتوە ئێمە ناکۆکی نێوانمان لەیاد کەین، لەبەر ئەوەی دوژمنێك کەخاوەن هێزێکی گەورەی کاوڵکارە چاوی بڕیوەتە مەملەکەتی ئێمە، بۆیە داوای لێبوردنی لە مزەفەرغازی کرد کە خاوەنی (مەیافارقین) بوو، وەشاری (خیلات)ی بۆ گێرایەوە، کە پێشتر هێزەکانی سەلجوقی داگیریان کردبوو، هەروەها پارەیەکی زۆریشی نارد بۆ ئەرمینیا و حەلەب و داوای لێکردن سوپا ئامادە بکەن و ڕەوانەی ناوچەکە بکەن، سەلجوقییەکان توانیان سوپایەك ئامادە بکەن ژمارەی گەیشــتە نــزیکەی (٨٠) هەزار کەس، ئەو ســوپایە چەنــد پێکهــاتەیەکی جــودای لەخــۆ گرتبــوو (ئەرمەن و، خەواریــزم و، کــورد و، عەرەب و، یونانییەکان و، میسرییەکان) ئینجا ئەو سوپایە بەڕێکەوت تا گەیشتە نزیك شــاخی (کوســی داغ، الجبــل الاقــرع)[*] شــاخە ڕووتە، مەغۆلەکــانیش ســوپایەکی گەورەیــان پێکهێنــا نــزیکەی ســی هەزار کەس دەبــوون، خۆبەخشێکی زۆریش لە کورجەکان واتە خەڵکی جۆرجیاو ئەرمەنییەکان چونە ڕیز سوپاکەی مەغۆل، سەرەتا سوڵتانی سەلجوقی پێی چاك بوو ئەو سوپایە لەنزیك شاری (سیواس، sivac) جێگیر بێ، بەڵام گەنجێکی زۆر فشاریان خستە سەر سوڵتان و داوایان کرد زوو ڕووبەڕووی سوپای مەغۆل ببنەوەو تۆڵەی تاوانەکانیان لێبکەنەوە، لەبن فشاری ئەو گەنجانە سوپاکە

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ١٣.

بەڕێ کەوت تا گەیشتە شاخە ڕووتە کە دەکەوێتە نێوان شاری ئەرزەڕوم و ئەرزنجان، هێزی مەغۆلەکانیش گەیشتنە ناوچەکە و بەرامبەر بە هێزی سەلجوقییەکان وەستان، هەر لەسەرتاوە خاڵی لاوازی سەلجوقییەکان بەدەرکەوت، کە بریتی بوو لەلاوازی سەنتەری بڕیار، بەتایبەت ئەو بەشەی کە گەنجەکان پێکیان هێنابوو بەسەرکردایەتی کەسێك بەناوی (نظام الدین سهراب) ئەو سەرکردەیە بەپێی ئەو پلانە دەڕۆیی کە خۆی بۆخۆی دانابوو نەك ئەو پلانەی کە تەواوی سوپاکە لەسەری دەڕۆن بۆیە سەرەتای دەرچون لەسەنتەری بڕیار لەو کەسەوە دەستی پێکرد، ئەوانە هێرشیان کردە سەر سوپاکەی مەغۆل، مەغۆلەکان لەبەر دەم هێرشەکە کشانەوە، تا وایان زانی شکانی هێزەکانی مەغۆلە، بەڵام نەیان زانی ئەوە بۆسەیەکی گەورە بوو، زۆربەیان کەوتنە نێو بۆسەکەو مەغۆلەکان توانیان زۆربەیان بکوژن و چەند کەسێکی کەم ڕزگاریان بوو، کە بووە هۆی ئەوەی ورەی تەواوی سوپاکە بڕوخێ، بۆیە هێزی شامییەکان بەسەرکردایەتی ناصح الدین الفارسی، لەشەڕەکە کشایەوە، ئینجا یەك بەدوای یەك سەرکردەکان گۆڕەپانی جەنگیان بەجێهێشت و دواتر خودی سوڵتانیش مەیدانەکەی بەجێهێشت و خۆی و دەوروبەرەکەی ڕزگارکردو سوپای سەلجوقییەکان بێ سەرکردایەتی مانەوە و دوچاری شکەستێکی گەورە بوون (بایجو نوین) گەیشتە ئەو ڕەشمالی کەسوڵتانی تێدابوو، هێزەکانی مەغۆل بەوە ندە نەوەستان و نەگەڕانەوە تاوەکو گەیشتنە شاری (سیواس)

قازی ئەو شارە کەناوی (نجم الدين قيرشهرلي) بوو، خەڵکی خەواریزم بوو، کاتی خۆی (نامەی ئەمانی) لە جەنگیزخان وەرگرتبوو، کە هێزەکانی مەغۆل گەیشتنە ئەو شارە ئەو پیاوە نامەکەی جەنگیزخانی بردوو، چوە لای (بایجو نوین) ئەویش کە چاوی بەنامەکە کەوت ئەمانی بەخەڵکی شارەکە دا، بەو مەرجەی دەرگای شارەکە بەکراوەیی بمێنێتەوە و هەرکاتێك مەغۆلەکان ویستیان بەبێ کێشە بگەنە ناو شارەکە، ئینجا بەو شێوەیە (سیواس) تەسلیم بەمەغۆل دەبێ، دواتر شاری (قەیصەریە) دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان دواتر یەك بەیەکی شارەکانی ئەنازۆل دەکەون وەکو شاری (خیلات و، مەیافارقین و، ڕوهاو، ئامەد و، تا دەگەنە سنوری شام)، شکەستی سەلجوقییەکان شکستێکی زۆر گەورە بوو بۆ تەواوی ناوچەکە، مەغۆلەکان لە بوخاراو سەمەرقەند و خەواریزم ئێران و ئازەربایجان و ئەرمینیاو جۆرجیا و ئەنادۆڵ هیچ هێزێکیان لەبەر دەم نەما شایستەی باس کردن بێ بەوەش ڕۆژ هەڵات و باکوری خیلافەی ئیسلامی بەتەواوی کەوتە دەست مەغۆل، دوای ئەوە قۆناغی چون بەرەو پایتەختی خیلافەت دەستپێدەکا.[(١)]

ئەوە وێنە گەورەکەیە، واتە کەوتنی تەواوی خۆرهەڵات و باکوری خیلافەتی ئیسلامی، بەڵام بەداخەوە تا ئەوساڵەش نەخەلیفە لەبەغدا نە

---

(١) ابن بيبى، لاپەڕە ٢٤١، تاريخ سلاجقة الروم، لاپەڕە ٢٨٨.تاريخ مجموع النوادر، لاپەڕە ٩٢. جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٦١.

پادشـاکانی تـری جیهـانی ئیسـلامی، بەخـۆ نەهـاتونەتەوە بگـرە زۆر شـوێن کەوتــوەتە دەســت مەغــۆل شــوێنەکەی تــر پێــی خــۆش بــووە لەبەر ئەوەی ململانــێ لە نێـوان هەردوو پادشـا داهەبـووە، ئەوەی مـاوەتەوە تەنهـا چەنـد هێزێکی بچوك بووینەو لەتوانای ئەوان نەبووە شەپۆلی مەغۆل ڕابگرن.

# ساڵی (٦٤٠) مردنی خەلیفە (المستنصربالله) و هاتنی خەلیفە (المسعتصم بالله)، دوا خەلیفەی عەبباسییەکانە

لەساڵی (٦٤٠) خەلیفە المستنصر باللە وەفات دەکا، ئەو خەلیفەیە نزیکەی (١٦ ساڵ و ١٠ مانگ) حوکمی کرد و لەتەمەنی (٥١) ساڵی وەفاتی کردوە، کابرایەکی سەخی تەبیعات بووە، بۆیە کاتی خۆی باپیری خەلیفە ناصرِ چاڵێکی هەڵکەندبوو لەباخچەی ماڵەکەی پڕی ئاڵتونی کردبوو زۆر جار لە قەراغی چاڵەکە دەوەستاو دەیگوت توو بڵێی تەمەن بکەم تا بەتەواوی ئەو چاڵە پڕ ئاڵتون بکەم، دواتر خەلیفە المستنصر دەهاتە سەر چاڵەکەو دەیگوت توو بڵێی تەمەن بکەم تا تەوای ئەو ئاڵتونە خەرج بکەم. خەلیفە (المستنصر) یەکێك لە کارەکانی دروستکردنی قوتابخانەی مستەنصریە بوو، کە بەدەستکەوتێکی گەورەی ئەو کات دادەنرا، پێشتر لەشێوەی ئەو زانکۆ گەورەیە دروست نەکرابوو، بەشی بۆ هەر چوار مەزهەب کردبووەوە، جگە لەزانستی شەریعە دەرمانزاسی و پزیشکیشی تێدا دەخوێنرا، ئینجا لە مانگی ڕەمەزان هەر گەڕەکێك لە گەرەکەکانی بەغدا چێشتخانەیەکی تایبەتی خۆی هەبوو هەژارەکانی ئەو

گەڕەکە لەو چێشتخانەیە نانیان پێدەدرا، دەگێڕنەوە کەجارەکیان خەلیفە لەمانگی ڕەمەزان و بەر لە فتارکردنەوە، لەگەڕەکێکی بەغدا دەگەڕا، بینی پیاوێکی بەتەمەن لە چێشتخانەی گەرەکێکی تر خواردن دێنێ و نا چێتە چێشتخانەی گەرەکەکەی خۆی، خەلیفەش پرسیاری لێدەکات و دەڵێ: لەبەر چی خواردن لەچێشتخانەی گەرەکی خۆت وەرناگری؟ پیاوەکەش نازانێ ئەوە خەلیفەیە دەڵێ: من کابرایەکی هەبوو بووم و دواتر بارو دۆخێکم بەسەر هات هیچم نەما، ئێستا پێم شەرمە خەڵکی گەڕەك بمبینن لەوچێشتخانەیە خواردن دەخۆم و دەستی کردە گریان، خەلیفە سکی پێدەسوتێ و (١٠٠٠) دیناری پێدەدا، دوای چەند ڕۆژێك خەبەری مردنی ئەو پیاوە بۆ خەلیفە دێننەوەو پیاوێکی بێ کەس بووەو لەو (١٠٠٠) دینارە تەنها یەك دیناری خەرج کردوە و هیچ میراتگری نەبووە، خەلیفە فەرمان دەکات پارەکەی بۆ بکرێتە صەدەقە و بەسەر خەڵکی هەژاری گەرەکەکەی دابەشبکرێ.[١] بەهەر حاڵ ئیمام ابن کثیر و زۆربەی مێژوونوسان دەڵێن پیاوەکی چاك بووە، دەکرێ وەکو خێرخوازێك کاری چاکی کردبێ، بەڵام لەتەمەنی حوکمی خاوەنی هیچ پڕۆژەیەك نەبووە بۆ ڕاگرتنی شەپۆڵی تەتارەکان و لادانی ئەو ترسە گەورەیە کە هەڕەشەی لەتەواوی جیهانی ئیسلامی کردوە، ئەوکاتەی (المستعصم بالله) کوڕی دەبێتە خەلیفە دێتە

---

(١) البداية والنهاية، بەرگی ١٥ لاپەڕە٢٣٧.

سەر موڵکێکی وێرانی کاوڵکراو، هەروەکو باسمان کرد تەواوی ڕۆژهەڵات و باکوری خیلافەتی ئیسلامی کەوتبوە دەست مەغۆلەکان.

## خاڵێکی گرنگ با ئاماژەی پێبکەین

لەکتێبی(مفرج الکروب) فی أخبار بنی أیوب بەرگی پێنجەم لاپەڕە ٣٢٤ (ابن واصل) ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرمێ: لەساڵی (٦٤١) مەلیك مزەفەر خاوەنی شاری (حەما) قازی (شهاب الدین)ی نارد بۆ لای خەلیفە مستەعصیەم بۆ پیرۆزبایی بەبۆنەی خەلیفایەتی، هەرەوەها سەرەخۆشیشی لێبکات بەبۆنەی وەفاتی باوکی، ئینجا دەفەرمێ داوای لەمنیش کرد لەگەڵ ئەو وەفدە بچمە لای خەلیفە، دەڵێ ئەو کاتەی ئێمە گەیشتینە (رأس العین) کە دەکەوێتە شاری (حەسەکە)ی سوریای ئێستا: لەوێ بیستمان کە تەتارەکان هێرشیان کردۆتە سەر وڵاتی ڕۆم کەمەبەست (ڕۆمە سەلجوقییەکانە)، ئینجا دەفەرمێ کە گەیشتینە ماردین و دواتر گەیشتینە شاری (نوصەیبین)، ئەو شارە کەوتبوە بەردەستی خەواریزمییەکان و خەواریزمییەکان دەیانگوت: ئێمە لەژێر تاعەت و گوێڕایەڵی مەلیك صالح نەجمەدین خاوەنی (میسر) داین، دەڵێ: لەوێوە چوینە موصل لەموصل وەفدی خەلیفەمان بینی بەسەرپەرشتی (محی

الدين بن الجوزی ).[١] بەرەو سەلجوقییە ڕۆمییەکان کەوتبونە ڕێ، ئینجا ئەوەی گرنگە ئەلێرە ئاماژەی پێبکەین (ابن واصل) دەڵێ: خاوەنی موصڵ (بدرالدين لؤلؤ) خاوەن پەیمان بوو لەگەڵ مەغۆلەکان لەگوێڕایەڵی ئەوان بوو، نامەیان لە نێواندا هەبوو و دیاری بۆ دەناردن، واتە یەکێك لە گەورە سەرکردەکان ئاوا بەئاشکرا لەدەسەڵاتی خەلیفەی عەبباسی دەرچوەو چۆتە ژێر گوێڕایەڵی (هۆلاکو) کەچی خەلیفە لە بەغداوە هیچی بۆ ناکرێ، ئەوە زەنگێکی زۆر ترسناك بووە بۆ بەغدا، بەڵام نە خیلافە نەجیهانی ئیسلامی ئەوکات بەداخەوە هیچ خەمخۆرێکی نەبووە، ئەوەی کار بەدەست بووە خەمخۆر نەبووە ئەوەی خەمخۆریش بووە هیچی بەدەست نەبوە بۆیە کەسێکی وەکو ئیمام (ابن الاثیر). کەدەیفەرموو: خوای گەورە ئیسلام و موسڵمانان سەرخا، ئەوەندەی لێی وورد بومەتەوە، پادشاکانی ئیسلام هیچ نیەتی جیهادو سەرخستنی دینیان نییە، هەریەك لەوانە خەریکی هەوەس و خۆشگوزەرانی خۆیەتی و خەریکی ستەمکردنن لە خەڵکی ژێر دەستیان، ئەوەش لای من ترسناکترە لەدوژمن خوای گەورە دەفەرمێ: (وَاتَّقُوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِنْكُمْ خَاصَّةً)[٢].[٣]

---

(١) تێبینی: محی الدين بن الجوزی کوڕی ئیمام ابو الفرج ابن الجوزيه لەساڵی (٦٥٦) دەکەوێتە دەست تەتارەکان و بەفەرمانی هۆلاکۆ خۆی و چەند گەورە پیاوێکی خەلیفە لە گەردەنیان دەدرێ.

(٢) الأنفال: ٢٥.

(٣)الکامل في التاريخ (١٠/ ٤٤٧).

# تەسلیم کردنی قودس بە سەڵیبییەکان و (جەنگی غەززە)

لەکاتێکدا تەتارەکان وردە وردە لە بەغدا نزیک دەبنەوە، زۆرێك لەپادشاو مەلیکەکانی ناوچەکە خەریکی دووبەرەکی بوون، بۆسەرخستنی هەوەس و ڕقی خۆیان کاری ئاوایان ئەنجامداوە، کەدەبێ قسە لەسەر ئەوەبکرێ بەو کارانە تا چەند پەیوەندیان بەئیسلامەوە ماوە، ئاخۆ دەبێ چ هۆکارێك بەرەو ئەوەت ببا، قیبلەی یەکەمی موسڵمانان تەسلیم بە نەسرانییەکان بکەی؟ کورسی و دەسەڵات و ململانێ و ناکۆکی ئەوە دەهێنێ ئەوخیانەتە لەگەڵ دینەکەت بکەی؟ بێ گومان نەخێر، هاتنی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی چەندە ترسناك و زیان بەخش بوو، بونی ئەو پادشایانەش لە سەر تەختی حوکم بەقەد ئەوان زیان بەخش بوون.

لەساڵی (٦٤١) کۆچی مەلیك صالح خاوەنی دیمەش و مەلیك مەنصور خاوەنی حمص و مەلیك ناصرِ خاوەنی (کەرِك) کەدەکەوێتە ئەردەنی ئیستا هەر سێکیان لەگەڵ سەڵیبییەکان پێکهاتن لەسەر ئەوەی قودس و تەبەرِیە (طبریة) و عەسقەلان تەسلیم بەسەڵیبییەکان بکەن، بەو مەرجەی سەلیبییەکان یارمەتی ئەوانە بدەن بۆ شکانی هێزی مەلیك صالح

نەجمەدیـن خـاوەنی میسـڕ، مەلیـك صـالح خـاوەنی میسـڕ کە بەو بەرەیە دەزانـیێ، بەرەی (نەسـڕانی و ئەو دینفرۆشانە)، ئەویـش هەسـتا بەناچـاری پەیوەنـدی کـرد بەو هێـزە خەواریزمییـانەی لەنـاوچەکە مـابوونەوە، هەمـوو ئەوانەی کۆکردەوە و سوپاییێکی گەورەی پێکهێنـاو کەوتە ڕێ بۆ ڕووبەڕوو بـوونەوەی بەرەی سـەلیبی و پادشـا خائینەکـان، ئەوەبـوو قـودس تەسـلیم بەسەڵیبییەکان کرا (ولا حول ولاقوة الا بالله)، ئینجا سوپای سەڵیبییەکان هـاتنە نێـو قـودس و لەسـەر بەردەکە دەسـتیان کـرد بەعەرەق خـواردنەوە، فەسادێکی زۆریان بڵاو کردەوە، ئەو پادشا دینفرۆشانە بەڵێنی ئەوەشیان بە صـەلەیبییەکان دا ئەگەر هـات و سـوپای مەلیـك صـالح خـاوەنی میسـڕ شـکێنرا و میسـڕیان گـرت، وەعـد بـێ بەشـێکی زۆرتـان لەخـاکی میسـڕ تەسلیم بکەیـن، (ابـن واصـل) خاوەنی کتێبی (مفـرج الكـروب) دەفەرمـێ: لەکۆتـایی ئەوسـاڵە (٦٤١کـۆچی) لەشـامەوە بەڕێ کەوتـم بـۆ میسـڕ، کەگەیشتمە قودس بەچاوی خۆم بینیم قەشەکان لەسەر بەردەکەی (بيت المقدس) کۆببونەوەو شوشەی مەی و عەرەقی لەسەر بوو، ئینجا چومە مزگەوتی بیت المقدس بانگدان ڕاگیرابوو و کەس نەیدەتوانی بانگبدا و کـوفری تێـدا ئـیعلان کرابـوو، کەگەیشـتمە غەززە سـوپای ئەو پادشـایانەو سوپای سەڵیبییەکانم بینی خۆیـان ئامـادە دەکـرد بۆ گرتنـی میسڕ، دوای ئەوەی خـاوەنی میسـڕنامەی بـۆ خەواریزمییەکـان نـارد و داوای لێکـردن پشتیوانی سوپای میسڕبکەن، بۆ لێدان و شکاندنی بەرەی کوفر، سـوپای

خەواریزمییەکان بەسەرکردایەتی (حسام الدین برکەخان) و (خان بردی)و (صاروخان) و (کشلوخان) نزیکەی دە هەزار کەس دەبوون، خەڵکێکی زۆریشیان بەگەر کەوت و کەوتنە ڕێ بۆ پشتیوانی سوپای میسر، بەڵام بەداخەوە سوپای خەواریزمییەکان لەڕێگا بگەیشتبانە هەر ئاوەدانییەك کاوڵیان دەکرد، مەلیکە دینفرۆشەکان کەبەهاتنی خەواریزمییەکانیان زانی، لەبەرەکە کشانەوەو، سەڵیبییەکانیان بەتەنها بەجێهێشت، و مەیدانی جەنگیان چۆڵکرد، سوپای خەواریزمییەکان گەیشتنە قودس و قودسیان ئازاد کرد و هەر نەصرانێك هەبوو لەوشارە کوشتیان هەتا گۆڕەکانیشیان هەڵتەکاندو ئێسك و پروسکی نەسڕانییەکانیان سوتاند، ئینجا گەیشتنە (غەززە) لەو لاوەش سوپای میسرییەکان بەسەر پەرشتی کەسێك بەناوی (رکن الدین بێبرس) بوو، بەڵام ئەوە ئەو کەسە نییە کەدواتر شەڕی (عین جالوت) دەکا، ئینجا مەلیکی دیمەشق و مەلیکی کەرك دیسان سوپاکانیان ڕێك دەخەنەوەو لەگەڵ سەڵیبییەکان، لە (غەززە) ڕوو بەڕووی سوپای میسرییەکان دەبنەوە خوای گەورە موسڵمانان سەردەخات و لەگەڵ شکانی هێزەکانی ئەو بەرەیەخاچپەرستەکان، بەر لەوە خۆیان لە ناو بچن، بەشێکی زۆری سوپای (دیمەشق و کەرك) دەکوژن، سبحان اللە زۆر سەیرە دووبەرەکی بگاتە ئەو ئاستەی، بچیتە ژێر ئاڵای صەلیب بۆلەناوبردنی ناحەزەکەت کەبرای دینیتەو هێرش بکەیتە سەر وڵاتی موسڵمانان بەهاوپەیمانی سەڵیبییەکان، ئەوە سەرشۆڕی دونیایە بەر لەسەر شۆڕی و

دۆڕانــــدنی قیــــامەت، لەو شــــەڕە خەواریزمییەکــــان دەوری هێــــزی سەڵیبییەکانیان داو، زۆربەی هەرە زۆری سەڵیبییەکان کوژران و قودس بۆ جارێکی تر گەراوە بەردەستی موسڵمانان.[1] جەنگی غەززە گەورەترین زیانی بە خاچپەرستەکان گەیاند و دەتوانین بڵێن لە دوای شەڕی حەتین(٥٨٣) کۆچی زیانی ئاوا گەورە بە خاچپەرستەکان نەکەوتبوو.

(١) مفرج الكروب، بەرگی ٦ لاپەڕە ٣٦٢. النجوم الزاهرة، بەرگی ٦ لاپەڕە ٣٢٣.

# هێرشی حەوتەمی خاچپەرستەکان
# ساڵی (٦٤٧) کۆچی

لەو کاتەی خۆرهەڵاتی جیهانی ئیسلامی کەوتبوە بەرشاڵاوی هێرشی مەغۆلەکـان، لەهەمـان کاتـدا سـەلیبییەکان بەردەوام بـوون لەپـیلان و هێرشـەکانیان دژ بەخۆرئـاوای جیهـانی ئیسـلامی، سـەلیبییەکان زۆر چـاك دەیانزانی تـا (میسرٍ) بەهێز بێ ناتوانن و ناکرێ (قـودس) داگیر بکەن، بۆیە پاپا (ئەنونستی چوار) پەیوەندی بە (خانی مەغـۆل) دەکا، بۆئەوەی یـارمەتی بـدا، بـۆداگیرکردنی قـودس و تێکشـاندنی هێـزی (میسرٍ) پاپـا ئەنونسـت چـوار نازنـاوی قـدیس دەدا بە مەلیکـی فەرەنسا (لـویس نـۆ) و داوای لێدەکات لەشکرێکی گەورە ئامادە بکات بۆ ڕزگار کردنی (قـودس) لەدەست موسڵمانان، لویسـی چـوار مەلیکـی فەرنسا پیـاوەکی دینـدار بـوو واتە دڵسۆزی نەسرانییەت بوو پێی وابوو ئاینەکەی لەسەری دەکات، کە دەبێ قـودس بگێـڕیتەوە ژێر دەسـەڵاتی نەسرانییەکان، لەبەر ئەوەی ئەوان خۆیـان بەخـاوەنی (قـودس) دەزانـی، بـۆئەو مەبەسـتە سـوپایەکی گەورەی خاچپەرسـتەکان بەرەو ئـازادکردنی قـودس کەوتە ڕێ و سـەرەتا گەیشـتنە (دمیـاط، دومیـات) و ئەو شـارەیان داگیرکـرد دومیـات بەداخەوە هەر بەبیسـتنی هـاتنی ئەو لەشـکرە چـۆڵکرا و خاچپەرسـتەکان بەبـێ شـەڕ

گەیشتنە نێو شارەکە و چەك و تفاقەکی زۆریشیان کەوتە دەست خەڵکی شارەکە بەرەو قاهیرە ڕایانکرد، ڕاکردنی سوپای موسڵمانان لە شاری (دومیات) و بەبێ ئەوەی هیچ شەڕیك بکەن بەخیانەتێکی گەورە لەقەڵەم درا بۆیە هەندێ لەزانایان فەتوایان دا کە دەبێ ئەو سەرکردانەی ڕایانکردوە لە سێدارە بدرێن و هەندێك لەسەرکردەکان بە فەتوای زانایان و بەفەرمانی (مەلیك صالح) لەسێدارە دران[1] ئینجا مەلیکی فەرەنسا (لویس) نامەیەك دەنێرێ بۆ (مەلیك صالح نەجم الدین ئەییوب) مەلیکی میسر، مەقریزی لەکتێبەکەی دەقی نامەکەی هێناوە (لویس) بەمەلیك (صالح) دەڵێ: أما بعد فَإِنَّهُ لم يخف عَنْك أَنِّي أَمِين الْأمة العيسوية كَمَا أَنِّي أَقُول أَنَّك أَمِين الْأمة المحمدية. وَإِنَّهُ غير خَافَ عَنْك أَن أهل جزائر الأندلس يحملون إِلَيْنَا الْأَمْوَال والهدايا وَنحن نسوقهم سوق الْبَقر ولقتل مِنْهُم الرجل ونرمل النِّسَاء ونستأسر الْبَنَات وَالصبيان ونخلي مِنْهُم الديار وَقد أبديت لَك مَا فِيهِ الْكِفَايَة ونجلت لَك النصح إِلَى النِّهَايَة فَلَو حَلَفت لي بِكُل الْأَيْمَان وَدخلت على القسوس والرهبان وحملت قدامي الشمع طَاعَة للصلبان مَا ردني ذَلِك عَن الْوُصُول إِلَيْك وقتلك فِي أعز الْبِقَاع عَلَيْك فَإِن كَانَت الْبِلَاد لي فيا هَدِيَّة حصلت فِي يَدي وَإِن كَانَت الْبِلَاد لَك وَالْغَلَبَة عَليّ فيدك الْعليا ممتدة إِلَيّ. وَقد عرفتك

(١) بەرگی یەکەمی کتێبی السلوك لمعرفة دول الملوك، لاپەڕە **٤٣٩**. قصة الحضارة (١٥/٥٧).

وحذرتك من عَسَاكِر قد حضرت فِي طَاعَتي تملأ السهل والجبـل وعـددهم كعـدد الْحَصَى وهم مرسلون إِلَيْك بأسياف القضا(١).

(لات شـارراوە نیـیە کە مـن ئەمینـداری نەسـڕانییەتم هەر وەکـو تـۆ ئەمینداری موسڵمانانی، لاشت شارراوە نییە کە خەڵکی ئەندەلوس باج و دیاریمـان بـۆ دێـنن، بەڵام ئـێمە وەکـو مانگـا لێیـان دەخـوڕین پیاوەکانیـان دەکوژین و ئافرەتەکانیان بێوە ژن دەکەین و کچ وکوڕەکانیان بەدیل دەگرین، لەو شـوێنەی لێیـدەژین دەریـان دەکەیـن، مـنیش زۆر جار ئامۆژگاری تـۆم کردوە و ئێستا کۆتایی پێهات، ئەگەر بەهەموو جۆرێ سوێندم بۆ بخۆی و بێـیە خـزمەت قەشـەو ڕاهیبەکانمـان مـۆمم لەپـێش هەڵگـری، بـۆئەوەی بیسـەلمێنی کە گـویرایەڵی خـاچ دەکەی لێتـی قبـوڵ نـاکەم و تـازە نـاگەڕێمەوە لەخۆشەویسـترین شـوێن کەتـۆ پێـت خۆشـە ئەلەوێ دەتکـوژم، ئەگەر بوومە خاوەن ئەو وڵاتە ئەوە بۆ من دیارێکی گەورەیە، ئەگەر تۆش سەرکەوتی ئەوەی پێت دەکرێ بیکە، زۆریشم ئاگادر کردیەوە کەسوپایەکم لەگەڵە پڕی دەشت و شاخن ژمارەیان هەندە زۆرە هەرهەمویـان بەشمشێرەوە بۆتۆ هاتوون)

کەنامەکە گەیشتە مەلیك صالح و بۆی خویندرایەوە گوتی: لاحول ولاقوة الا بالله، ئینجا بانگی قازی (بەها ئەدین زوهەیری کوڕی محمد)ی کردو پێـی گـوت بنوسـە: دوای حەمـد و سـەنای خـوای گەورەو صـەلەوات لە

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك (١/ ٤٣٧).

گیانی پاکی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)

أما بعد فَإِنَّهُ وصل كتابك وَأَنت تهدد فِيهِ بِكَثْرَة جيوشك وَعدد أبطالك. فَنحْن أَرْبَاب السيوف وَمَا قتل منا قرن إِلَّا جددناه وَلَا بغى علينا بَاغ إِلَّا دمرناه. فَلَو رَأَتْ عَيْنَاك - أَيهَا الْمَغْرُور - حد سُيُوفنَا وَعظم حروبنا وفتحنا مِنْكُم الْحُصُون والسواحل وأخرابنا مِنْكُم ديار الْأَوَاخِر والأوائل لَكَانَ لَك أَن تعض على أناملك بالندم ولابد أَن تزل بك الْقدَم فِي يَوْم أَوله لنا وَآخره عَلَيْك. فهنالك تسيء بك الظنون (وَسَيعْلَمُ الَّذين ظلمُوا أَي مُنْقَلب يَنْقَلِبُون) فَإِذا قَرَأت كتابي هَذَا فَكُن فِيهِ على أول سُورَة النَّحْل: أَتَى أَمر الله فَلَا تستعجلوه وَكن على آخر سُورَة ص: ولتعلمن نبأه بعد حِين ونعود إِلَى قَول الله تبَارك وَتَعَالَى وَهُوَ أصدق الْقَائِلين: كم من فِئَة قَليلَة غلبت فِئَة كَثِيرَة بِإِذن الله وَالله مَعَ الصابرين وَإِلَى قَول الْحُكَمَاء: إِن الْبَاغِي لَهُ مصرع وبغيك يصرعك وَإِلَى الْبلَاء يقلبك وَالسَّلَام.

(نامەکەتم پێگەیشت هەڕەشە دەکەی بەزۆری سوپا و پاڵەوانەکانت، چاك بزانە ئێمە پیاوی شمشێرین، هەرچەندمان لێبکوژرێ دەبێتە مایەی تازە بوونەوەمان، هەرکەسێکیش دەستی بۆ ئێمە درێژکردبێ لەناومان بردوە، هەی لەخۆ باوی ئەگەر جەنگ و شمشێری ئێمەت بدیتبا چۆن قەڵا بەقەڵا و شوێن بەشوێنمان لێتان سەندەوە ئەوکات پەنجەی پەشیمانیت دەگەزت، دەکەویت لەڕۆژێکی سەرەتا و کۆتاییەکەی بۆ ئێمەیە، ئەو کات بۆت دەردەکەوێ چەند هەڵەبووی (وَسَيعْلَمُ الَّذين ظلمُوا أَى مُنْقَلب يَنْقَلِبُون) ئەگەر ئەو نامەیەی منت خوێندەوە چاوەڕوانی جێبەجێ بوونی

ئەو بەڵێنەی خوا بە {أَتَى أَمْرُ اللَّهِ فَلَا تَسْتَعْجِلُوهُ}[(١)]، وەچاوەڕوانی کۆتایی سورەتی (ص) بە: {وَلَتَعْلَمُنَّ نَبَأَهُ بَعْدَ حِينٍ}[(٢)] ئینجا ئێمە دەگەڕێینەوە سەرفەرمودەی خوای گەورە سبحانه وتعالی: { كَم مِّن فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةًۢ بِإِذْنِ ٱللَّهِۗ وَٱللَّهُ مَعَ ٱلصَّـٰبِرِينَ} و زاناو داناکانیش گوتویانە: ستەمکار خۆی دەچێتە کوشتنی خۆی.

وەڵامەکەی (مەلیك صالح) وەڵامێکی بوێرانەیەو لەشمشێر زیاتر هیچی تری پێنییە بۆ خاچ پەرستەکان، سەرەڕای دووبەرەکی نێو ماڵی (ئەیوبییەکان) و ئەو شپرزەییەی ڕووی لە وڵاتانی ئیسلامی کردوە، مەلیك صالح بڕیاری جیهادی دا و خۆبەخشێکی زۆر لە مەلیك صالح کۆبونەوە جگە لەوەش ورەی موسڵمانان زۆر بەرز بوو، خۆبەخشەکان ناوە ناوە هێرشیکی خێرایان دەکردە سەر لەشکری خاچپەرستەکان و چەند سەربازێکیان بەدیل دەگرت و دەیان هێنا بۆ ناو خەڵکی و پێیان دەگوتن کە ئەوانە شەڕیان پێناکرێ، مەلیك صالح بنەکەی سەربازی دەگوازێتەوە شاری (مەنصورە) کەبەرامبەر بە (دمیاط) لەو کاتەی مەلیك صالح خەریکی دارشتنی پلانی ڕوو بەڕوو بونەوەی خاچ پەرستەکانە لەگەڵ سەرکردە سەربازییەکانی، لەمانگی شەعبان وە لەتەمەنی (٤٤) ساڵی بەنەخۆشی وەفات دەکا، بەڵام خێزانەکەی (شجرة الدر) کە بەدایکی خەلیل

(١) النحل: ١

(٢) ص: ٤٤

ناسراوە، وەفاتی سولّتان دەشارێتەوە، نەوەك هەواڵ بگاتە خاچ پەرستەکان، ئینجا خۆی ئیدارەی ئەو خەڵکە دەکا ودەنێرێ بەدوای (تۆڕانشاه) کوڕی سولّتان کە ئەو کات لە قەڵای(کەیفا) لە(دیاربکر) بوو، (تۆڕانشاه) لە وێوە بەڕێکەوت تاگەیشتە میسڕ، لەو بەینە خۆبەخشە میسڕییەکان توانیان زیانێکی زۆر بە لەشکری خاچپەرستەکان بگەیەنن، لەهەمان کاتیشدا خاچ پەرەستەکان هێرشیکی گەورەیان کردە سەر بنکەی سەربازی موسڵمانان کەلە شاری (مەنصورە) بوو، خاچپەرستەکان سەرەتا توانیان میسڕییەکان بشکێنن تا نزیك بوونەوە لە ڕەشماڵی سولّتان، دواتر کەتیبەیەك بەسەر پەرشتی (ڕکن الدين بێبرس البندقداری) دێنە مەیدانەکەو خاچ پەرەستەکان دەشکێنن و ئەو هێزەی خاچپەرستەکان کە گەیشتبونە نێو شاری (مەنصورە) بەتەواوی لە ناو چون مەگەر کەمێکیان نەبێ ڕایانکرد و گەڕانەوە (دمیات) لەهەمان کاتدا کەشتی دەریایی میسڕییەکان توانیان زیانێکی زۆر بەکەشتی خاچپەرستەکان بگەیەنن و گەمارۆیان خستە سەر شاری (دمیات). (*)

سولّتان تۆرانشاه دەگاتەمیسڕبەفەرمی وەفاتی مەلیك صالح ڕادەگەیەنرێ و سولّتانی تازە دەست بەکاردەبێ، خەڵکی دڵیان زۆر خۆش دەبێ بەهاتنی سولّتان (تۆرانشاه) لەدەوری کۆدەبنەوە، وەفدی زانایانی میسڕیش دێنە پیرۆز بایی سولّتان ئەو وەفدە پێکهاتبوون لەگەورە زنایان بۆنمونە وەکو

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ١٤.

(ئیمام عزالدین کوڕی عبدالسلام و سراج الدین ئەرمەوی) و زۆری تر، ورەی سوپای میسرڕتەواو بەرز دەبێتەوە، لەو لاوەش سوپای خاچپەرستەکان لەدەریاوە گەمارۆ دراون لە وشکاتیش هێرشی بەردەوامیان دەکرێتە سەر، بۆیە تینیان بۆ هات و بەفەرمی داوای ئاگر بەستیان کرد لەسوڵتانی موسڵمانان دواتر پێشنیاریان کرد کە لە شاری (دمیات) دەکشێنەوە بەو مەرجەی موسڵمانان (قودس)یان تەسلیم بکەن، سوڵتان بەنەخێر وەڵامی دانەوە، لە مانگی موحەرەمی ساڵی (٦٤٨) کۆچی هێزی خاچپەرستەکان لە ناوچەی (فارسکور) کەسەر بەشاری (دومیاتە) بەتەواوی گەمارۆ دەدرێ و موسڵمانان دەتوانن زیانێکی یەکجار زۆر بە خاچپەرستەکان بگەیەنن، لە ئاکامی ئەو شەڕە خودی (لویسی نۆ) پادشای فەرەنساو سەرکردەی گشتی خاچپەرستەکان بەدیل دەکەوێتە دەست موسڵمانان، دوای ئەوەی (لویس) بەدیل دەگیرێ پێی دەڵێن ژمارەی سوپاکەت چەند بوو؟ ئەویش دەڵێ: نزیکەی دە هەزار سوار چاك و (١٣٠) هەزار سەرباز، لەکۆی هەموو ئەوانە زیاد لە سی هەزاری خاچپەرستەکان دەکوژرێ، جگەلەوانەی خۆیان هەڵداوەتە دەریاو لەوێ خنکان، لەگەڵ هەزارا دیل کە دواتر زۆربەیان بە پارە ئازاد کران، هەروەکو خودی (لویس) بەپارەیەکی یەکجار زۆر ئازاد دەکرێ وبە شکستێکی گەورە دەگەڕێتەوە ئەوروپا و کۆتایی بە هێرشی حەوتەمی خاچپەرستەکان دێ.[1] ئەو هەڕەشەو

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك (١/ ٤٣٧).

هێرشانەی لەلایەن خاچپەرستەکان دەکرایە سەر جیهانی ئیسلامی خەلیفەو بەغدا لێی بێئاگان و نەیانتوانیوە بەهیچ جۆرێك ڕۆڵێکی کاریگەر لەڕاگرتنی ئەو جۆرە هێرشانە ببینن، ئینجا ژیانی پڕ لەرەفاهیەت و ناز و خۆشی بەتەواوی جەنگ و شەڕو هەڕەشەی بیر بردبونەتەوە، لەساڵی (٦٥٠) تەتارەکان دەگەنە ناوچەی جزیرە دیاربەکر و مەیافارقین و دەوروبەری حەسەکە هەر هەموی تاڵان دەکەن ژن و منالەکان بەتاڵان دەبەن و زیاد لە دە هەزار کەس لەو ناوچانە دەکوژن، لەساڵی (٦٥٤) هەواڵ بڵاو دەبێتەوە کە هۆلاکۆ گەیشتۆتە ئازەربایجان لەوێوە بەنیازە بەرەو شام بەڕێ کەوێ لەگەڵ بڵاو بوونەوەی ئەو هەواڵە ئاشتیەك دەکەوێتە نێوان خەڵکی شام ومیسرئەو دوو شوێنە تا ڕادەیەك خۆیان ئامادە دەکەن بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی هۆلاکۆ.[١]

(١) النجوم الزاهرة، بەرگی ٧ لاپەڕە ٢٥.

# ساڵی ٦٥٤
# دەرکەوتنی ئاگرێکی گەورە لەخاکی حیجاز

پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمێ:

{لاَ تَقُومُ السَّاعَةُ حَتَّى تَخْرُجَ نَارٌ مِنْ أَرْضِ الحِجَازِ تُضِيءُ أَعْنَاقَ الإِبِلِ بِبُصْرَى}[1] واتە: قیامەت دانایێ، تاوەکو ئاگرێك دەرنەکەوێ لەخاکی حیجاز، ملی ووشترەکان رووناك دەکاتەوە لە شاری (بوسرا).

ئەوەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) باسی کردوە لە ساڵی (٦٥٤) کۆچی، هاتە دی، ڕیوایەتە مێژووییەکان دەڵێن سەرەتای ئەو ئاگرە بە چەند بومەلەرزەیەکی گەورە دەستی پێکرد، ئینجا دوای ئەو بومەلەرزانە تەقینەوەیەکی گەورە ڕوویدا ئەو چرایانەی لە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، هەڵواسرابوون هەر هەموی لەرزین و دارو دیوارەکان هەژایەوە، ئینجا ئاگرێك بەدەرکەوت لەشاری مەدینە، شاخ و بەردەکانی تواندەوە و دۆڵێکی پڕلە ئاگر ڕێی دەکرد، خەڵکەکە بەبینینی ئەو ئاگرە ماڵەکانی خۆیان بەجێ هێشت و ڕوویان کردە مزگەوتی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم)، وە دەستیان کرد بەپاڕانەوە لەخوای گەورە، وازیان لە

---

(١) رواه البخاري.

گۆناه هێنا، دوای ئەوە ئاگرەکە کپ بوویەوەو بوڕکانەکە دادەمرکێ، [1] سبحان الله ئەو بوڕکانە دوو ساڵ بەر لەهاتنی مەغۆلەکانە بۆ بەغدا، وەکو بڵێی ترسێنەرێکی زۆر گەورە بووە لەوکاتە، کە ئەو ئوممەتە لەخەوی غەفڵەت بەخۆ بێنەوە، ئەگەر نا کارەساتی گەورەتر بەڕێوەیە.

## ساڵی (٦٥٥) چەند سیخوڕێکی هۆلاکۆ دەگەنە شاری (بەغدا)

خەڵکێکی زۆر بەهەڵە لە مەغۆلەکان حاڵی بوینە، مەغۆلەکان تەنها شەپۆلێکی سەرشێتانەی بێبەرنامە نەبوویینە، بەڵکو خاوەن پلان و صەنعەتێکی سەربازی زۆر گەورە بووینە، بۆیە بەر لە هێرش کردنە سەر بەغدا، دەورو بەری بەغدایان بەتەواوی کۆنترۆڵ کرد، هەر لە ئێران تاوەکو ئەرمینا و ئازەربایجان و تورکیای ئێستا و تاوەکو موصڵ، ئەو شوینانەیان هەموو خستە ژێر دەستی خۆیان، ئینجا مەنجەنیقیان بەشێوەیەکی وا دروستکردبوو سوك بگوازرێتەوە، دەیانکردە چەند پارچەیەك و لێکیان دەکردنەوە دواتر لە مەیدانی جەنگ لێکیان دەبەستنەوە، سەرەڕای ئەو هەموو سەرکەوتنەی بەدەستیان هێنابوو، هێشتا بەبێ بەرنامە هێرشیان نەکردە سەر پایتەختی خیلافە، بەڵکو لەوساڵە واتە ٦٥٥ کۆچی توانیان دەسەڵاتی (ئیسماعیلییەکان) نەهێڵن و قەڵاکانیان لەدەست دەربهێنن، لەیەکێك لەقەڵاکان (نصیرالدین طوسی، نەسیرەدینی توسی) تێدا دەست

---

(١) البداية والنهاية ط الفكر (١٣/ ١٨٨).

بەسـەر بـوو، دوای گرتنـی مەغـۆل بـۆ قەڵاکە (طوسـی) دەبێـتە گەورە پیـاوی هۆلاکـۆ لەو سـوپایە دەبـێ کەمەبەسـتیان گرتنـی بەغـدا بـوو، ئەم قەڵایـانە چەندین ساڵ بـوو ببـون بەکێشـەیەکی یەکجار گەورە بۆ جیهـانی ئیسلامی، دوای لەناوبردنی ئەوانە، ئینجا پەنایـان برد بۆ چەندین تۆڕی سیخوڕی و تا گەیشتنە بەغدا و چاویان کەوت بە وەزیر(ابن العلقمی).[1]

بێگومان لەوچاو پێکەوتنە باس لە چۆنیەتی گرتنی بەغدا کراوە، خیانەتی ئەو وەزیرە لەگەڵ زانای ناوداری شیعە (طوسی، محمد کوڕی محمد ی کـوڕی حەسـەنی طوسـی لەسـاڵی ٦٧٢ کـۆچی مـردوە) هـیچ گومـانی تێدانییە، بۆیە سەرچاوە مێژوو و ئاینییەکانی شیعە بە فەخرەوە باس لەو خیانەتە دەکەن، لەکتێبی (مجالس المؤمنین، نور الله المرعشي التستري کە لە سـاڵی ١٠١٩ مـردوە) لە بەرگـی ٣ لاپەڕە ٥٥٦: باسـی پەیوەنـدی نێـوان هۆلاکـۆ و (ابــن العلقمــی) دەکـات و دەڵــێ: دوای ئەوەی کێشــە دەکەوێتە نێوان سوننەو شیعە لە بەغـدا (ابـو بکـر) کـوڕی خەلـیفە لەگەڵ چەنـد سـەربازێك هێـرش دەکەنە سـەر (کەرخ) کە زۆربەی دانیشـتوانەکەی شیعە بوون، شیعەیەکی زۆریان کوشت (ابن العلقمی) کەبەوەی زانی زۆری خەفەت خـوارد لەبەر ئەوەی ئەو شـیعە بـوو، گەرچـی وەزیـر بـوو لای خەلیفەیێکـی سـوننی، بـۆیە پەیوەنـدی بەهۆلاکـۆ کـرد و پێـی گـوت: انـي

---

(١) مؤيد الدين أبو طالب محمد بن علي بن محمد العلقمي . لەساڵی (٦٥٦) مردوە. تاريخ مجموع النوادر مما جرى للاوائل والاواخر، لاپەڕە ١٤١.

ابعدت أهل العقل الراجح وذوي السياسة الصالحة وجميع الامراء من الجيش عن الخليفة بحسن تدبيري، فالعجل العجل وهلموا الى هذا الجناب الخصيب لتظفروا به فسوف تنالون الرضا عاجلا وتملكونه بايديكم... واطلع هلاكوخان على جلية الحال بالتفصيل والاجمال...) سەیری ئەو پیلانە بۆگەنە بکەن دەڵێ: هەرچی پیاوی عاقڵ و سیاسەت زانە لەدەوری خەلیفەم نەهێشتوە، پەلە بکەو بارودۆخەکە زۆر ڕەخساوە بۆگرتنی بەغدا. لەکتێبی: روضات الجنان في أحوال العلماء والسادات، میرزا محمد باقر الموسوي الاصبهانی، لە بەرگی ٦ لاپەڕە ٥٥٨ باسی خەواجە نەصیرەدینی طوسی دەکات و دەڵێ: لە چیرۆکە ناسراو و بەسەر هاتە زانراوەکانی ئەو زانا گەورەیە ئەوە بوو کە لەخزمەت هۆلاکۆ بوو بۆ گرتنی بەغدا بۆ چاکسازی و نەهێشتنی گەندەڵێ و ستەمی نەوەی عەبباس و کوشتنی گشتی ئەو خەڵکە کەمەبەستی خەڵکی بەغدایە، کوشتارێکی ئاوا کرا خوێنە پیسەکانی ئەو خەڵکە وەکو ڕوبارێك تێکەڵ، بەڕووباری دیجلە بوو، لەوێش بۆ دۆزەخ.

ئەمانەو دەیان سەرچاوەی تری شیعە کە بەفەخرەوە باس لە هاوکاری هۆلاکۆ دەکەن بۆ گرتنی بەغدا، سەرچاوە سوننییەکانیش بەهەمان شێوە باس لەخیانەتی (طوسی و وەزیر ابن العلقمی) دەکەن، لەکتێبی (مراة الجنان وعبرة اليقظان، محمد کوڕی ئەسعەدی کوڕی عەلی الیافعی) بەرگی ٤ لاپەڕە ١٠٥ هاتوە: هۆکاری ئەوەی مەغۆلەکان بەرەو بەغدا بێن ئەوە بوو کە وەزیر(ابن العلقمی) نامەی بۆناردن و هانی دان و قەناعەتی

پێکردن کە گرتنی بەغدا ئاسانە، لەهەمان کاتدا دەوری خەلیفەی دابوو ڕێی نەدەدا کەسە دڵسۆزەکان بگەنە لای خەلیفە یان ڕاوبۆچونی جوان بگاتە خەلیفە.

لەکتێبی (کنز الدرر و جامع الغرر) بەرگی ٨ لاپەڕە ٣٤ کەباسی ڕووداوەکانی ساڵی (٦٥٦) دەکات دەڵێ: لەو ساڵە هۆلاکۆ بەغدای گرت بە پلانی وەزیر (مؤيد الدين بن العلقمي) لعنه الله . قلت الاولى ان يكون اسمه خاين الدين .

لە تاریخی (ابن الوردي) بەرگی ٢ لاپەڕە ١٨٩ لەڕووداوەکانی ساڵی (٦٥٦) کۆچی هاتوە: وەزیر (ابن العلقمي) دوای ئەو شەڕەی نێوان شیعەو سوننە لەبەغدا، نامەیەك دەنێرێ بۆ والی هەولێر(محمد بن صلايا العلوي) و گلەیی و گازاندەیەکی زۆر دەکات و دەڵێ هێرش کرایە سەر (کەرخ) و تالان کراو حورمەتی ئالو بەیت شکێنرا و خەریکە شوێنەکانی تریش هێرشیان دەکرێتە سەر. ئینجا دەڵێ: فلنأتينهم بجنود لاقبل لهم بها ولنخرجنهم منها اذلة وهم صاغرون.

(ابن صلايا) والی هەولێر گەرچی شیعەیە، بەڵام ڕافیزی نییە، زۆر بەو نامەیە دەشڵەژێ و بەتوندی وەڵامی (ابن العلقمي) دەداتەوە، لەهەمان کاتیشدا ئاگادرای بۆ خەلیفە دەنێرێ بەڵام خەلیفە ئەو قەناعەتی لۆ دروست ببوو، ئەگەر تەنها بەغدای بۆ بمێنێ بەسییەتی.[1]

(١) مفرج الكروب في أخبار بني أيوب (٥/ ٥٠) وە کتێبی (النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة (٧/ ٤٨) وە کتێبی طبقات الشافعية الكبرى للسبكي (٨/ ٢٦٥).

## پێشنیارەکەی (حسام الدین عکە، حوسامەدین عەککە) حاکمی (درتنگ، دەرەتەنك، حلوان، خانقین) و پشتگوێخستنی خەلیفە

ناوچەی (حلوان) قصر شیرینی ئێستا و سەربیل زەهاب و تاوەکو خانەقین هەموی پێی گوتراوە حلوان، ئەو ڕوبارەی بەو ناوچانەش تێپەڕیوە پێی گوتراوە ڕوباری (حلوان) کە ئێستا پێی دەگوترێ ڕوباری (ئەلوەند).[١]

ئەوناوچانە کوردستانە حوسامەدین عەککە والی ئەو ناچەیە دەبێ، کە هێزەکانی مەغۆل دەگەنە دەوروبەری ئەو ناچەیە، کوڕێکی هەبوو بەناوی (سەعید) ئەو کوڕەی لە جێی خۆی بەجێدە هێڵێ و دەچێتە لای هۆلاکۆ و گوێرایەڵی خۆی پێشکەش بەهۆلاکۆ دەکات وناوچەکەی لە شەڕ ڕزگار دەکا، حسام الدین عەککە پێشتر کێشەی هەبووە لەگەڵ خەلیفە، بۆیە لەسەررا گوێرایەڵی هۆلاکۆ دەکاو ژێر بەژێریش نامەیەك دەنێرێ بۆ (ابن صلایا) حاکمی هەلێرو پێی دەڵێ خەبەر بداتە خەلیفە با کێشەی لەگەڵ من نەمێنێ و دڵی چاك بیتەوە لەئاستە من، ئیستا من دەزانم هۆلاکۆ چ هێزێکی لەگەڵ خۆی هێناوە، بەڵام ئەگەر خەلیفە یارمەتی دەرم بێ ئەوا هەڵێکمان لەبەر دەستەو دەتوانم نزیکەی (١٠٠) هەزار کەس کۆبکەمەوەو ڕێ لەو سوپایەی هۆلاکۆ بگرم، حاکمی هەولێر نامەکە دەنێرێ بۆ (ابن

---

(١) بلدان الخلافة الشرقیە، لاپەڕە ٨٥.

العلقمی) و لەویەوە بۆ خەلیفە، خەلیفە نامەکە پشتگوێ دەخات و دیارە هێشتا (ابن صلایا) سەددەرسەد دڵینا نەبووە لەخیانەتی (ابن العلقمی) بۆیە نهێنی ئەو نامەیە دەگاتەوە هۆلاکۆ، هۆلاکۆ بەوە دەزانێ کە (حسام الدین عەککە) بەتەمای چییە، بۆیە هێزێکی سی هەزار کەسی دەنێرێ بۆ (حلوان) داوای حسام الدین عەککە دەکا، ئەو هێزە وانیشان نادەن کە ئەوان بەنامەکەی، حسام الدین یان زانیوە، دەڵێن وەرەلامان و بۆ مەشورەت، ئینجا کە (حسام الدین) دەچێتە لایان دەستگیر دەکرێ دواتر دەنێرن بەدوای تەواوی بنەماڵەکەی لە خێزان وبراو کوڕ وکچەکانی هەر هەمویان دەستگیر دەکرێن و لەگەردەنیان دەدرێ تەنها کوڕێکیان، ڕزگاری دەبێ و خۆی دەگەیەنێتە بەغدا، دواتر ئەویش لە شەڕی بەغدا دەکوژرێ.[1] ئێمە کە مێژوو دەخوێنینەوە گلەیی زۆر دەکرێ لە (ابن العلقمی)، بەڵام بەر لە هەموو شتێك دەبێ خودی گلەییەکان ئاڕاستەی خەلیفە بکرێ، خەلیفە خەمی ئوممەتی لەبەر نەبووە، خەمی گەورەی تەنها خۆشی ژیانی خۆی بووە، دەتوانین بڵێین هەموو سەرچاوە مێژووییەکان کۆڕان لەسەر ئەوەی خەلیفە کەسێکی لاوازی دونیا ویست و ڕەزیل بووە، خۆی بەخاوەنی بەغدا زانیوە و زیاتر هیچی ترنا، ئیمام (ابن کثیر) دەربارەی دەفەرمێ: ولكن كان فيه لين وعدم تيقظ ومحبة للمال وجمعه ومن جملة ذلك انه استحل الوديعة التي استودعه اياها الناصر داود بن المعظم وكانت قيمتها نحوا من

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٧٧.

مائة الف دينارفاستقبح هذا من مثل الخليفة وهو مستقبح ممن هو دونه بكثير، بل من أهل الكتاب من ان تامنه بقنطار يؤده اليك كما قال الله تعالى: ومن أهل الكتاب من ان تامنه بقنطار يؤده اليك ومنهم من ان تامنه بدينار لايؤده اليك .عمران: ٧٥ [١] ئەوەندە پارە ویست بووە کاتی خۆی، سوڵتان داود کوڕی موعەززەم ئەمانەتێکی لای خەلیفە دانابوو نرخەکەی (١٠٠)هەزار دینار دەبوو، خەلیفە چاوی بڕیە ئەو ئەمانەتەو دواتر ئینکاری کرد و ئەمانەتەکەی نەدایەوە و خواردی، ئەوە ڕەفتاری خەلیفەی موسڵمانان بێ دەبێ چ ئومێدێکت پێی هەبێ و چۆن دەتوانی ڕوو بە ڕووی شەپۆڵی مەغۆل ببێتەوە، ئەوە و دەیان خاڵی تری لاوازی خەلیفە کە لە شوێنی خۆی پشتیوان بەخوا ئاماژەی پیدەکەین.

---

(١)البداية والنهاية(١٣/ ٢٠٥).

# خۆئامادەکردنی هۆلاکۆ
# بۆگرتنی بەغدا

هۆلاکـۆ لەسـاڵی ٦٥١ (قەراقـورم)ی پـایتەختی بەجێهێشـت، پادشـاو مەلیکەکانی ناوچەکە ڕێگایان بۆ خۆش کردبوو لەساڵی (٦٥٣) گەیشتە سەمەرقەند، دواتر گەیشتە ئێران و لە ئێران نامەی بۆ زۆربەی پادشاکان نارد پێی گوتن کە یەکێك لەکارەکانمان گرتنی (قەڵای ئیسماعیلییەکانە) لەنـاو بردنـی هێـزی ئەوانە، لەسـاڵی (٦٥٤) تـوانی تەواوی قەڵای ئیسماعیلییەکان بگرێ و هێزی ئیسماعیلییەکان تێك بشکێنێ، لەوکاتەی کە هۆلاکـۆ گەمـارۆی قەڵای ئیسـماعیلییەکانی دابـوو، چەنـد جارەکی داوای یـارمەتی لە خەلـیفە (مستعصـم)کرد کە هێزێکـی بـۆ بنێـری بـۆ لەناوبردنی (ئیسماعیلییەکان) بەڵام لە بەغدا ببون بە دوو بەش لەسەر ئەو داواکـارییەی هۆلاکـۆ، هەنـدێکیان گوتیـان ئەوە پیلانـی هۆلاکـۆیە بـۆ چۆڵکردنی بەغدا لە هێزی سەربازی کەئەوە بۆچونی (الدویدار الصغیر: مجاهد الدین ایبك)بوو، وە (ابن العلقمی)یش گوتی با هێزی بۆ بنێرین لەگەڵ دیارییەکی زۆر و دڵی هۆلاکۆ ڕابگرین لەبەر ئەوەی هێزەکەی ئەو بەئێمە ناشکێ ئەوە لەکاتێك ئەو وەزیرە لە پیلانەکەی ببوەوە لەگەڵ هۆلاکۆ لەسەر هەمـوو شت پێـك هـاتبون، مێژوونوسـان باسـی هەردوو بـۆ چونیـان

کـردوە، بەڵام ئـێمە ئەوەمـان لەیـاد نەچـێ کە هۆلاکـۆ هەر لەسـەرەتاوە کە (قەراقـورم)ی بەجێهێشـت بە نیـازی گرتنـی بەغـداو خسـتنی خیلافەتـی ئیسـلامی بـوو، بـۆیە ئەو پێویسـتی بەهێـز نەبـوو بـۆ گرتنـی قەڵای (ئسـماعیلییەکان) کە بەقەڵای (مولحیـدەکان) ناسـراوە لە مێـژوو، ئەو پێوسـتی بەهـیچ یارمەتییەکـان نەبـو تەنهـا بەهـانەیەك بـوو، بەخەلـیفەی دەگرت و هیچی ترنا، ئینجا زانیاری تەواویشی هەبوو لەسەر بارودۆخی بەغـداو دەیزانـی کەهـیچ هێزێکی کـاریگەر لەبەغـدا بـونی نییە و خەلـیفە بێدەسەڵاتە، دوای لەناوبردنی (ئیسماعیلییەکان) هاتە (هەمەدان).

لە(هەمەدان) هۆلاکـۆ بەر لەوەی ڕوو لە بەغـدا بکـا، ڕاو بۆچـونی ڕاوێـژ کارەکانی خۆی وەرگرت لە سەر ئەو نیـازەی کەهەیەتی لەگرتنی بەغـدا، یەکێك لە ڕاوێژ کارەکانی کابرایەکی ئەستێرەناس بوو بەنـاوی (حسام الدین المنجم) دیارە ئەو کەسە سوننی بوەو حەزی نەکردوە، هۆلاکۆ بەغدا بگـرێ و بنەماڵەی عەبباسییەکان لەسەر حوکم لابدا، بەهۆلاکۆ دەڵـێ بەپێی ئەو زانیـاریەی مـن هەمە، هەر کەسـێك نیـازی هێرشـکردنە سـەرخەلیفەو بنەمـاڵەی عەبباسـییەکانی هەبێـت، ئەوا مولـك و تەمەنـی لەدەسـت دەدا، ئەگەر هێرش بکەیـتە سـەر بەغـداو بنەمـاڵەی خەلـیفە ئەوا چاوەڕوانی ئەو شتانە بکە (هەر چی ئەسپت هەیە هەموی دەمرێ و خۆر هەڵنـایە وبـاران نابـارێ و بـایەکی زۆر تونـد هەڵـدەکا و هـیچ ڕووەکێـك نـاڕوێ و هەر لەو ساڵەش تـۆ دەمـری) حوسامەدینی ئەستێرە نـاس ئەوە بۆ چونەکانی بـوو،

دیـارە لەقسـەکانی ویسـتویەتی (هۆلاکـۆ) بترسـێنێ و پەشـیمانی کـاتەوە لەگرتنی بەغدا، ئینجا هۆلاکۆ دەنێری بەدوای (نصیر الدين الطوسی) ڕاو بۆچـونی ئەو وەردەرگـرێ لەسـەر ئەو قسـانە، (توسـی) بەهۆلاکـۆ دەڵـێ : قوربان هیچ لەو خاڵانە ڕوونادەن کە ئەو پیاوە باسی دەکا.

هۆلاکۆش دەڵێ : ئەی چی ڕوو دەدا ؟

توسی دەڵێ: قوربان تۆ دەچێتە شوێنی خەلیفەو هیچ شتێکیش ڕوو نادا لەبەرئەوەی زۆرێـك لە هـاوەڵانی پیغەمـبەری خـوا (صـلى الله عليـه وسـلم) کـوژراون و هیچـیش ڕووی نەداوە، ئینجـا نەوەی عەببـاس لەنێـو خۆیـان زۆریـان لەیەك کوشـتوە و هیچـیش ڕوی نەداوە، هۆلاکـۆ قەنـاعەت بە قسەکەی (توسی) دەکاو بەرەو گرتنی بەغدا دەکەوێتەڕێ.(١)

شـازدە سـاڵ تێـپەڕی بەسـەر خیلافەتـی موستەعصـیم، ڕۆژ بەڕۆژ مەغۆلەکان لە سنوری بەغدا نزیك دەبوونەوە، خەلـیفە خەمـی کەوتنـی یەك بەیەکی وڵات و شارە ئیسلامییەکانی نەبوو، ئەو پێی وابوو لەبنەماڵەیەکی پیرۆز دایەو ئەوەی نیازی خراپ بێ لەگەڵ خیلافەت ئەوا خوای گەورە لەناوی دەبا، پێی وابوو زۆر جار هەڕەشە لە بەغدا کراوە، بەڵام هیچ لەو هەڕەشانە نەچۆتە سەر و نەیان توانیوە بەغدا بگرن، هەڕەشـەکانی مەغـۆل بەهەڕەشەی خەواریزمییەکان تێدەگەیشت لەسەر خیلافەت و گرتنی بەغدا، لەهەمان کاتدا پێی وابوو ئەگەر مەغۆل هەوڵی گرتنی بەغدا بدەن ئەوا

---

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٨٠.

تەواوی جیهـانی ئیسـلامی دێـنە دەنـگ و خەڵـکەکە هێـزی مەغـۆل دەشـكێنن، غەفڵەتـی خەلـیفە زۆر قـوڵ بـوو، ئەو كـاتە بەخـۆ دێـتەوە كە ئافرەتێـك لەبەر دەم خەلـیفە سـەما دەكـا بەنـاوی (عەرەفە) تیرێكـی مەغۆلەكـان لە پەنـجەرەی كۆشـكی خەلـیفە دێـتە ژوورەوەو بە عەرەفە دەكەوێ ئەو كـات، خەلـیفە نـا ڕەحەت دەبـێ و فەرمـان دەكـا دەرگـاو پەنچەرەی كۆشك قایم بكەن.

هۆلاكۆ لەڕێگای (حلوان) خانەقینەوە داخڵی عێراق دەبێ فەرمانیش دەنێرێ بۆ (بایجو) كە ئەو كات لە توركیای ئێستا بوو، بەزووترین كات خـۆی و هێـزەكەی بـگەنە بەغـدا، سـەرەتا (بـایجو) ویسـتی ئەو فەرمـانە جێبەجێ نەكاو بەشدار نەبێ لەگرتنی بەغدا، بۆیە پرسی بەدوو سـەركردەی خـۆی كـرد كەناویـان (ارسـلان جویـان و صـرمون نـوین) بـوو، هەردووكیـان گوتیان دەبێ فەرمـانەكەی هۆلاكـۆ جێ بەجێ بكەیـن بكەویـنە ڕێ بەرەو بەغدا، ئینجا (بایجو) بەدوای بەهـانەیەك گەڕا، هەواڵـی نـارد بۆ هۆلاكـو كە كوردەكـان ڕێگـای (دیـاربەكر) یـان گرتـوە و هێزەكەی ئەو نـاتوانێ ئەو ڕێگـا زۆرە ببڕی تـا دەگـاتە بەغـدا، (هۆلاكـو) دوو (فیـرقەی) سـەربازی خـۆی نـارد بەسـەركردایەتی (قـدغان و كتبغـا نـوین) ئەوان چـونە سـنوری دیاربەكرو ڕێگایان خۆش كرد بۆ هـاتنی هێزەكەی (بـایجو) ئەوە بـوو هێزە گەورەكەی بایجو داخڵی عیـراق دەبێ و دەچێـتە موسـڵ و لەوێـوە دەگـاتە

خۆر ئاوای بەغدا.[(١)] [(*)]

هۆلاکۆش لەولاوە دەگاتە خۆرهەڵاتی شاری بەغدا، بەرلەوەی هۆلاکۆ بگاتە بەغدا بە شاری (بەعقوبە)تێدەپەڕێ لەوێ مەغۆلەکان یەکێك لەپیاوانی خەلیفە دەستگیر دەکەن بەناوی (ئەیبەکی حەلەبی) ئەو پیاوە دەبە نە لای هۆلاکۆ، هۆلاکۆش دەڵێ ئەگەر ڕاست بی لەگەڵمان نات کوژین، (ئەیبەك) لەگەڵ (هۆلاکۆ) ڕێك دەکەوێ و دەبێتە ڕێینیشاندەری مەغۆل و نامە بۆ پیاوانی خەلیفە دەنێرێ لەبەغدا و پێیان دەڵێ: سوپایەکی زۆر گەورەی مەغۆل بەڕێوەیە وئێوە ناتوانن بەرەنگاری ئەو سوپایە ببنەوە، هەندیك لە پیاوانی خەلیفە وەڵامی نامەکەی ئەیبەك دەدەنەوەو دەڵێن: هۆلاکۆ کێیە بتوانێ پێبنێتە خاکی خیلافەت، ئەوە خەلیفەیەو خوای گەورە دەیپارێزێ، ئومێد دەکەین بەهۆلاکۆ بڵێی بگەڕێتەوە هەمەدان و ئێمەش لێرە داوا لە خەلیفە دەکەین، لەو هەڵە گەورەیەی هۆلاکۆ خۆش بێ، ئینجا کە ئەو نامەیە دەدەنە دەست هۆلاکۆ بەنامە کە پێدەکەنی زیاتر بۆی ڕوون دەبێتەوە کە گرتنی بەغدا زۆر ئاسانە[(٢)]

---

(١) عقد الجمان، لاپەڕە ١٧٦ ڕووداوەکانی ساڵی(٦٥٤) هەروەها بڕوانە کتێبی زبدة الفكرة في تاريخ الهجرة ركن الدين بيبرس المنصوري الدوادار

(*) بڕوانە: نەخشەی ژمارە ١٥.

(٢)کتێبی تاريخ مختصر الدول، لاپەڕە ٤٧٣ . الحوادث الجامعة، لاپەڕە ٢٢٩.جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٨٣.

# (بایجو) لەبەر چی حەزی نەکرد بەشداری گرتنی بەغدا بکا؟

لەکتێبی (نهایة الارب فی فنون الادب) بەرگی ٢٧ لاپەڕە ٢٣٧ و لەکتێبی (عقد الجمان فی تاریخ أهل الزمان) ئیمامی عینی لاپەڕە ١٥٥ باسی بەسەر هاتی ئیسلام بوونی خێزانی (بایجو) دەکەن، بۆیە دوای ئەوەی هۆلاکۆ تەواوی عێراق دەگرێ (بایجو) دەکوژێ، هەندێك لەسەر چاوەکان دەڵێن هۆکاری کوشتنی (بایجو) ئەوە بوو کە هۆلاکۆ زانیبوی بۆتە موسڵمان هەندێکیش دەڵێن لەبەر ئەوەی سستی کرد لە هاتنی بۆ عێراق بۆیە (هۆلاکۆ) بایجۆی کوشت بروانە کتێبی (زبدة الفکرة فی تاریخ الهجرة لاپەڕە ٤١) بەهەر حاڵ سەرچاوەکان باس لە ئیسلام بوونی خێزانی (بایجو) دەکەن و دەڵێن: دوای ئەوەی (بایجو) هێزی سلجوقە ڕۆمییەکان دەشکێنێ، نزیك دەبێتەوە لە شاری (قونییە) خەڵکی ئەو شارە دەرگای شارەکە دادەخەن، بۆماوەیەکی زۆریش (بایجو) لەو ناوە دەمێنێتەوە، لەنوێژی هەینی وتاربێژی شاری (قونییە) ڕوو لەخەڵکە کە دەکات و دەڵێ: ئەی موسڵمانینە ئێمە موبتەلا بوینە بەو دوژمنە، هیچ هێزێکیشمان نییە بتوانین بەرەنگاری ببینەوە، بۆیە ئەوە ئەمنماڵی خۆم

هێناوە ئێوەش ماڵی خۆتان بینن و با خۆمان ماڵ و منداڵەکانمان بپارێزین و بچین ئەو ماڵە بەهێزەکەی مەغۆل بدەین، ئینجا وتار بێژەکە دەست دەکاتە گریان و خەڵکی مزگەوتەکە هەمویان دەست دەکەنە گریان، لەدوای وتارەکە پارەیەکی زۆر کۆدەکەنەوە، وتاربێژی شاری (قونیە) دەرگای شارەکە دەکاتەوەو پارەیەکی زۆری پێیە و بەرەو سەربازگەی (بایجو) بەڕێ دەکەوێ، کە دەگاتە نێو سەربازگەکە، ڕوودەکاتە ماڵی (بایجو) دیارە ئەو کات (بایجۆ) چۆتە ڕاو، خێزانی (بایجۆ) لەوێدەبێ، ئینجا زۆربەی ئەو سەرکردانە خێزانەکانیان لەبنەماڵەی جەنگیزخان بوە، خێزانی (بایجو) پێشوازی لە وتار بێژەکە دەکاو لەگەڵ ئەو پاسەوانانەی کە لەماڵی (بایجو) دەبن دەوری وتار بێژەکە دەدەن، ئینجا خێزانەکەی بایجو خواردن دێنێ و فەرموی لێدەکا، وتار بێژەکە نانەکەیان لەگەڵ دەخوا دواتر (عارەق، مەی) بۆ دێنن، ئەویش عارەقەکە ناخواتەوە، خێزانی (بایجو) دەڵێ: لەبەر چی عەرەقەکەت نەخواردەوە؟ وتار بێژەکە دەڵێ: لەبەر ئەوەی خواردنەوەی عەرەق لای ئێمە حەرامە، خێزانی بایجو دەڵێ: کێ حەرامی کردوە؟ ئەویش دەڵێ: خوا حەرامی کردوە، خێزانەکەی بایجو دەڵێ: ئەی بۆ ئێمە دەیخۆینەوە؟ ئەویش دەڵێ: لەبەرئەوەی ئێوە کافرن، خێزانی بایجۆ دەڵێ: ئەگەر ئێمە کافر بین چۆن زاڵ بووینە بەسەر ئێوە؟ وتار بێژەکە سەیری خێزانی بایجۆ دەکا کراسێکی زۆر گران بەهای لەبەر دایەو بە دڕو مەرجان نەقشاندراوەو لێی پرسیار دەکاو دەڵێ: ئەو کراسەی لەبەرتە ئەگەر

بیکەیتە دیاری دەیدەتە کەسێك خۆشت بوێ یان ڕقت لێبێتەوە؟ خێزانی بایجۆ دەڵێ : دەیدەمە کەسێك کەخۆشم بوێ، وتار بێژەکە دەڵێ: ئەی ئەگەر ئەو کەسەی خۆشت دەوێ و کراسەگران بەهایەکەت پێی بەخشی و بەڵام ئەو کەسە نرخی ئەو کراسەی نەگرت و فەوتاندی چی لێدەکەی؟ خێزانی بایجۆ دەڵێ: سزای دەدەم یان دەیکوژم، ئینجا وتار بێژەکە دەڵێ: خوای گەورە ئیسلامی بەدیاری بۆئێمە نارد بەڵام ئیمە نرخی ئەو دیاریە گەورەیەمان نەزانی و ئێستا ئەوە خوای گەورە بەشمشێری ئێوە سزامان دەدا، خێزانی (بایجو) قسەکانی زۆر دەکەوێتە دڵ و دەڵێ: تازە تۆ نابێ بڕۆی و من دەبمە کچی تۆ، وتار بێژەکە دەڵێ: ئاخر ئەوە نابێ تا نەبیتە موسڵمان، ئەوە بوو خێزانی (بایجو) دەبێتە موسڵمان، ئینجا کە بایجۆ دەگەڕێتەوە، سەیر دەکا وتاربێژێکی موسڵمان لەماڵیتی و خێزانەکەی بەسەرهاتەکەی بۆ دەگێڕێتەوە، بایجۆ دەڵێ: من بەڵینم بەخوا داوە ئەگەر شاری (قونیە) داگیر بکەم بیکەمە دیاری بۆتۆ، واتە بۆ خێزانەکەی، خێزانی (بایجۆ) ش دەڵێ: ئەوە منیش ئەو شارەم کردە دیاری ئەو باوکەم کەمەبەستی وتاربێژەکەیە، ئینجا دەرگای شارەکە دەکەنەوەو (بایجۆ) بڕیارێك دەردەکا نابێ مەغۆلەکان بچنە ناو ئەو شارە ئەگەر، ئیشێکیشیان بەو شارەکەوت دەبێ پەنجا کەس پیکەوە بچن بۆ شارەکە لەو ژمارەیە زیاتر نابێ هیچ کەس بچێتە شارەکە، خوای گەورە ڕەحمی بەوشارەکرد و (قونیە) ڕزگاری دەبێ لەکاولکردن، بەپیی ئەو ریوایەتانە بێ، دیارە

(بـایجۆ ) ئەگەر نەبـوبێتە موسـڵمانیش خێـزانەکەی کـاریگەرێکی ئەرێنـی هەبـووە بەسـەرییەوە بـۆیە، سسـتی دەکـا لە ڕۆیشـتن بەرەو بەغـدا، لەدوای گرتنی بەغداو تەواوی عێراق هەر لەساڵی (٦٥٦) هۆلاکۆ فەرمـان دەکا بەکوشـتنی بـایجۆ لەکتێبی (النجوم الزاهـرة لاپەڕە ٥٠ بەرگـی ٧ : هـاتوە کە وەزیـر (ابـن العلقمـی ) بەهۆلاکـۆ دەڵـێ: بـایجو پەیوەنـدی ژێـر بەژێـری لەگەڵ خەلیفە هەبووە، ئەوکـاتەی هێزەکـانی (بـایجۆ ) خۆرئـاوای بەغـدایان گەمارۆ دابـوو، کوشتنەکەشـی هەنـدێك دەڵـێن ژەهـر خـوارد کـرا هەنـدێکیش دەڵێن هۆلاکۆ فەرمانی دەرکرد و لەگەردەنی درا، هەروەها لەکتێبی (تـاریخ الخمـیس فـی احـوال انفـس النفـیس لاپەڕە ٤٢٩) باسـی هەمـان هۆکـاری کردوە لە کوشتنی (بایجو) بەهەر حاڵ دەگەڕێینەوە سەر بابەتەکەمان .

ئەو کاتەی خەلیفە بۆی ڕوون دەبێتەوە کە هۆلاکۆ تازە ناگەڕێتەوەو نیـازی گرتنی بەغـدایە، داوا لەو سـەربازو سـەرکردەکانی دەکـات کە خۆیـان ئامـادە بکەن بۆ جەنگ، بەڵام خەڵکەکە بەتـایبەت باڵی سـەربازی خیلافەت زۆر دەمێك بوو پـارەو پوڵیـان لێبڕابـوو، تەنـانەت هەنـدێك لەسـەربازەکان خەریکـی سـواڵکردن بـوون لە بازاڕەکـانی بەغـدا، ئەوە لەکاتێکـدا کە خەلـیفەو وەزیـرو دارو دەستەی دەسەڵات لەو پەڕی خۆشی و ڕابواردن دەژیان.

# هەوڵی (مجاهدالدین ئەیبەك دوادار) بۆ گۆڕینی خەلیفە

خـاڵێکی زۆر گرنـگ لێـرە ئامـاژەی پێـبکەین، هەنـدێك لەسـەرچاوە مێژوویییەکان بۆنمونە جامع التواریخ (رشید الدین فضل الله الهمذاني) باس لەوە دەکا، کە کێشەیەکی زۆر گەورە دەکەوێتە نێوان (مجاهدالدین ئەیبەك) و وەزیـر (ابـن العلقمـی) هۆکـاری کێشـەکەی ئەوەیە، وەزیـر(ابن العلقمـی) دەچێـتە لای خەلـیفەو دەڵـێ: مجاهدالـدین ئەیـبەك مەبەسـتیەتی جەنابـت لەسـەر تەختـی خـیلافە لابـدا و (ابـوبکر)ی کـوڕت بکـاتە خەلـیفە[1] ئەو کـاتیش خەڵکی بەغـدا زۆر بێزار بـوون لەخەلـیفەو حـوکمی عەبباسـییەکان، ڕەشیدەدین لەکتێبەکەی (جامع التـواریخ) لەلاپەڕە **٢٧٣** بـاس لەوە دەکـا کە زۆر جـار سـەرکردەکان وەکـو (سلیمان کـوڕی پەرچەم و فـتح الـدین کـوڕی کەڕ و مجاهـد الـدین کـوڕی ئەیـبەك) لەلای وەزیـر(ابن العلقمـی) کۆدەبـوونەوەو گلەییـان لەخەلـیفە دەکـرد کە ئەو پیـاوێکە تەنها هـاوەڵایەتی گـۆرانی بێـژو هەوەسـبازەکان دەکـا، کەچـی ئـێمەی سـەرکردەی سـەربازی پشتگوێخستوە، ئەو قسانەی هەموی لەڕێی وەزیر (ابن العلقمی) دەگاتەوە

---

(١) طبقات ناصرى، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢٠٧.

خەلیفە، بۆیە خەلیفە بەدوای (مجاهد الدین کوڕی ئەیبەك) دەنێرێ و دەڵێ: وەزیر (ابن العلقمی) ئاوای پێگوتوم بەڵام، من باوەڕم بەقسەکەی وەزیر نەکردوە ویستم لە خۆت بپرسم؟ (مجاهدالدین کوڕی ئەیبەك) بەهانە دێنێتەوەو دەڵێ: ئەوە یەکێکە لەدرۆکانی (ابن العلقمی) تەنها مەبەستی تێکدانی نێوانی من و تۆیە لەبەر ئەوەی (ابن العلقمی) ژێر بەژێر پەیوەندی لەگەڵ (هۆلاکۆ) دروستکردوەو سیخوڕی بۆ ئەو دەکا، ئینجا خەلیفە قسەکانی (مجاهدالین کوڕی ئەیبەك) قبوڵ دەکات و لەبەغدا هەواڵ بڵاو دەکەنەوە کە (کوڕی ئەیبەك) خاوەن ڕیزێکی زۆر تایبەتە لای خەلیفە و کەس نەکا گومانی خراپی پێببا، لە وتاری هەینی دوای ئەوەی دوعا بۆ خەلیفە دەکرا دوعا بۆ (مجاهد الدین کوڕی ئەیبەك)یش دەکرا.

جا ئێمە دەتوانین دەربارەی ئەو ڕیوایەتە قسە لەچەند ئەگەرێك بکەین کە هەر هەموی لە بەرژەوەندی (مجاهد الدین ی کوڕی ئەیبەکە).

یەکەم: ئەگەر ئەوە بوهتانێك بێ وەزیر (ابن العلقمی) بە (مجاهد الدین)ی کردبێ، بێ گومان مەبەستی تێکدانی نێوان خەلیفەو گەورە سەرکردەکانی بووە، بۆئەوەی جۆرێك لە نامتمانەیی بکەوێتە نێوان خەلیفەو گەورە سەرکردەکانی، ئیتر هەر پێشنیارێکی بەسود بۆ خەلیفە بکرێ، خەلیفە لە چوار چێوەی پیلان بۆ لادانی ئەو هەژماری بکا، لەهەمان کاتیشدا بەکێشە خستنە نێوان خەلیفەو سەرکردە سەربازییەکان (ابن

العلقمی )چـاكتر دەتـوانێ یـارییەكەی خـۆی بكـاو پـیلانەكەی لەگەڵ (هۆلاكۆ) چاكتر سەردەگرێ.

دووەم: ئەگەر ئەوە ڕاست بێ كە (مجاهدالدین كوڕی ئەیبەك) هەوڵی گـۆڕێنی خەلـیفەی داوە، هەروەكـو (ابـن العلقمـی) دەڵـێ، ئەوە دیسـان شایەدییە بەدڵسۆزی (مجاهد الدین) لەبەرئەوەی ویستویەتی ئەگەر لەدوا ساتیش بێ بەغدا لە دەست خەلیفەیەكی دونیا ویستی لاواز ڕزگار بكا و كەسێكی بەهێز بهێنێتە جێی، كە خەمی ئوممەتی لەبەر بێ نەك تەنها خەمـی كۆشـك و تەلاری خـۆی، ئەوەش ئەوەمـان بیردەخاتەوە كە لەساڵی (٦٤٠) كـۆچی موستەعصـیم كـرا بەخەلـیفە لەو چـاكتر هەبـوو بەتـایبەت بـراكەی موستەعصـیم بەنـاوی (خوفـاجی) كەپیـاوێكی ئـازا بـووە، بەڵام سەركردە سەربازی و وەزیرەكانی بەغدای ئەو كات موستەعصیمان هەڵبژارد لەبەر ئەوەی خاوەن كەسایەتێكی لاواز بوو، سوك و ئاسان دەیان توانی بەو شێوەیە ئاراستەی بكەن كە ئەوان مەبەستیانە، لە كتێبی (كنز الدرر وجامع الغرر) بەرگی ٧ لاپەڕە ٣٤٩ دا هاتووە: وكان لهما اخ یعرف بالخفاجی كان یزید علی المستنصر بالله فی الشهامة، وكان یقول (ان ملكني الله أمر الامة لاستنقذن من التتار جمیع ماملكوه من بلاد المسلمین) فاضرب عنه أرباب الدولة لشهامته، ومالوا للمستعصم، للینه ولیكونوا الحكام علیه وكان ذلك لامر قد قدر وكان فیه هوج وطیش وظلم مع بله وضعف وانقیاد الی اصحاب السخف یلعب بطیور الحمام ویركب الحمیر المصریة الفره غیر

ناظر الى امر مصالح المسلمين ولا مفكر في عواقب الزمان وهو اخر خلفاء بني العباس ببغداد .

واتە ئەو برایەی کەناوی (خفاجی) بوو دەیگوت ئەگەر ببم بە خەلیفەو ئەمری ئەو ئوممەتەم بکەوێتە دەست ئەوا هەموو ئەو شوێنانە دەگێرمەوە کە تەتارەکان داگیریان کردوە، بەڵام دارودەستەی دەسەڵات کەئەوان خاوەن بڕیار بوون هەتا لەدانانی خەلیفە ئەوان (موستەعصیمان) هەڵبژارد لەبەر ئەوەی (موستەعصیم) خاوەن کەسایەتییێکی لاواز بوو، بەو شێوەیە ئاڕاستە دەکرا کە سەرکردەو وەزیرو خاوەن دەسەڵاتەکانی (کۆشکی خیلافەت) هەوەسیان دەکرد.

کەوابوو دور نییە ئەو هەوڵەی (مجاهدالدين ی کوڕی ئەیبەك) بۆ ئەوە بوبێ کە خیلافەت ڕزگار بکا و کەسێکی بوێرو ئازا بباتە سەر کورسی خیلافەت، بەڵام لە هەردوو ئەگەر دیارە، وەزیر (ابن العلقمی) چ ڕۆڵێکی پیسی گێراوە و ڕێی نەداوە حاڵەتەکە بەرەوباشی بڕوات[(١)] .

---

(١) بۆ ئەو بابەتە بگەڕێوە سەر کتێبی العسجد المسبوك، لاپەڕە ٦١٦.

# گفتوگۆی نێوان (فەتح الدین ی کورد)ی هەولێری و خەلیفە موستەعصیم

لەکتێبی (تاریخ مجموع النوادر) دا لاپەڕە **١٥٣** دا هاتوە:

حەوت سەرکردەی سەربازی گەورە لە بەغدا هەبون، هەر سەرکردەیەك نزیکەی دە هەزار سەربازی هەبوو، خەلیفەش بەتەنها حەفتا هەزار سەربازی هەبوو، کۆی گشتی سوپا لەبەغدا نزیکەی (١٤٠) هەزار کەس دەبوو، ئینجا خەلیفە داوای سەرکردەکانی دەکاو کۆبونەوەیەکی سەربازی دەکەن، یەکێك لە سەرکردە ناو دارەکانی سەربازی ئەو کات کەسێك بوو بەناوی (فتح الدین حسن بن کر الکردی الاربیلی) کە ناسراو بوو بەپاڵەوانی خیلافەت[1] ئەو پیاوە زۆر ئازاو ڕەشید بووە، لەساڵی **٦٤٣** خەلیفە دیاری تایبەتی پێدەبەخشێ کە شمشێرێك بووبە ئاڵتون ڕازاندرابوەوە جگە لەوەش چەندین ئاڵاو دروشمی خیلافەتی پێدەبەخشرێ.[2]

سەرەتا خەلیفە ڕوو لەو دەکات دەڵێ چی بکەین ؟

(١) طبقات ناصری، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢٠٨.
(٢) العسجد المسبوك، لاپەڕە ٥٣٧.

(فتح الدين) دەڵێ:

قوربان سوپاکەی مەغۆل سوپایەکی گەورە و بەهێزە، ئێمەش پێویستمان بەهێزێکی گەورە هەیە بتوانین ڕوو بەڕووی هێزەکەی مەغۆل ببینەوە، بۆیە پێشینار دەکەم و دەڵێم: لە بەغدا چەند بنەماڵەیەکی زۆر هەن کاتی خۆی خزمەت کاری خەلیفە بووینە، ئیستا ژمارەیان دەگاتە نزیکەی بیست هەزار کەس، هەر یەك لەو خزمەتکارانە بەتەنها نزیکەی (٤٠٠_٥٠٠) ئەسپی هەیە، با ئەو ئەسپانە لەو خزمەتکارانە وەربگرین، منیش ئەو ڕۆ تا بەیانی چل هەزار کوردت بۆ ئامادە دەکەم ئەو ئەسپانە بەسەر ئەو خەڵکە دابەش دەکەین هەر کوردێکیش (١٠٠٠) درهەمی دەدەینێ، واتە هەر سەربازێکی کورد ئەسپێك و (١٠٠٠) هەزار درهەمی دەدەینێ، ئینجا دەچین بەری سوپاکەی هۆلاکۆ دەگرین، ئەگەر سەرکەوتین ئەسپەکان دەدەینەوە خاوەنەکانیان خۆ ئەگەر هۆلاکۆ سەرکەوێ ئەو ئەسپ و ماڵەی ئەو خزمەتکارانانە هەر دەبا.

خەلیفە لەوەڵامدا دەڵێ: ئاخر ئەوانە کاتی خۆی خزمەتی باو باپیرانی ئێمەیان کردوە و چۆن دەکرێ ئەو ماڵەیان لێبسەنینەوە! (فتح الدين) دەڵێ: قوربان خوا نەخواستە خۆ ئەگەر بشکێین ئەو ماڵە هەر دەڕوا، بەڵام ئەگەر سەرکەوتین دەیان دەینەوە.

خەلیفە دەڵێ: نەخێر چارەیەکی تر؟ ئێمە ناکرێ لەو کات و ساتە دڵی ئەوانە بشکێنین کە خزمەتی ئێمەیان کردوە.

ئینجا (فتح الدین) دەڵێ: قوربان ڕێگایەکی ترم هەیە، ئێمە هەموو دەچینە دەرەوەی بەغدا و ڕوو بەڕووی هۆلاکۆ دەبینەوە خۆشت وەرە لەگەڵمان موسڵمانان بزانن ئەوە خەلیفە خۆی هاتۆتە جەنگ ئەوا ورەیان بەرز دەبێتەوە وەکو پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ هاوەڵەکانی، جەنابیشت ئاوا بکە ئەو خەڵکە هەموی لەدەورت کۆدەبێتەوە، بەڵین بێ خۆم و سەربازەکانم لەبەر دەست و پێی تۆ دا بکوژرێین.

خەلیفە دەڵێ: با کوڕەکەم بێ لە باتی من، (فتح الدین) دەڵێ قوربان کوڕەکەت شوێنی تۆ ناگریتەوە، خەلیفە دەڵێ: دەی تۆ لەباتی من بە، ئەویش دەڵێ: قوربان منیش جێی تۆ ناگرمەوە، ئینجا خەلیفە دەڵێ: ئەوەش سەختە چارەیەکی تر ڕێگایەکی تر بدۆزەوە(فتح الدین) دەڵێ: والله لەوە زیاترم نییە پێیتی بڵێم .

خەلیفە خەریکی ئەو دانیشتنانەیە مەغۆلەکان لە دەوروبەری بەغدا بەدەر دەکەون، لە ڕۆژی پێنج شەمەی چواری مانگی موحەرەم (٦٥٦) کۆچی تەپ و تۆزەکی زۆر گەورە لەئاسمانی بەغدا بەدەرکەوت، خەڵکی بەغدا هەمووی چونە سەربان و شوێنە بەرزەکان کەسەیریان کرد دەوری بەغدا بەتەواوی لەلایەن مەغۆلەکان گەمارۆ دراوە.[١]

هێزەکەی (بایجو) لە تورکیای ئێستاوە بەڕێ کەوت، بۆ موصل لەوێوە بۆ خۆرئاوای بەغدا، مجاهدالدین ئەیبەك ڕوو بە ڕووی هێزەکەی (بایجۆ)

---

(١) الفخری للاداب السلطانیة، لاپەڕە ٣٣٦.

دەبێتەوە، سەرەتا مەغۆلەکان وایان نیشاندا کە شکاون وبەڕوی هێزەکەی مجاهدالدین ئەیبەك دەکشێنەوە، موسڵمانەکانیش دەکەونە دوایان و زۆریان لێدەکوژن، (فتح الدین)ی هەولێری دەڵێ: بەدوای هێزەکان مەکەون لەبەر ئەوەی ئەوە پلانە بۆ ڕاکێشانی هێزەکانی ئێمە بۆ ئەو شوینەی کە مەغۆلەکان مەبەستیانە، بەڵام (مجاهدالدین کوڕی ئەیبەك) بەقسەی (فتح الدین) ناکا ئەوە بوو سەری نایە دوای هێزەکانی مەغۆل تا گەیشتە دەورو بەری شاری ئەنبار، ئینجا کەشەویان بەسەر داهات ڕێگایان گیرا لەبەر ئەوەی تەتارەکان بەنداوێکییان لە وێ شکاندوو ئاو ڕێی موسڵمانەکانی گرت و نەیانتوانی بگەڕینەوە دەورو بەری بەغدا و مەغۆلەکان گەڕانەوە و دەستیان کردە هێرشێکی زۆر توند بۆ سەر موسڵمانان لەو سەرکردانەی لەوێ دەکوژرێن (فتح الدین) ی هەولێری و (قراسنقر) بوون خوای گەورە بەشەهیدیان قبوڵکات.[1] (مجاهدالدین کوڕی ئەیبەك)و چەند کەسێکی تر ڕادە کەن و دەگەڕینەوە بەغدا و تەنها لەو شەڕە نزیکەی دوازدە هەزار موسلمان شەهید دەکرێن خوای گەورە بەشەهیدیان قبوڵ کات، دوای ئەو شکەستە (مجاهد الدین) پێشنیاردەکا بۆخەلیفەو پێی دەڵێ: هێزی هۆلاکۆ هێزێکی زۆر گەورەیە نزیکەی (٢٠٠) هەزار کەسە، پێم وایە ئەو شەڕە بەو حاڵەوە بەئێمە ناکری بۆیە چەند کەشتییێك ئامادە دەکەین خۆت و بنەماڵەکانت لەگەڵ پارەو پوڵەکانت بەکەشتی ڕزگار دەکەین ئێمەش بەکەشتییێکی تر بەدوات دادێن و دەچینە

---

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٨٥

بەصرە تاوەکو لەوێوە خۆمان بەچاکی ئامادە بکەین، خەلیفە پرس بە (ابن العلقمی) دەکات و ئەو وەزیرەش دیسان خیانەتێکی تر دەکات و خەلیفە قەناعەت پێدەکا کە با دانوساندن لەگەڵ هۆلاکۆ بکەین، پێویست بەوە ناکا جەنابت بەغدا چۆڵ بکەی، خەلیفە بەقسەی وەزیر (ابن العلقمی) کردو بۆچونی سەرکردە سەربازییەکانی قبوڵ نەکرد[1] ئەوە لەکاتێك بەرد باران کردنی شاری بەغدا بەمەنجەنیق بەردەوامەومەغۆلەکان بەردیان دەستنەدەکەوت لە دەورو بەری شاری بەغدا، بۆیە دەهاتن لەشاخی حەمرین و جەلەولاوە بەردیان دەگواستەوە بۆ ئەوەی ڕایوەشێننە سەر بەغدا و دارخۆرمایەکی زۆری شاری بەعقوبەشیان بڕییەوە و کۆڵکە دارەکانیان بەمەنجەنیق ڕادەوەشاندە سەر بەغدا.[2]

ئینجا وەزیر (ابن العلقمی) دەڵێ: دەچم دانوساندن لەگەڵ هۆلاکۆ دەکەم (ابن العلقمی) دەچێتە دەرەوەی بەغدا و چاوی بەهۆلاکۆ دەکەوێ، لەگەڵی پێك دێ کە قەناعەت بەخلیفە بکاو خەلیفە بنێریتە لای هۆلاکۆ و (ئەمان) بۆ خۆی وەردەگرێ، هەندێك لەسەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن سەرەتا هۆلاکۆ قەناعەتی کردبوو کە داهاتی عێراق بکرێتە نیوە نیوەی بۆ خەلیفە و نیوەی بۆ ئەو بێ، بەڵام (ابن العلقمی و نصیر الدین طوسی)

---

(١) طبقات ناصری، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢١٠.

(٢) تاریخ المغول/ عباس اقبال، لاپەڕە ٢٠١. مختصر تاریخ، لاپەڕە ٢٨٤ / الشیخ ظهیرالدین علي کوڕی محمدی بەغدادی ناسراو بە (ابن الكازروني) لەساڵی ٦١١ لەدایك بوە ٦٩٧ وەفاتی کردوە . جامع التواریخ، لاپەڕە ٢٨٧.

هۆلاکۆ پەشیمان دەکەنەوە پیی دەڵێن: ئەگەر ئەوە بکەی هەر ساڵێك یان دوو ساڵ دەخایەنێ و هێزو پادشاکان لەدەوری خەلیفە کۆدەبنەوە و لە گوێرایەڵیت دەردەچن بۆیە واچاکە خەلیفە بکوژی، [1] (ابن علقمی) قەناعەت بە هۆلاکۆ دەکا کە سەرەتا وەفدێك دەنێرێ، ئەبوبەکری کوڕی خەلیفە لەگەڵ ئەو وەفدە دایەو با ڕیز لەو وەفدە بگیرێ، بۆ ئەوەی کوڕی خەلیفە کە گەڕایەوە بەباوکی بڵێ هۆلاکۆ ڕیزی لێگرتین و خەلیفە قەناعەت بکا کەبچێتە لای هۆلاکۆ، ئەبوبەکری کوڕی خەلیفە دەچێتەلای هۆلاکۆ دیارە ڕیزی لێدەگیری و لە قسەکان هۆلاکۆ پێی دەڵێ (بەرەکە)ی مامیشم بۆتە موسڵمان[2] و دیارە بەشیوازێکی وا قسەی لەگەڵ دەکا کە بگەڕێتەوەلای باوکی و قەناعەت بەباوکی بکا خۆی بەدەست بدا، لەو بەینەش (ابن العلقمی) هاتو چۆی دەکرد لەنێوان خەلیفەو هۆلاکۆ، (ابن علقمی) کە بۆ دوا جار دەگەڕێتەوە لای خەلیفەو گوتی قوربان هۆلاکۆ مەبەستیەتی کچەکەی خۆی لە کوڕەکەت مارە بکات و تۆش لەسەر خیلافەت دەمێنیتەوە، پەیوندی هۆلاکۆ و جەنابتان وەکو پەیوەندی نێوان باو باپیرانت و سوڵتانی سەلجوقی و خەواریزمییەکان دەبێت بەم شێوەیە قەناعەتی بە خەلیفە کرد کە بچیتە لای هۆلاکۆ[3]، ئالەو کاتە هێزەکانی بەغدا دەچنە سەر دیواری شارەکە و مەنجەنیقەکان ئامادە دەکەن، بەڵام

---

(١) بروانە عقد الجمان فی تاریخ أهل الزمان لاپەرە ١٧٣ . ڕووداوەکانی ساڵی (٦٥٦).
(٢) طبقات ناصری، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢١٠.
(٣) مراە الجنان وعبرە الیقظان، بەرگی ٤ لاپەڕە ١٠٦.

ئەوبەردانەی کە ڕایدەوەشێنن هیچیان هەدەفەکان ناپێکن، لەبەرامبەر ئەوەش مەنجەنیقی مەغۆلەکان هەدەفەکانی خۆیان زۆر چاك دەپێکن، هۆکارە کەشی ئەو چەکانە لەبەغدا بوون بۆ ماوەی چەندین ساڵ وەکو پێشەنگا دانرابوون، هیچ خزمەتێکی سەربازی ئەو چەکانەش نەکرا بوو، بەر لەوەی مەغۆلەکانیش ڕوو لە بەغدا بکەن، حاڵی هێزە سەربازییەکەی بەغدا ئەوەندە شڕ و بێ پارە بوون، زۆر جار سەربازەکانی سوپای خەلیفە لەبازاڕەکانی بەغدا سواڵیان دەکرد بۆیە دیسان دێینەوە سەر تاوانی وەزیر (ابن العلقمی) کە لەو کاتەی پەیوەندی لەگەڵ هۆلاکۆ پەیداکرد یەکێك لەدواکارییەکانی هۆلاکۆ لەو وەزیرە ئەوە بوو کە بەپێی توانا سوپای بەغدا کەم کاتەوە (ابن العلقمی) بەخلیفە دەڵێ: پارەیەکی یەکجار زۆر خەرج دەکرێ بۆ ئەو سەربازانە وهیچ کاریشیان نییە ناوی زۆر لەسەر بازەکان لە دیوان کەم دەکاتەوە واتە موچەی زۆرێك لەسەربازەکان دەبڕی و ئەوەشە هۆکاری ئەوەی کە زۆر لەو سەربازانە بکەونە سواڵ کردن[1] ئەو جۆرە هێزە چۆن پێی دەکرێ، ڕوو بەڕووی سوپایەکی وەکو سوپای هۆلاکۆ ببێتەوە کە ڕۆژانە لەگرتنی شوێنەکان ئەزمون و چەکی تازەیان دەست دەکەوت، ئینجا سەرکردە سەربازییەکان و بەخودی خەلیفەش، کە ڕسکاوی بەر سەمای ئافرەت و سێبەری تەلارەکان بوون چۆن پێیان دەکرێ ڕوو بەڕووی هۆلاکۆ و سەرکردەکانی دەورو بەری هۆلاکۆ ببنەوە، کە ئەزمونی جەنگ گەورەی کردبوون.

---

(١) بڕوانە (تاريخ الخميس فی احوال انفس النفيس، لاپەڕە ٤٢٩ )

مەغۆلەكان نامەیەكی زۆر دەنوسن و بەتیر دەیهاوێژن بۆ خەڵكی بەغدا و دەڵێن: ئەوەی شەڕی ئێمە نەكا ئەوا گیانی پارێزراوە [1]، بەمەش مەغۆلەكان ڕاستەو خۆ هاتنە سەر خەت و توانیان ورەی زۆرێك لەو خەڵكە بڕوخێنن و هیچ ئومێدێكیان بە بەرنگار بوونەوەو شەڕی مەغۆلەكان نەمێنێ، خەڵكی بەغدا هەندێكیان ڕادەكەن بەرەوشاری (حلە و كوفە) دواتر ڕێی ڕاكردنیش بەتەواوی دەگیرێ و بەغدا لە ١١ مانگی موحەڕڕەم بەتەواوی نەفەس بڕ دەكرێ بەشێوەیەكی وا كە كەس نەتوانێ لێی دەرچێ تەنانەت لەڕێی ڕوباری دیجلەوەش بە بەلەمی بچوك هیچ كەس نەیتوانی خۆی ڕزگار بكات.[2]

هێرشەكان زۆر بەتوندی بەردەوام دەبێ بۆسەر شارو بەتوندی دیواری شار و (قوللە) بورجی سەردیوارەكان بەرد باران دەكرێ و یەك بەدوای یەك دەڕوخێنرێ، گەورە قوللەیەك كەناسراو بوو بەقوللەی عەجەم، دەگیرێ و لە ٢٥ مانگی موحەرەم تەتارەكان دەگەنەسەر دیوارەكانی بەغدا، خەڵكەكەی بەغدا ئیتر دەست بەڕاكردن دەكەن هەندێكیان دەچنە سەربانەكان بەو ئومێدەی لەوێوە بتوانن بەرەنگاری هێزەكان ببنەوە هەندێكی تر ڕادەكەنە ژێرزەمین و ئەو چاڵ و بیرانەی بەمەبەستی خۆشاردنەوە هەڵیان كەندبوون هەندێكی تر ڕوو دەكەنە نێو قەبرستانەكان و كوڵخانی حەمامەكان لەوێ خۆیان حەشار دەدەن، هێزەكانی بەغدا بە تەواوی دەشكێندرێ، و لە (٤

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٨٧.

(٢) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٨٦ .

مانگی صەفەر) خەلیفە تەسلیم بە هۆلاکۆ دەبێ یەکەم داوای هۆلاکۆ لەخەلیفە ئەوەیە کە داوا لەو خەڵکە بکەن چەك دانێن وچیتر نەجەنگن ئەوە بوو نوێنەری خەلیفە داوای لەخەڵکی بەغدا کرد کە چەك دابنێن و خەڵکەکە چەکیان دانا، ئینجا سوپای هۆلاکۆ لە ٧ مانگی سەفەر دەگەنە ناو شاری بەغدا[1] وشك و تەڕ پێکەوە دەسوتێنن، دەست ناپارێزن لە گەنج و پیرو پەککەوتەو ژن و مناڵ هەر هەموی دەکوژن مەگەر ئەو ئافرەتانەی عەقڵیان گرتبا و پێیان جوان با دەیانبردن و ئەوەی تریان هەر هەموو کوشت، ئینجا ڕوویان کردە سەربانەکان ئەوانەی چووبونە سەربانەکان بەئومێدی بەرەنگار بوونەوە هەر لەسەربارنەکان کوژران و زۆربەری سولاوکەی ماڵەکان خوێنیان لێدەچۆڕایەوە، گەڕەکەکانی بەغدا هەموی خوێن تێیدا گۆمەی کردبوو، گومەزی مزگەوتەکانیان هەڵتەکاند بۆ لێکردنەوەی ئەو بەشە ئاڵتونەی کەتێدابوو ماڵ بەماڵ گەڕان و کاولیانکرد ئەوەی بەنرخ بوو بردیان، مەغۆلەکان لەبری ئەوەی خشت و بەرد بێنن بۆ ئەوەی ئاخوڕ بۆ ئاژەڵەکانیان دروست بکەن بە کتێب ئاخوڕیان بۆ ئاژەڵەکان دروست دەکرد، بەغدا بەگشتی سوتێنرا هەزارا کتێبی بەنرخ خرایە ڕووبارو ئەوەی تر هەر هەموی سوتێنرا، گەڕەکەکانی بەغدا ڕێی هاتو چۆی نەما لەبەر زۆری کوژراوەکان، دڕندایەتی مەغۆل گەیشتبوە ئەو ئاستەی لە چەند گەڕەکێك نزیکەی چل منداڵ کۆکرابوونەوە دایك و باوکیان کوژرابوون، منداڵەکانیش دەگریان یەکێك لەتەتارەکان دەڵێ ئەو منالانە

---

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٩١. المغول فى التاريخ، لاپەڕە ٢٦٤.

گوناهن بێ دایك و باوك ماونەتەوە هەر هەمویان لەوێیا دەکوژێ[(١)] ژمارەی کوژراوەکان لە بەغدا لە (٨٠٠) هەزار کەس تاوەکو یەك ملیۆن دەبێ، ماڵی نەسرانییەکان سەلامەت دەبێ ناکەوێتە بەرهێرشی تەتار، ئەوەی چوبوە ئەوماڵانە ئەوانیش سەلامەت بوون، مالی هەندێك بازرگانی گەورە کەپێشتر ئەمانیان لە هۆلاکۆ وەرگرتبوو ئەوانیش سەلامەت دەبن لەگەڵ ماڵی وەزیر (ابن العلقمی) ئەوەی تر هەموی کاوڵ دەکرێ، لەدوای ئەوکوشتارە باران دەبارێ، لاشەکان زۆربەی بۆگەن دەبێ ئەوەی بە دەستی مەغۆلەکان نەکوژرا بە نەخۆشی دەمرێ، بۆنی لاشەکان ئەوەندە زۆر بوو کە خودی هۆلاکۆ نەیتوانی لەبەغدا بمێنتەوە و بڕیاری دا بچێتە دەرەوەی بەغدا لە ١٤ مانگی سەفەر هۆلاکۆ بەغدا جێدەهێڵێ و دەچێتە دەروەی شار، ئینجا نەخۆشیەکی زۆر بڵاو بویەوە لەبەر ئەوەی (مێش و مەگەز) لەسەر لاشە گەنیوەکان دەنیشتن دواتر بنیشتبانە سەر هەر خۆراکێك نەخۆشیان لەگەڵ خۆیان بڵاو دەکردەوە[(٢)] کەسایەتیێکی زۆری ئاینی و وتار بێژ و قازیە ناو دارەکان یەك بەیەك بانگ دەکران و لەگەردەنیان دەدرا لەوانەی کە ناویان هەبوو لای (هۆلاکۆ) مجاهدالدین کوڕی ئەیبەك و کوڕەکەی و سلیمان شاە ئەوانە هەر سێکیان لەگەردەنیا دەدرێ و سەرەیان لەلاشە جودا دەکریتەوەو، سەرەکانیان دەنێردردرێ بۆ موصڵ و داوا دەکرێ لە (بەدرەدین لؤلؤ) حاکمی موصل کە ئەو سەرانە

---

(١) المغول فی التاریخ، لاپەڕە ٢٦٦.

(٢) الحوادث الجامعة ابن الفوطی، لاپەڕە ٢٣٧.

لە بەر دەرگای شاری موصڵ هەڵبواسی، ئەویش گەرچی زۆر برادەری (سلیمان شاه) دەبێ، بەڵام لەترسی هۆلاکۆ سەرەکانیان هەڵدەواسێ، هەروەها شیخ (محی الدین کوڕی شیخ یوسف کوڕی ئیمام ابو الفرج ابن الجوزی) ئەویش دەکوژرێ لە گەڵ هەرسێ کوڕی (عبدالله و عبدالرحمن و عبدالکریم) گەورە پیاوانی دەوڵەت یەك بەیەك دەهێنران و لەگەردەنیان دەدرا، ئینجا بنەماڵەی خەلیفە لەمام و ئامۆزا بەخێزانە وە دەبردرانە دەرەوەی شار لەسەر گۆرستانێك پیاوەکان یەك بەیەك لەگەردەنیان دەدرا، ژنەکانیشیان بە کەنیزەك دەگیران، بنەماڵەی (عەبباس) دەتوانین بڵێین قڕکران بەدەست هۆلاکۆ تەنها چەند کەسێکیان نەبێ کە زوو بەرەو ئەنبار لەوێوە بەرەو شام ڕایانکرد.[1] ویلیام جیمس دیوڕَانت لەکتێبی قصة الحضارة (١٣/ ٣٨٠) دەڵێ:

ولسنا نعرف أن حضارة من الحضارات في التاريخ كله قد عانت من التدمير الفجائي ما عانته الحضارة الإسلامية على أيدي المغول. نەمان زانیوە هیچ ژیارێك لەپڕ کاولکرابێ وەکو ئەو کاولکاریەی مەغۆلەکان بەسەر ژیاری ئیسلامیان داهێنا.

---

(١) البداية والنهاية ط الفكر (١٣/ ٢٠٣).

# چۆنیەتی کوشتنی خەلیفە موستەعصیم

دوای ئەوەی خەلیفە قەناعەت دەکا کەبچێ بۆ لای هۆلاکو، خۆیی و (٧٠٠) کەس پێکەوە بەڕێ دەکەون بۆ لای (هۆلاکو) ئەوانەی لەگەڵی بوون، زۆربەیان کەسی دیارو دارو دەستەی دەوڵەت بوون، وەکو وەزیرو قازی و زاناو وتار بێژەکان، بەر لەوەی بگەنەلای هۆلاکۆ ڕێیان پێدەگیرێ و تەنها حەڤدە کەسیان ڕێپێدەدەن بگەنە لای هۆلاکۆ ئەوانی تر هەر هەموی جودا دەکەنەوە و هەر لەوێ لەگەردەنیان دەدەن، ئینجا خەلیفە و ئەوانەی لەگەڵی دەبن دەستبەسەر دەکرێن و خەلیفە بەتەنها دەکرێتە ڕەشماڵێکەوەو جارجار دەهاتە لای ئەوانەی تر پێی دەگوتن دوعام بۆ بکەن، [1] لە ٩ مانگی صەفەر، هۆلاکۆ دەچێتە کۆشکی خەلیفە و دەڵێ: خەلیفەم بۆ بێنن، کە خەلیفە دێنن هۆلاکۆ پێی دەڵێ: تۆ خاون ماڵ و ئێمەش میوان دەی بزانم چیمان بۆ دێنی لایەق بەئێمە بێت.

خەلیفە: دەلەرزی لەترسان ئاوا شێوا بوو نەیزانی کلیلی خەزێنەکانی لەکوێ داناوە، بۆیە خەزێنەکان دەشکێنن و ئەوەی تێدایتی دەیداتە هۆلاکۆ، ئەوەی لەو خەزێنەدابوون پارچە ئاڵتون بەردی زۆر گران بەهابوون لەگەڵ

---

(١) کنز الدرر و جامع الغرر، بەرگی ٨ لاپەڕە ٣٥.

(٢٠٠٠) بەرگــی خەلــیفە کە هەمــوی لەقوماشــی زۆر گــران بەهــا دروستکرابوون، هۆلاکۆش هەر هەموی دابەشی سەر سەرکردە سەربازی و ئامادە بوان دەکات، ئینجا بەخەلیفە دەڵێ: ئەو ماڵەی کە لەسەر زەوییە ئەوە مولکی خزمەتکارەکانی ئێمەیە، بەڵام پێم بڵێ: ئەوەی شاردوتەەوە کوا لەکوێیە؟ ئینجا خەلیفە دان بەوە دەنێ کە چاڵێکی پڕاو پڕ ئاڵتونی لەباخچەکە هەیە، شوێنی چاڵەکەیان نیشان دەدا و ئاڵۆتەنەکان دەردێنن، چاڵێکی گەورە بوو پڕاو پڕ بوو لە پارچە ئاڵتون هەر پارچە ئاڵتونێك قورساییەکەی (١٠٠) مسقال بوو.

هۆلاکۆ دەڵێ: ئافرەتەکانی ماڵی خەلیفەم بۆ بژمێرن، (٧٠٠) ئافرەت لەماڵی خەلیفە دەردێنن لەکچ و خوشك و کەسە نزیکەکانی خۆی و نزیکەی (١٠٠٠) ئافرەتی خزمەتکاریش لەو کۆشکە دابوون، خەلیفە دەڵێ: لەو (٧٠٠)ئافرەتە هەندێکیان کەسە نزیکەکانی خۆمن، هۆلاکۆ پێی دەڵێ: (١٠٠)ئافرەت هەڵبژێرە و واز لەوانی تر بێنە، خەلیفە (١٠٠)ئافرەت هەڵدەبژێری لە نزیکەکانی خۆی، بەم شێوەیە ئەوەی خەلیفە عەبباسییەکان کۆیان کردبوەوە لەماوەی ئەو (٥٠٠) ساڵە هۆلاکۆ هەر هەموی دەبا.[1] لە ١٤ مانگی صەفەر هۆلاکۆ فەرمان دەکا بەکوشتنی خەلیفە، سەرەتا هەندێك لەوانەی لەدەورو بەری هۆلاکۆبون گوتیان ئەگەر خەلیفە بکوژی و خوێنی خەلیفە بڕژێتە سەر زەوی ئەوا نەگبەتیەکی گەورە ڕوو لەخۆت

(١) جامع التواريخ، لاپەڕە ٢٩٤.

و لەسوپاکەت دەکا، مەبەستیان وابوو هۆلاکۆ بترسێنن لە کوشتنی خەلیفە، بەڵام هەندێکی تر دەڵێن دەیان خەلیفە کوژراوە و هیچیش ڕووی نەداوە، وەئەگەر خەلیفە نەکوژرێ ئەوا دوای ماوەیەکی کەم دیسان خەڵکی لەدەوری کۆدەبنەوە، بۆیە لای هۆلاکۆ یەکلای دەبێتەوە کە کوشتنی خەلیفە بەرژەوەندێکی گەورەی تێدایە و فەرمان دەکا بەکوشتنی.

شێوازی کوشتنەکەی چۆن بووە، ئەوە چەند ڕیوایەتێکی جیاوازی لەسەرە، بەڵام زۆربەی سەرچاوەکان دەڵێن خەلیفەیان خستە لبادێك و بەلەقان کوشتیان، ئەوەش نەریتێکی مەغۆلەکان بووە کە مەلیکەکانیان بەوشێوەیە کوشتوە[1] ئینجا خۆشیان دەیشارنەوەو کەس نازانێ قەبری خەلیفە موستەعصیم لەکوێیە موستەعصیم ئەو کاتەی کوژرا تەمەنی (٤٦) ساڵ بوو، دوای ئەوە کوڕە گەورەکەی ابو العباس احمد دەکوژرێ کە تەمەنی (٢٥) ساڵ بوو. دوای ئەویش کوڕە ناوەندیەکەی ابو الفضل عبدالرحمن دەکوژرێ کە تەمەنی ٢٣ ساڵ بوو، کوڕە بچوکەکەش (ابوالمناقب مبارك) بەدیل دەگیرێ دواتر لە شاری (مراغە) لەساڵی (٦٧٧)وەفات دەکا[2] هەرسێ خوشکی خەلیفە (فاتیمە و خەدیجە و مەریەم) ئەوانیش بەدیل دەگیرێن.[3]

---

(١) نهایە الارب، بەرگی ٢٧ لاپەڕە ٢٥٨،

(٢) مختصر التاریخ ابن الکازرونی، لاپەڕە ٢٨٨.،

(٣) طبقات ناصرِی، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢١٤. عقد الجمان فی تاریخ اهل الزمان، بەرگی ٥ لاپەڕە ١٧٥.

ئینجا هۆلاکۆ بەنیاز بوو تەواوی بەغدا بسوتێنێ، بەڵام (کەتبغا نوین) کە یەکێك بوو لەسەرکردە سەربازییەکان، هۆلاکۆ پەشیمانی دەکاتەوەو دەڵێ: بەغدا شارێکی گەورەی بازرگانییە ئەگەر ئاوەدانی کەیتەوە داهاتێکی زۆری دەبێ بۆ جەنابتان، بۆیە هۆلاکۆ ڕێ بەو خەڵکە دەدا کە بەغدا ئاوەدان بکەنەوە[1] لەدوای ئەوە هۆلاکۆ هێزێکی گەورە دەنێریتە سەر شاری هەولێر هێزەکە شاری هەولێر گەمارۆ دەدا نزیکەی شەش مانگ، بەڵام ناتوانن هەولێر بگرن، ئینجا بەدرەدین لؤلؤ بە هێزەکەی مەغۆل دەڵێ: چاوەڕوان بکەن تاوەکو گەرما دادێ ئەوکات خەڵکەکە لەقەلایەکە دادەبەزن و گرتنی ئاسان دەبێ، بۆیە تەتارەکان گرتنی شاری هەولێر دەخەنە ئەستۆی بەدرەدین ئەوە بوو لەڕیی خیانەتەوە توانی شاری هەولێر بگرێ، لەکتێبی (زبدة الفكرة فی تاريخ الهجرة لاپەڕە ٤٣) دا کە باسی خەلکی هەولێر دەکا دەڵێ: فكانوا أقوى تلك البلاد عزيمة وأشدهم فی المصابر شكيمة. واتە خەڵکی هەولێر لەهەموو خەڵکی ناوچەکە ئازاو خۆڕاگرتر بوون، خەڵکی باشوری عێراقیش بەتایبەتی (حیلەو کوفە) ڕایانکردبووە بیابان دواتر گەورە پیاوەکانی شیعە وەکو مجدالدين بن طاوس العلوی و زۆری تر دەچنە لای هۆلاکۆ و ئەمان بۆ خەڵکی شارە شیعییەکان وەردەگرن و بەگەرمی پێشوازیان لە هێزەکانی مەغۆل کردو و ئەو ناوچانە

---

(١) زبدة الفكرة فی تاريخ الهجرة، لاپەڕە ٤٠

بەسەلامەتی ڕزگاریان بوو[١] دوای ئەو ڕووداوە خواردن لەبەغدا نەما بوو خەڵکی (کوفەو حلە) خواردنیان دەهێنا، لەبەرامبەر ئەوەش ئەوەی کتێبی نایابی هەبوایە کتێبەکانیان لەبری خۆراك وەردەگرت. شاری (واسیت) ئەوانیش دەستیان نەدا شەڕی مەغۆلەکانیان کرد، بەڵام ئەوانیش بەهەمان شێوە شکستی گەورەیان هێناو زۆریان کوژران و شارەکەیان کاوڵکرا، دەتوانین بڵێین ئەوەی لەعێراقی ئێستا بەرەنگاری مەغۆلەکان بویەوە تەنها شارە سوننییەکان بوو (هەولێر و بەغدا و واسیت و بەسرە) دواتر (موصل)یش دیتە ڕیزیان دوای مردنی (بدرالدین لؤلؤ)، لەمانگی جمادی یەکەم هۆلاکۆ بەغدا بەجێدەهێڵی و دەچێتە (مراغە) بەڕێوبردنی ئەو شارە تەسلیم بە علی بهادر و وەزیر مؤید الدین ابن العلقمی و فخر الدین ابن دامغانی و چەند کەسێکی تر دەکا.

---

(١) الحوادث الجامعە ابن الفوطی، لاپەڕە ٢٣٧.

# کەوتنی بەغدا لە ئەستۆی کێ بوو؟

کێ بەرپرسیار بوو لەکەوتنی بەغدا، بێ ئینصافییە ئەگەر تاوانی کەوتنی بەغدا هەر هەمووی بخرێتە سەر شانی موستەعصیم ی دوا خەلیفە، بەڵکو هەر سێ دوا خەلیفەی دەوڵەتی (عەبباسی) هەر یەکەو بە پشکێك بەشدارە لەو شکەستەی بەسەر نەك هەر بەغدا، بەڵکو بەسەر تەواوی جیهانی ئیسلامی داهات، هەر سێ دوا خەلیفە واتە ناصرڕلدین اللە (الظاهر لدین اللە)[1] و المستنصرباللە و المستعصم باللە، هیچ لەوانە خەمی تەواویان نەخوارد بۆ ئەوەی هێرشی مەغۆل بۆ سەرجیهانی ئیسلامی ڕابگرن، بەغدا ئەو کاتەی کەوت کە مەغۆلەکان هێرشیان کردە سەر دەوڵەتی خەوارزمییەکان و لەو بەری ڕووبارەوە پەڕینەوەو، یەك بەدوای یەکی دەوڵەتەکانی خۆر هەڵاتی جیهانی ئیسلامیان ڕووخاند، هەر سێ خەلیفە هەوڵیان نەدا (بەرەیەکی جیهادی) دروست بکەن تێیدا ووزەو تواناکان کۆبکەنەوە بڕیاری جیهاد بدەن، ئەو کات بێگومان لەتەواوی جیهانی ئیسلامی خۆبەخش کۆدەبونەوەو بەری ئەو شەپۆڵە سەر شیتەی مەغۆلیان دەگرت، هیچ لەو خەلیفانە هەوڵیان نەدا جەنگەکە ببنەوە ماڵی تەتارەکان،

(١) ماوەی حوکمی زۆر کەم بوو تەنها نزیکەی ٩ مانگ لەحوکم مایەوە.

بەڵکو هەڵوێستێکی بەرگری یان وەرگرت و تەنها خەمیان پاراستنی تەختی خیلافەت بوو هیچی تر نا، مێژوو تۆماری نەکردوە و نەیگێراوەتە هیچ خەلیفەیەك لەو سێ خەلیفانە سەکردایەتی سوپایەکی گەورەیان کردبێ وغەمی فتوحات و پاراستنی سنوری جیهانی ئیسلامیان لەبەربێ، زانایانی ئیسلامی وبیرمەند و سەرکردەکان ئەوانیش پشکیان هەیە لەوەی بەسەر جیهانی ئیسلامی داهات، دەکرێ بڵێین قسەی ئەوانە وەرنەدەگیرا لای خەلیفە، بەڵام دیسانەوە دەڵێین مێژوو بەپێی زانیاری ئێمە ئەوەی تۆمار نەکردوە کە زانایەك لەزانا گەورەکان هەوڵی گەڕانی دابێ لە وڵاتە ئیسلامییەکان، بۆ ورژاندن و هاندانی ئەو خەڵکەو بەو میللەتەی ڕاگەیاندبێ کە ئاگادار بن ترسێکی گەورە بەڕێوەیەو هەڕەشەیە بۆ سەر بونی ئەو ئوممەتە، ئینجا خودی خەلیفە موستەعصیم، گلەییەکی زۆری لەسەرە لەچاوچنۆکی و پارە ویستی هەر بۆنمونە کاتی خۆی یەکێك لە پادشای بنەماڵەی ئەییوبییەکان کەناوی (ناصرٍ داود کوڕی موعەزەم) بوو ئەو پیاوە بەپیلانی مامی و ئامۆزایەکی لەسەر حوکم لا دەدرێ، ئەویش ئەو پارەیەی هەیەتی دەیباو متمانە بەخەلیفە دەکاو چەند ئاڵتون و بەردێکی گران بەهای هەبوو بەئەمانەت تەسلیمی خەلیفەی دەکا کە نرخکەی نزیکەی (١٠٠) هەزار دینار دەبوو، دیارە ئەو پارەیە ئەو کات پارەیەکی زۆر بووە، دوای ماوەیەك (ناصرٍ داود) دەچێتە بەغداو داوای ئەمانەتەکە دەکاتەوە کەچی خەلیفە، نکۆڵی لێدەکاو ئەمانەتەکەی لێدەخواو

نایـداتەوە، ئینجـا ناصـرِ داود دەگەڕێـتەوەو دەچێـتە مەدیـنەو مزگەوتـی پێغەمـبەری خوا (صلى الله عليـه وسلم)، دەست بەحوجرەی شـەریف دەگرێ، هاوار دەکا (یارسول الله) (صلى الله عليه وسلم) خەلیفە ئەمـانەتی خواردوم و پارەکەم نـاداتەوە، خەڵکی مزگەوت هەمـوی دەست بەگریان دەکەن، ئینجا ئەوجارەی کە دەگەڕێتەوە بەغدا خەلـیفە لێیناگەڕێ داخڵی بەغدا بـێ و نـان و خـواردنی بـۆ دەنێـرێتە دەرەوەی بەغـدا، دواتـر پاسـەوانەکانی خـۆی دەنێرێ و (ناصرِ داود) دەگـرن و بەزۆر واژۆی پێدەکەن کە ئەمـانەتەکەی لە خەلـیفە وەرگرتـۆتەوە ئەویـش دەڵـێ: چـۆن کـوا ئێـوە ئەمانەتەکەتـان نەداوەتەوە من. ئەوانیش پێی دەڵێن: ئەو مـاوەیەی لەدەرەوەی بەغـدا بـووی ئەو گۆشـت و نـان خواردنەمـان بـۆ نـاردی ئەمـانەتەکە لەبەرامـبەر ئەو خواردنە بووە، بۆیە ئیمام (ابن کثیر) کە باسی ئەو ڕووداوە دەکات گلەیی لێدکات.[1] هەروەهـا ئیمـام زەهەبی دەفەرمـێ دەربـارەی خەلـیفە ووتویـانە: وكـان فيه شحٌّ، وقلة معرفة، وعدم تدبير، وحبٌّ للمال، وإهمـال للأمـور. وكـان يتكـل علـى غيـره، ويقـدم علـى مـا لا يليـق وعلـى مايسـتقبحُ.[2] واتە کەسێکی چاو چنۆك و پارە ویست بووە، کارەکانی بەکەسی تر ڕادەسپارد، ئینجـا خۆشـی دەفەرمـێ وكـان يلعـب بالحمـام ويهمـل امـر الاسـلام وابـن العلقمي يلعب به كيف اراد ولايطلعه على الاخبـار واذا جاءتـه نصيحة في

(١) البداية والنهاية ط إحياء التراث (١٣/ ٢٣٨).
(٢) تاريخ الإسلام (٤٨/ ٢٥٩).

السر أطلع عليها ابن العلقمي لقضي الله امرا كان مفعولا.[(١)] خەریکی کۆتر بوو، لەخەمی ئەو ئیسلامە نەبوو، ابن العلقمی چۆنی بویست با ئاوا یاری پێدەکرد، زۆربەی هەواڵ و ئامۆژگارییەکانی لێدەشاردەوە.[(٢)]

لەدوای کەوتنی بەغدا، هۆلاکۆ وەفدێك دەنێرێ بۆ موصل بۆ لای بدرالدین لؤلؤ بەسەرپەرشتی (زیرك بهادر و بیدرا) ئەو وەفدەی مەغۆل چوار زەمبیلیان پێبوو لەهەر زەمبیلێك سەری سەرکردەیەکی سەربازی بەغدای تێدا بوو، کە وەفدەکە دەگەنە لای (بەدرەدین) زەمبیلەکان هەڵدەدەنە پێشی و پێی دەڵێن: ئێوە خەریکی خواردن و خواردنەوەن فەرموو ئەو میوەمان بۆ هێناون. ئینجا (بەدرەدین) ڕیزێکی زۆری وەفدەکەی هۆلاکۆ دەگرێ و دەڵێ: هۆلاکۆ فەرمانی چیمان پێدەکات؟ ئەوانیش دەڵێن: کەلەنێك بخەیتە دیواری موصل و بەکراوەیی بەجێی بهێڵی. بەدرەدین یازدە کەلەنی گەورە لەدیواری موصڵ دەکاو بەکراوەیی بەجێی دەهێڵێ و دەڵێ: من بەندەی هۆلاکۆم و وڵاتیش وڵاتی ئەوە، وەفدەکە لە بەدرەدین ڕازی دەبن و دەگەڕێنەوە لای هۆلاکۆ.[(٣)]

---

(١) تاريخ الإسلام (٤٨/ ٢٦٠).

(٢) بۆ ئەو بەسەر هاتە بگەڕێوە سەر کتێبێ : الوافي بالوفيات (١٣/ ٣٠٢). هەروەها کتێبی عقد الجمان فی تاريخ اهل الزمان، ج ٥ لاپەڕە ١٢١.

(٣) تاريخ مجموع النوادر، لاپەڕە ١٦١.

# کەوتنی هەولێر

هۆلاکۆ ئەرکی گرتنی هەولێر دەخاتە ئەستۆی (ئەرقۆ نەویان) هێزێکی گەورە بەسەر کردایەتی ئەرقۆ دێن و شاری هەولێر گەمارۆ دەدەن، خەڵکی شارەکە زۆر بەتوندی بەرەنگاری هێزەکەی مەغۆل دەبنەوە، لەو بەینە (تاج الدین بن صلایە) کە هەر لەسەرەتاوە زۆر دژی هێرشەکانی مەغۆل بوو، خاوەن پەیوەندێکی زۆر چاك و دڵسۆزێکی گەورەی خەلیفە بوو، بەڵام دوای گرتنی بەغدا و کوشتنی خەلیفە پەیوەندی بە هۆلاکۆ دەکا، ئەویش داوای تەسلیم کردنی شاری هەولێری لێدەکا، ئینجا تاج الدین بن صلایە کەداوا لەخەڵکەکە دەکا شارەکە تەسلیم بە مەغۆل بکەن، خەڵکەکە ڕازی نابن، بۆ ماوەیەکی زۆرهێزەکانی مەغۆل دەمێننەوەو بۆیان ناکرێ هەولێر بگرن، زۆر جار خەڵکەکەی هەولێر لەڕێی تونێلی تایبەت کەهەڵیان کەندبوو دەهاتنە دەرەوەی شارەکەو مەغۆلەکانیان دەکوشت و مەنجەنیقەکانیان دەسوتاند، ئینجا ئەریقۆ کە دەزانی قەڵاکەی پێ ناگیرێ، بە دوای (بەدرەدین لؤلؤ)ی نارد و پرسی پێکرد لە چۆنیەتی گرتنی قەڵاکە ئەویش ڕێی بۆ دادەنێ و دەڵێ: بەو سەرمایە هیچ ناکرێ، ڕاوەستە تا گەرما دادێ تا ئەو کات خەڵکی قەڵاکە خۆراکیان نامێنێ و

بەرگەی گەرما ناگرن و خۆیان بەدەست دەدەن، بۆیە ئەرکی گرتنی هەولێر دەخرێتە ئەستۆی (بەدرەدین لؤلؤ) ئەویش لە ڕێی خیانەتەوە کە پەیوەندی بەچەند سەرکردەیکی ناو قەلاکە دەکاو ئەوانیش قەلاکە تەسلیم بە (بەدرەدین لؤلؤ) دەکەن و هەولێریش دوای بەرەنگار بوونەوەیەکی زۆر دەکەوێتە دەست هێزەکانی مەغۆل.[1]

ئەوڕەحمان بەگی بابان لە هۆنراوەیەکی باسی هێرشی مەغۆل دەکا بۆسەر جیهانی ئیسلامی و کوردستان لە گەمارۆی مەغۆل بۆ شاری هەولێر دەفەرمێ:

کاتێ گەیشتە بەردەمی هەولیر سوپای مەغۆل
دەوری حەساری دایەوە وەك گێژی گەردەلول
لاوان لە قەلعە هاتنە دەرێ دەس بەشمشێرەوە
وەك ڕەزمی ڕۆستەمی بەکەوان و بەتیرەوە[2]

ئینجا ئەو کاتەی هۆلاکۆ لە مەراغە دەبێت وەفدی پادشا و مەلیکەکان بەرێ دەکەون بۆ بەیعەت تازە کردنەوە بۆ هۆلاکۆ، )تاج الدین صلایا(حاکمی هەولێر و بەدرەدین لؤلؤی حاکمی موصل ئەوانیش لەوێ دەبن بۆ بەیعەت تازەکردنەوە بۆ هۆلاکۆ، بەدرەدین هۆلاکۆ حاڵی دەکات کە

(١) الحوادث الجامعة، بەرگی ٢ لاپەڕە ٢٩٩.
(٢) بەشێك لەدیوانی ئەوڕەحمان بەگی بابان، لاپەڕە ١٨٧.

تاج الدين صلايا دڵسۆز نییە لە بەیعەتەکەی و هۆلاکۆش درەنگ گرتنی هەولێر دەخاتە ئەستۆی (تاج الدين صلايا) و فەرمان دەکا و تاج الدين صلايا لەوێ دەکوژن. ئینجا وەفدی ڕۆمە سەلجوقییەکانیش دەگاتە مراغە کە پێکهاتبوو لە هەردوو برا، گەرچی کێشەو ناکۆکیان لەنێواندا هەبوو، (عزالدين کەیکاوس و ڕوکنەدین قەلج ئەرسەلان) عیزەدین زۆر دەترسا، لەبەر ئەوەی بەر لەگرتنی بەغدا هێزەکانی ئەو چەند جارەکی بەرەنگاری هێزەکەی (بایجو نویان) مەغۆل ببونەوە، ترسی ئەوەی هەبوو کە (هۆلاکۆ) ئەوە لەبیر نەکات و تۆڵەی لێبسەنێتەوە، بۆیە سەرەتا داوا دەکات پێڵاوێکی شاهانەی بۆ دروست بکەن و ئینجا وێنەی خۆی لەسەر ئەو پێڵاوە دەچنێ، کە دەگاتە لای هۆلاکۆ زەوی بەردەست و پێی هۆلاکۆ ماچ دەکا و جوتە پێڵاوەکە دەخاتە بەر پێی هۆلاکۆ و دەڵێ: قوربان شەڕەفی ئەوەمان پێببەخشە کەپێی موبارەکت بخەیتە سەر سەری ئێمە، ئینجا هۆلاکۆ کە بەو زیلەتەوە دەیبینێ لێی خۆش دەبێ، ئەوە زیلەتی ئەو پاداشاو مەلیکانەیە کە دوای کەوتنی بەغدا لەسەر تەختی حوکم ماونەتەوە، دەبێ کورسی دەسەڵات و سوڵتانیەت چ تامێکی هەبێ لەگەڵ ئەو زیلەتە.[١]

دوای گرتنی هەولێر و موصل تەواوی عێراقی ئێستا دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان و مەغۆلەکان دەسەڵاتیان دەگاتە سەر سنوری شام، هۆلاکۆ داوا دەکات هێزەکان ئامادە بکرێن بۆ گرتنی (شام و میسر).

---

(١) جامع التواريخ، بەرگی ٢ لاپەڕە ٣٠٠ .

کەوتنی بەغدا کەراساتێکی زۆر گەورە بوو بەهەزارا ئافرەت بە کەنیزەك گیران بردران بۆ مەنغۆلیاو چین هەزارا منالێش لە بازاڕەکان فرۆشران، یەکێك لەو شاعیرانەی لە هۆنراوەیەکی باس لە کەوتنی بەغدا دەکا شاعیرێك بوو بەناوی شەمسەدینی واعیزی کوفی کە لەساڵی (٦٢٣) لەدایك بووە و لەساڵی (٦٧٥) وەفاتی کردوە، ئەوپیاوە پارەی کۆدەکردەوەو لەبازاڕەکان منالە موسلمانەکانی لە مەغۆلەکان دەکڕیەوەو ئازادی دەکردن لە هۆنراوەیەکی دا دەفەرمێ:

عنـدی لأجـل فـراقکم آلام فـإلام أعـذل فـیکم والام
مـن کان مـثلی للحبیـب مفارقـاً لا تعـذلوه فـالکلام کلام
نعم المساعد دمـعی الجـاری علی خـدی إلا أنـه نمـام
ویـذیب روحی نـوح کل حمامـة فکأنمـا نـوح الحمـام حمـام
إن کنـت مـثلی للأحبـة فاقـداً أو فی فـؤادك لوعـة وغـرام
قـف فی دیـار الظـاعنین ونادهـا یا دار ما صـنعت بـك الأیـام
أعرضت عنك لأنهم مذ أعرضـوا لـم یبـق فیـك بشاشـة تسـتام
یـا دار أیـن السـاکنون وأیـن ذی اك البهـاء وذلـك الاعظـام
یـا دار أیـن زمـان ربعـك مونقـاً وشـعارك الإجـلال والإکـرام
یا دار مـذ أفلـت نجومـك عمنـا والله مـن بعـد الضـیاء ظـلام
فلبعدهم قرب الـردی ولفقـدهم فقد الهـدی وتزلـزل الإسـلام
فمتی قبلت مـن الأعادی سـاکناً بعـد الأحبـة لا سـقاك غمـام
یـا سـادتی أمـا الفـؤاد فشـیق قلـق وأمـا أدمـعی فسـجام

والدار مذ عدمت جمال وجوهكم لـم يبـق فی ذاك المقـام مقـام
لا حظ فيها للعيـون ولـيس لـل أقـــدام فی عرصـــاتها إقـــدام
وحيـاتكم إنی علی عهـد الهـوی بـاقٍ ولـم يخفـر لدی ذمـام
فـدمی حـلال إن أردت سـواكم والعـيش بعـدكم علی حـرام
يـا غائبـين وفی الفـؤاد لبعـدهم نـار لهـا بـين الضـلوع ضرام
لا كتـبكم تـأتی ولا أخبـاركم تروی ولا تـدنيكم الأحـلام
نغصـــتم الدنيـــا علی وكلمـــا جد النـوی لعبـت بی الأسـقام
ولقيت من صرف الزمـان وجـوره مـــا لـــم تخيلـــه لی الأوهـــام
يا ليت شعری كيف حال أحبـتی وبـأی أرض خيمـوا وأقـاموا
مـالی أنـيس غـير بيـت قـاله صب رمته مـن الفـراق سـهام
والله مـا اخـترت الفـراق وإنمـا حكمت علی بـذلك الأيـام(١)

بەوورد بـــوونەوە لەو قۆنـــاغە واتە لە (٦١٢) كـــۆچی تـــاوەكو (٦٥٦) كـــۆچی هەســـت بەوەدەكەی كە (گەل) هـــيچ كاريگەريـــان نەبـــووە و ئەوان زياتر گـوێڕايەڵ بـوينە و ژمـارە نەبووينە لە هاوكێشـەكان، بەڵكـو سـوڵتان و دەسـەڵات چۆنيـان بويسـتبايە ئـاوا ئاڕاسـتەيان كـردوون، ئينجـا خـورافەو ئەفسانە تـاڕادەيەكی زۆر زاڵ بـووە بەسـەر ئەو خەڵكە، لەساڵی (٦٠٠) لە بەغدا نەخۆشيەك بڵاو دەبێتەوە قورگ ئێشان بووە بەو دەردە خەڵكێكی زۆر دەمـرێ، دواتـر هەواڵ بـڵاو دەبێـتەوە هۆكـاری ئەو مـردنە ئـافرەتێكی

(١) فوات الوفيات (٢/ ٢٣٢).

(جنـۆکەیە)لە بیرێـك لەبیرەکـانی بەغـدا دەژی ئەو جنـۆکەیە نـاوی (ام عنقود) بووە، کوڕێکی مردوە بەناوی (عنقـود) کەس نەچوە سەرە خۆشی لێبکا بۆیە لەتۆڵەی کوڕەکەی ئەو نەخۆشیە بڵاو دەکاتەوە، خەڵکی بەغدا بەتـایبەت ئافرەتەکـان دەچـونە دەوری بیـرەکە و هاواریـان دەکـرد و لەخۆیـان دەدا: يَا أُمَّ عُنْقُودٍ اعْذُرِينَا قَدْ مَاتَ عُنْقُودٌ مَـا دَرِينَـا . دایکـی عنقـود لێمان ببورە (عنقود) مردو، بەڵام نەمان زانیوە کە زانیمان ئەوە هـاتین و شـین بـۆ کـوڕەکەت دەگێرین، ئینجا خواردن و پارەیـان هەڵدەدایە بیـرەکە تـاوەکو ئەو (جنـۆکە)یە لێیـان ڕازی بیت، دواتـر زاناکـان دەچـنە لای خەلـیفەو بیـرەکە کـۆردەکەنەوە[1] بەهەر حـاڵ عەوامـی خەڵکـی ئەوە عەقڵیەتیـان بـوەو بـاوەڕ بەخـوڕافەت تـا ئەو ئاسـتە زاڵ بـووە بەسـەریاندا، ئینجـا سیاسـییەکانییش باوەڕیـان بەخـوڕافەو سـحر هەبـووە، بۆنمـونە لەسـاڵی (٦١٤) عـلاء الـدین محمـد خـوارزم شـاە ویسـتی بەغـدا بگـرێ، ئینجـا بەر لەوەی بەرەو بەغـدا بکەویـتە ڕێ کـابرایەکی سـاحیر زۆر بـرادەری سـوڵتان دەبـێ، ئەو سـاحیرە تیمسـالێکی سـیحری دروسـت دەکـا و دەڵێـتە سـوڵتان بـڕۆن ئەو تیمسـالە لە بەغـدا بنێـژن کـاریگەری ڕاسـتەو خـۆی لەسـەر خەلـیفە دەبـێ وئەو کـات خەلیفە لەقسەی جەنابی سوڵتان دەرناچێ، ئەوە بوو سوڵتان تیمسالەکە دەدا بە قازی مجیرەدین پێی دەڵێ: بەنهێنـی ئەو تیمسـالە لە بەغـدا لەشـوێنێك بنێـژە، قـازی بەنـوێنەرایەتی سـوڵتان دەچێـتە بەغـدا و هەڵێـك دەقـۆزنەوەو

(١) الكامل في التاريخ (٨/ ١٩٨).

تیمسـالەکە لە بەغـدا دەنێـژن، دوای ئەوەی بەفروبـارانێکی زۆر دەبـارێ و سوڵتان خەواریزم نا چار دەبێ بگەڕێتەوە، دەست لەگرتنی بەغدا هەڵگرێ ئەو کـات ئەو قەناعەتەیـان بـۆ دروسـت دەبـێ کە ئەو تیمسـالە سـیحریە کاریگەری پیچەوانەی هەبووەو بەبەرژەوەندی خەلیفە کۆتایی هاتوە بۆیە ئەو جارەی قـازی دەنێـرێتەوە بـۆ ئەوەی تیمسـالەکە دەربـکەن و بیسـوتێنن، بەڵام قـازی شـوێنی تیمسـالە کە نـادۆزێتەوە، ئەوە عەقڵیەتـی سـوڵتان و قـازی ئەو کـات بـووە، جـا (نەسـەوی) لەکتێبەکەی کە باسـی ئەو ڕووداوە دەکا دەڵێ: نازانم باسی چی بکەم باسی عەقیدەی سوڵتان بکەم! ئایا ئەو جۆرە کارە توانی ڕێگربێ لە نەڕوخانی دەوڵەتەکەیان!.[1]

ئینجا ئەوەی لەو قۆناغە بکۆڵێتەوە ئەوەی بۆ ڕون دەبێتەوە کە پابەند بوون بەشەرعی خوای گەورە تەنها بۆ (گەل) بووە، سوڵتان و بنەماڵەی سوڵتان و خەلیفە، وەکو بڵێی شەرعی خوای گەورە بۆئەوان نییەو دارو دەستەی دەسەڵات بەدەر بووینە لەشەرعی خوا، ئینجا تەقدیسی خەلیفە گەیشتبوە ئەو ئاسـتەی کە عەوام یـان هەتـا سـوڵتانەکان چاویـان بەخەلـیفە دەکەوت لەدورەوە زەوی بەر دەست و پێی خەلیفەیان مـاچ کـردوە، پێیـان وابـووە ئەو بنەمـاڵەیە خوا دەیانپـارێزێ بەو شێوەیە تەقدیسیان کردوە تـا لەبەرژەوەندی ئەوان بـوایە، بەڵام ئەگەر لەبەرژەوەنـدی ئەوان نەبـووایە ئیترخەلیفەیـان دەگـرت و کوێریـان دەکـرد و کەسێکی تریـان دەخسـتە شـوینی، ڕووخـانی

---

(١) سیرة جلال الدین منکبرتی، لاپەڕە ٢٥٣ .

خیلافەتــی ئیســلامی یەك هۆكــاری نەبــووە دەیــان هۆكــار كۆببــونەوە پێشـەكییەكانیش زۆر بەجوانی دیـار بـوو بەرەو دەرەنجامێكی نـاخۆش دەیان با، بەڵام پەند و عیبرەتیان وەرنەگرتوە خوای گەورە دەفەرمـێ: {وَاتَّقُـوا فِتْنَةً لَا تُصِيبَنَّ الَّذِينَ ظَلَمُوا مِـنْكُمْ خَاصَّـةً وَاعْلَمُـوا أَنَّ اللَّهَ شَـدِيدُ الْعِقَابِ (٢٥)}[١]

لەبەشی داهاتووپشتیوان بەخوای گەورە باسی هێرشی مەغـۆل بـۆ سـەر وڵاتی شام و سەرهەڵدانی دەوڵەتی ئێلیخانییەكان و شەڕی (عـین جالوت) دەكەیـن، لەخـوای گەورە داواكـارین ئەو نوسـینەمان لــێ قبـوڵ بكـات و تەرازوی كردەوەی چاكەمان پێ قورس و گران كات.

---

(١) الأنفال: ٢٥.

# بەشی دووەم

# پێشەکی

## جەنگی (عین جالوت) و
## سەرەتای دروستبونی دەوڵەتی ئێلیخانییەکان

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور أنفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له وأشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له وأشهد أن محمدا عبده ورسوله.

(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِ وَلا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنْتُمْ مُسْلِمُونَ)ال عمران ١٠٢.

(يَا أَيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِى خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللَّهَ الَّذِى تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالْأَرْحَامَ إِنَّ اللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً) النساء 1

﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللَّهَ وَقُولُوا قَوْلاً سَدِيداً ۝ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَالَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَمَنْ يُطِعِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ فَقَدْ فَازَ فَوْزاً عَظِيماً﴾ الاحزاب ٧٠

مێژوو (گفتوگۆی) ئێستا و ڕابردووە بۆ خوێندنەوەی ئایندە. زۆر جار شکەستەکان دەمانگێڕنەوە هەناوی مێژوو بۆ ئەوەی لەوێ نەفەسی سەرکەوتن هەڵمژینەوە، ئەو کەسەی مێژوو ناخوێنێتەوە خۆی مەحروم کردوە لە ئەزمونی ئوممەتانی پێشوو، بەشێکی قورئانی پیرۆز باس لەمێژوو دەکات، مێژووی کوفرو ئیمان، ستەم ودادپەروەری، ململانێی تاریکی و ڕوناکی، خواویستی و خۆ ویستی، بەڵام ئەوەی زۆر گرنگە نابێ خوێندنەوەمان بۆ مێژوو، تەنها زانینی چەند چیرۆك و بەسەرهاتێك بێ، ئەگەر بێت و ئامانجمان لەخوێندنەوەی مێژوو تەنها زانینی چەند چیرۆك و بەسەرهاتێك بێ، وتار و مەجلیسی پێخۆش بکەین ئەو کات ڕێك پێچەوانەی قورئانی پیرۆز هەنگاومان ناوە، خوای گەورە لەقورئانی پیرۆز دەفەرمێ: {...فَاقْصُصِ الْقَصَصَ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ (١٧٦)}[١] مەبەست لە گێڕانەوەی ئەو بەسەرهاتانە تێفکرین و لێ ورد بوونەوەیە، بۆیە دەبێ ئەو قۆناغە تێپەڕکەین (لەساڵی ئەوەندە ئەو ڕووداوە ڕویداوە)، بەڵکو دەبێ

---

(١) الأعراف: ١٧٦

بیـر لەوە بکەیـنـەوە (لەبەرچـی ڕوویـداوە؟) بگـەڕێـین بـۆ دۆزیـنـەوەی ئـەو وەڵامە.

پێشەکییەکەی (ابن خەلدون) ڕێك لەسەر ئەو بابەتەیە (لەبەر چی وابوو) هەر ئەو هەنگاوەشـە(ابن خلـدون) لەبـاقی مێـژوو نوسـەکانی تـر جـوودا دەکاتەوە، پێم وایە بەشێکی زۆری مێژوو لە هەناوی کتێبەکانی تەفسیر دایە، بەتـایبەت ئەو کـاتەی موفەسـیرەکە دەچێـتە خزمەت ئەو ئایەتـانەی کەباس لەدەرەنجامی کردەوەی مرۆڤەکان دەکا، مرۆڤ ئەگەر تـاوان ئەنجام بدا ژیارو ژیانی لێتێك دەچێ؟ دەرەنجامی ستەمکاری تێچوونە وەکو ئەو ئایەتانە ئاماژەیان پێکردوە:

{ذَلِكَ أَنْ لَمْ يَكُنْ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا غَافِلُونَ (١٣١)} (الأنعام: ١٣١) {وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَى آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِمْ بَرَكَاتٍ مِنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَكِنْ كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُمْ بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ (٩٦)} [١]

{وَكَذَلِكَ أَخْذُ رَبِّكَ إِذَا أَخَذَ الْقُرَى وَهِيَ ظَالِمَةٌ إِنَّ أَخْذَهُ أَلِيمٌ شَدِيدٌ (١٠٢)} [٢]

{وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَى بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ (١١٧)} [١]

---

(١) الأعراف: ٩٦

(٢) هود: ١٠٢

{وَتِلْكَ الْقُرَى أَهْلَكْنَاهُمْ لَمَّا ظَلَمُوا وَجَعَلْنَا لِمَهْلِكِهِمْ مَوْعِدًا (٥٩)}[٢]

{قَدْ كَانَ لِسَبَإٍ فِي مَسْكَنِهِمْ آيَةٌ جَنَّتَانِ عَنْ يَمِينٍ وَشِمَالٍ كُلُوا مِنْ رِزْقِ رَبِّكُمْ وَاشْكُرُوا لَهُ بَلْدَةٌ طَيِّبَةٌ وَرَبٌّ غَفُورٌ (١٥) فَأَعْرَضُوا فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ سَيْلَ الْعَرِمِ وَبَدَّلْنَاهُمْ بِجَنَّتَيْهِمْ جَنَّتَيْنِ ذَوَاتَيْ أُكُلٍ خَمْطٍ وَأَثْلٍ وَشَيْءٍ مِنْ سِدْرٍ قَلِيلٍ (١٦) ذَلِكَ جَزَيْنَاهُمْ بِمَا كَفَرُوا وَهَلْ نُجَازِي إِلَّا الْكَفُورَ (١٧)}[٣]

زۆربەی موفەسیرەکان باسی ئەوەیان کردوە، کە ئەوە کردەوەی خودی مرۆڤە دەرەنجامەکانتان بۆ دیاری دەکا، لە پێشەکی بەشی (٤٤ ساڵ لەئامێزی غەفڵەت) دا، بە درێژی باسی ئەو خاڵانەمان کرد، بەپشتیوانی خوای گەورە لەو بەشە لەگەڵ گێرانەوەی ڕووداوەکان تیشك دەخەینە چەند خاڵێکی گرنگ لەو خاڵانە:

یەکەم: ململانێی (حەق و باتیل)بەردەوامەو بەردەوامیش دەبێت، قەت نابینرێ حەق و باتیل دەستبکەنە ملی یەکتر و بەتەبایی لە چوار چێوەیەك بژین.

---

(١) هود: ١١٧

(٢) الكهف: ٥٩

(٣) سبأ: ١٥- ١٧

دووەم: میللەت فریادرەس بەرهەم دەهێنێ؟ یان بەپێچەوانەوە کەسێکە دەتوانێ گۆڕانکاری بکات و خوێنێکی تازە بکاتە جەستەی ئەو ئوممەتەو زیندووی کاتەوە؟ سەیفەدیین قوتزو زاهیر بێبرس چۆن توانیان ئەو واقیعە بگۆڕن؟

سێیەم: محمود یەڵواج و بنەماڵەکەی کە تێکەڵ بەدەسەڵاتی جەنگیزخان بوون، توانیان بەماوەیەکی کەم ئەوەی موسڵمانان لە جەنگ دۆراندبوویان ئەوان بەسیاسەت بیگێڕنەوە، ئەوەش بێگومان ئەزمونێکی زۆر گرنگە بەداخەوە زۆر بەکەمی باسی لێوەکراوە.

چوارەم: فیقهی (سیاسەت کردن) بە کردەوە پێی دەگەی نەك لە هەناوی کتێبان و بەشێوەیەکی نەزەری دیراسە بکرێ، ئەوانەی لەمەیدانەکە فێری سیاسەت دەبن زۆر جیاوازن لەوانەی لە سوچێکدا و تەنها بەشێوەیەکی نەزەری سیاسەت دیراسە دەکەن.

پێنجەم: ئەو میللەتە بەحوکمی ئەوەی خاوەنی کۆتا پەیامی ئاسمانییە، بەڵێ شکەست دێنێ، بەڵام مێژوو پێمان دەڵێ: قەت لەنێوناچێ، ئەوەی بەسەر ئەو میللەتەهاتوە بەسەر هەر میللەتێکی تر بهاتبا بونی نەدەما یان ناسنامەی بەیەك جار دەگۆڕدرا.

شەشەم: مێژوو پێمان دەڵێ: هێز تاکە پاسەوانی دڵسۆزی (قەوارەو بوونە) هەر قەوارەو بونێك، هێزی نەبوو بونی دەکەوێتە خەتەر، یان بونی دەمێنێ، بەڵام ناسنامەی لەدەست دەدا.

لەگەڵ گیرانەوەی ڕووداوەکان هەوڵمانداوە تیشك بخەینە سەر ئەو خاڵانەش کەئاماژەمان پێی کرد.

ئیمامی شافیعی ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لەسەربێ دەفەرمێ: من علم التاريخ زاد عقله. ئەوەی مێژوو بزانێ عەقڵی گەورە دەبێ، لێشی گێڕدراوەتەوە کە نزیکەی بیست دانە ساڵ دیراسەی مێژوو و ئەدەبی کردوە، ئینجا فەرموی بۆئەوە دیراسەم کردوە تاوەکو لەبڕیارە فیقهییەکان بپێکم.[١]

لەخوای گەورە داواکارین بەرەکەت بخاتە کارەکانمان و ئەو ماندوو بونەمان لێ قبوڵ بکات و ئومێدیش دەکەین توانیبمان سودێك بەخوێنەری خۆشەویست بگەیەنن، سوپاس و دوعای خێریشیمان بۆ هەموو ئەو دڵسۆزانەی هەڵەکانمان بەدیاری بۆ دەنێرن.

**سەرباز محمد حەسەن**

هەولێر ١ ڕەجەبی ١٤٤١
بەرامبەر بە ٢٠٢٠/٢/٢٥

---

(١) فوائد الارتحال ونتائج السفر فی اخبار القرن الحادی عشر. مصطفی بن فتح الله الحموی بەرگی یەکەم، لاپەڕە ٣٤.

بسم الله الرحمن الرحيم

# سەرەتا

لەگەڵ کەوتنی بەغدا و ڕوخانی خەلافەتی عەبباسی قۆناغێکی تازەی سیاسی لەعێراق و دەورو بەری دەستپێکرد، ئەویش دروست بوونی دەوڵەتی (ئێلیخانییەکانە).

ئەو ناوە لە دوو بڕگە پێکهاتووە(ئێل) کەبەمانای ملکەچ یان گوێڕایەڵی دێت، لەگەڵ (خان) کەمەبەست پێی خانی گەورەی (مەغۆلە) مەبەستیش لەوناوە ئەوەیە، کە ڕاستە دەوڵەتە، بەڵام سەربەخۆ نییەو، بەڵکو گوێڕایەڵەو ملکەچی خانی گەورەی مەغۆلە.[1]

دەوڵەتی ئێلیخانی تەواوی ئێران و عێراق، تا سنوری شام و تەواوی تورکیای ئێستا بوو، ئەو ڕووبەرە فراوانە ڕاستە دەوڵەتە، بەڵام سەربەخۆ نییەو، بەڵکو لە سنوری فەرمانەکانی خانی گەورە دەرناچێ، لەگەڵ تێبینی ئەوەی کە لەساڵی (٦٤٨) دوای ئەوەی (منکو)ی کوڕی (تولی)

---

(١) سياسة المغول الاليخانيين تجاه دولة المماليك في مصر والشام/د.صبحي عبدالمنعم محمد.

دەکرێتە خانی گەورەی مەغۆل، هەر لەو کاتەوە (هۆلاکۆ) دەکاتە نوێنەری خۆی بۆ سەرپەرشتی ئیران و داگیر کردنی قەڵای (ئیسماعیلییەکان) و دواتر داگیرکردنی عێراق و شام و میسڕ، واتە مەغۆلەکان لەساڵی (٦٤٨) ڕا پیلانی دەوڵەتێکی ئێلیخانییان دارِشتبوو، دەشیان زانی دەوڵەتی مەغۆل ئەوەندە فراوان دەبێ، ناچارن بەو جۆرە سیستەمە بەڕێوەی ببەن.

# دابەشکردنی عێراق
# بۆ چەند یەکەیەکی ئیداری

دوای کەوتنی بەغدا، هۆلاکۆ بەغدا جێدەهێڵێ و دەچێتە ناوچەی مەراغە، [(١)] بەڵام بەرلەوەی بەغدا جێبهێڵێ، عێراق دابەش دەکا بۆ چەند ناوچە و یەکەیەکی ئیداری و تەسلیمی کەسە نزیکەکانی خۆی دەکا.

ئەوانەی دوای هۆلاکۆ بەڕێوبردنی عێراقیان کەوتە دەست:

(مؤيد الدين بن العلقمي) کەدەبێ بەوەزیری یەکەم، پێشتریش وەزیری خەلیفە (موستە عصیم)بوو، (فخرالدين الدامغاني) دەبێتە خاوەنی دیوان، (علي بهادر الخراساني) دەبێتە بەرپرسی (الشحنة)مەبەست لە ناوی (شیحنە)واتە بە کەسری پیتی (ش) ئەو دەزگایەیە کەزیاتر ئاگاداری ئەمن و ئاسایشی وڵات دەبێ، ئەو دەزگایە دەگەڕێتەوە سەردەمی سەلجوقییەکان، ئەو کاتەی پایتەختی حوکمیان لە شاری (ئەصفەهان)بوو، ئەو دەزگایەیان دامەزراند بۆ زەمانەتی ئەوەی بەغدای پایتەخت لە فەرمانەکانی سوڵتانی سەلجوقی دەرنەچێت، بۆیە ئەو دەزگایە لەسەروی

(١) شاری مەڕاغە دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای ئێران لەنزیك دەریاچەی ئورومییە.

دەزگای (پۆلیس)ی ئەو کات بووە، ڕاستەو خۆ سەرکردەیەکی سەربازی نزیك لەسوڵتان سەرپەرشتی کردوە.

(قەزاوەت) تەسلیم بە (عبدالمنعم البندنیجي) دەکرێت، بەم جۆرە وردە وردە ژیان دەگێرنەوە شاری بەغداو گەڕەك و کۆڵانەکان لە جەنازەی مردووەکان پاك دەکرێتەوەو بازاڕەکان ئاوەدان دەکرێتەوە، شاری بەغدا دوای کاولکردنی بەدەست مەغۆلەکان وردە وردە نەفەسی ژیان هەڵدەمژێتەوە، هۆلاکۆ هەروەکو پێشتر باسمان کرد بڕیاڕ دەدا بچێتە شاری (مەڕاغە) ئەو شارە دەکا بە بنکەی سەربازی خۆی.

# دروستکردنی مەڕصەدی مەڕاغە

هۆلاکۆ فەرمان دەکا بەدروستکردنی (ڕوانگە، مەڕصەدێك) کەدواتر بە مەڕصەدی مەڕاغە ناو دەردەکات، دروستکردنی ئەو کارەش بە (نەصیرەدینی توسی) دەسپێرێ، هەر لەهەمان کاتیشدا داهاتی ئەوقافی ئیسلامی لەتەواوی ئەو وڵاتانەی کەوتونەتە دەست مەغۆل، هەر هەموی تەسلیم بە (توسی)[1] دەکرێت، نوسەیرەددینی توسی دەڵێ: دروستکردنی مەرصەدێك بەو شێوەیە پێویست بەماوەی سی ساڵ دەکات، بەڵام هۆلاکۆ پێی دەڵێ: کە سی ساڵ ماوەیەکی زۆرە و دەبێ پەلەی لێبکەی، ئەوە بوو لەسەر دوازدە ساڵ پێك دێن، واتە مەڕصەدی مەڕاغە دەبێ بە دوازدە ساڵ تەواو بکرێ، هۆلاکۆ لە چینەوە چەند زانایەك دێنێ بۆئەوەی بەشداری دروستکردنی ئەو مەڕصەدەبن، لەجیهانی ئیسلامیش زانای بۆکۆدەکردەوە، لەزانا بەناوبانگەکانی ئەوکات کە بەشداری دروستکردنی ئەو مەڕصەدەبوون (فخرالدین المراغی وفخرالدین الخیلاتی و نجم الدین

---

(١) نەصیرەدینی توسی ناوی تەواوی محمد کوڕی محمدی کوڕی حەسەنی نەصیرەدینی توسیە، لەتوس لەدایك بووە لەساڵی (٥٩٧) وەلەساڵی (٦٧٢) لەبەغدا وەفاتی کردوە، زاناوفەیلەسوفێکی گەورەی شیعە بووە، ڕۆڵێکی سەرەکی هەبوو لەگرتنی بەغداو کوشتنی خەلیفە الوافي بالوفيات (١/ ١٥٠).

القزويني)، بەڵام دوای مردنی خانی گەورەی مەغۆل(منگوخان) کارکردن لەوپڕۆژەیە دەوەستێ، ئیستا شوێنەوارێکی کەمی ماوە، مەبەست لە دروستکردنی ئەو مەڕصەدە سەرنجدانی جوڵەی ئەستێرەکان بووە، لەهەمان کاتدا بۆ حیساباتی شەوو و ڕۆژو و ژماردنی دووری نێوان هەسارەکان بەکار هاتوە، مەغۆلەکان گرینگییێکی زۆریان بەو جۆرە زانستە داوەو زۆر جاریش بەر لەهێرشەکانیان پرسیان بە ئەستێرە ناسەکان کردوە بۆ دیاری کردنی کاتی گونجاو بۆ هێرش کردن.

(توسی) لەو مەڕصەدە کتێبخانەیەکی زۆر گەورە دادەمەزرێنێ نزیکەی (٤٠٠) هەزار مجلد کتێب کۆدەکاتەوە، زۆر لەکتێبەکانی بەغداو شام و جەزیرە دەهێنێتە ئەو کتێبخانەیە، کتێبەکانیش لەهەموو بوارەکان شەریعەت و فەلسەفەو گەردووناسی و ئەستێرە ناسی و حیساب و هەندەسەو زۆر بواری تر، ئینجا خانوێکی گەورەی تێدا دروست دەکات بەناوی (دار الحکمە) چەندین کەسی شارەزای تێدا کۆدەکاتەوە لەبواری فەلسەفە و لەشەو و ڕۆژێکدا سێ درهەمیان بۆ خەرج دەکات،ماڵی دکتۆرانیش دروست دەکات و دکتۆری شارەزای بۆ هێنابوو هەر دکتۆرێکیش لەڕۆژێکدا دوو درهەمی بۆ خەرج کردوە، قوتابخانەکی بۆ زانایانی ئاینی دروستکردبوو هەر زانایەکی ئاینی ڕۆژێ یەك درهەمی بۆ خەرج کردوە، ماڵی فەرمودەشی بۆ داناوان هەر زانایەك لە فەرمودەناسی ڕۆژێ نیو

درهەمی بۆ خەرج کردوە، [(١)]، دیارە دروستکردنی ئەو مەڕصەدە پارەیەکی زۆری تێدەچێ بۆیە هۆلاکۆ پرسیار لەتوسی دەکات ئەو مەڕصەدە سودی چییە کە ئەو هەموو پارەیەی تێبچێ؟ توسی بەهۆلاکۆ دەڵێ: بابچینەوە دەروەی شار لەوێ ڕوونکردنەوەت بۆ دەدەم، هۆلاکۆش لەگەڵ سەربازێکی زۆر دەچنە دەرەوە ئینجا توسی دەڵێ: بایەکێك لەسەربازەکان تەشتێکی گەورە ببا لەسەر ئەو شاخە هەڵی داتە خوارەوە، بەڵام جگە لەمن و تۆ کەسی تر بەوە نەزانێ، هۆلاکۆش فەرمان دەکاو لەسەری شاخەکەوە تەشتێك هەڵدەدەنە خوارەوە دەنگێکی زۆر گەورەی دەبێ و ئەوانی لەوێ بوون هەر هەموی ڕادەچڵەکێن تەنها هۆلاکۆ و توسی ئاسایی دەبن، ئینجا توسی بەهۆلاکۆ دەڵێ: سودی ئەو مەڕصەدە ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین پێشهاتەکان بزانێن و وەکو ئەو خەڵکە ناچڵەکێین هۆلاکۆ قەناعەتی زیاتری بۆ دروست بوو بە دروستکردنی ئەو مەڕصەدە.[(٢)] هۆلاکۆ ئەو هەموو ئاڵتون و زیوەی کەدەستی کەوت هەرهەموی تواندەوەو کردی بەقاڵب و هەندێکی ڕەوانەکرد بۆخانی گەورەی مەغۆل ئەوەی تریشی کرد بە دوو بەش بەشێکی تەرخان کرد بۆ دروستکردنی (مەڕصەدە) کە، بەشەکەی تریشی لەو سوپایە خەرج کرد کەئامادەی کردبوو بۆ گرتنی (شام و میسر).

---

(١) البدايةوالنهاية، لاپەڕە٣٤٢ بەرگی ١٥.
(٢) فوات الوفيات (٣/ ٢٤٧).

(هۆلاکۆ) بۆگرتنی (شام و میسڕ) پێوستی دەکرد ناوچەی (جەزیرە) ببڕێ، بۆیە هەر لەگەڵ کەوتنی شاری بەغدا، هێزێکی گەورە ئامادە دەکا بەسەرپەرشتی (یشموت)ی کوڕی و دەینێرێ بۆ خۆش کردن و زامن کردنی ڕێگای ئەو سوپا گەورەیەی بەڕێ دەکەوێ بۆگرتنی شام و میسڕ.

ئەو شوێنەی کەعاسێ دەبێ و مەردانە و شێرانە سەنگەر لە هێزەکانی مەغۆل دەگرن ناوچەی (مەیافارقینە) کە نزیکەی دوو ساڵ بەرەنگاری هێزەکانی مەغۆل دەبنەوە و دواتریش بەدرێژی باسی جیهاد و ئازایەتی خەڵکی ئەو ناوچەیە دەکەین، بەڵام ئێستا گرنگە بەکورتی ئاماژە بەناوچەی (جەزیرە) بکەین.

# کورتەیەك دەربارەی مێژووی (جەزیرە)

مەبەست لە(جەزیرە) ئەو ڕووبەرناوچە فراوانەیە کەدەکەوێتە نێوان هەردوو ڕوباری، دیجلەو فوڕات، ئەو ناوچەیە پێکهاتوە لە سێ بەشی سەرەکی، دیار ڕەبیعە و دیار موزەڕ (مضر) دیاربەکر.

یەکەم: دیار ڕەبیعە، پێکهاتوە لە نەصیبین(نَصِیبین) و خابورو ڕەئس العین (حەسەکە) وسنجار (شنگال) و دورگەی ابن عومەر (بۆتان) مەبەستیش لە (ابن عمر) عبدالله کوڕی عومەری کوڕی خەتاب نییە ڕەزاو ڕەحمەتی خوایان لێبێ، بەڵکو مەبەست لەو ناوە کەسێك بووە بەناوی حەسەنی کوڕی عومەری تەغلبیە هەندێکیش لەمێژوونوسان دەڵێن مەبەست پێی عبدالعزیزی کوڕی عومەر بووە، کە ئەو ناوچەیەی ئاوەدان کردۆتەوە.[1]

دووەم: دیار موزەڕ، پێکهاتبوو لەحەڕان و ڕوهاو ڕەققەو سەروج.

سێیەم: دیاربەکر، پێکهاتبوو لە مەیافارقین و ئەرزەن و ئامید و ماردین.[2]

---

(١) تاريخ فتوح الجزيرة والخابور وديار بكر والعراق، محمد بن عمر الواقدي، لاپەڕە ٢٣٥.

(٢) الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، بەرگی ٣ لاپەڕە ٥.

ئەو ناوچەیە لەبەر گرنگیەکەی هەردەم گۆڕەپانێ ململانێی هێزەکانی ناوچەکە بووە، بەر لەهاتنی ئیسلام جەنگێکی زۆری نێوان ڕۆم و فارسەکان لەو ناوچەیە ڕووی داوە، تەواوی ئەو ناوچەیە لەبەر دەستی هێزی ڕۆمییەکان بووە، لەساڵی ١٨ کۆچی هێزێکی گەورەی موسڵمانان بەسەرکردایەتی (عِيَاضِ بنِ غَـنْمٍ)[١] عیازی کوڕی غەنم، دەگەنە ئەو ناوچەیە و تەواوی ناوچەکە لە ڕۆمییەکان پاك دەکەنەوە، دواتر ئەو ناوچەیە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی دەوڵەتی ئومەوییەکان، دوای ئەوانیش عەبباسییەکان حوکمی ناوچەکە دەکەن، ئینجا بنەماڵەی بوەیهییەکان حوکمی ئەو ناوچەیە دەگرنە دەست دواتر دەوڵەتێکی کوردی لەو ناوچەیە دادەمەزرێ ئەوان دەبنە حاکمی ئەو ڕووبەرە فراوانە، ئەو دەوڵەتە کوردیە بەناوی دەوڵەتی (دۆستییەکان) لەکتێبەکانی مێژوو زۆر جار بەدەوڵەتی مەڕوانییەکان ناودەبردرێ، دامەزرێنەری ئەو دەوڵەتەکوردیە کەسێك بوو بەناوی (باد)ی کوڕی (دۆستەك)، دوای ئەوان سەلجوقییەکان دێنە ناوچەکە و دەوڵەتە کوردیەکە دەڕوخێنن، ئینجا زەنکییەکان و دوای ئەوانیش ئەییوبییەکان حوکمی ناوچەکە دەگرنە دەست تا هاتنی مەغۆل کە تەواوی ئەو ناچەیە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئەوان، صەلاحەدینی ئەییوبی کەئەو ناوچەیە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی، ڕادەستی تەقییەدینی عومەری

---

(١)عِيَاضِ بنِ غَنْمٍ هاوەڵێکی گەورەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم) عیاز لەو صەحابانەیەکە لەبەیعتی الشجرە بەشدار بووەو لەساڵی٢٠ کۆچی لەوڵاتی شام وەفاتی کردوە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ، سير أعلام النبلاء ط الحديث (٤/ ٢٣).

کوڕی شاهنشاه دەکات، لەساڵێ (٥٩١) ئەو ناوچەیە دەبێتە موڵکی (مەلیك عادیل سیف الدین ابوبکر) برای صەلاحەدینی ئەییوبی، لەساڵی (٥٩٦) مەلیك عادل دەبێتە سوڵتان و ناوچەکە تەسلیم بە کوڕەکەی دەکات، نجم الدین ئەییوب.

بەو شێوەیە ئەو ناوچەیە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی بنەماڵەی ئەییوبییەکان، مەلیك کامیل محمد مظفر غازي لەساڵی (٦٤٥) تاوەکو ساڵی (٦٥٨) حاکمی ئەو ناوچەیە دەبێت دواتر بەدەستی مەغۆلەکان شەهید دەکرێ و تەواوی ناوچەکە دەکەوێتە دەست هێزەکانی مەغۆل، لەگەڵ تێبینی ئەوەی چەند ئیمارەتێکی سەڵیبییەکان و چەند هێزێکی بەتایبەت ئەرمەنییەکان ناوە ناوە لەناوچەکە دەردەکەوتن و هێرشیان دەکردە سەر قەڵاو شارە موسڵمانەکان..[1]

(١) الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٧٨. وەبڕوانە کتێبی تاريخ الفارقي، لاپەڕە ٢٩/ احمد کوڕی علی کوڕی ئەلەئزرەق . تێبینی: ناوچەی ئامەد و میافارقین و ماردین و ئەرزەن و قەڵاکانی دەوروبەری زۆربەی کاتەکان لەژێر دەسەڵاتی یەك کەس بووە. الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة بەرگی ٣ لاپەڕە ٢٧٨.

# ئامادەباشی بۆ
# داگیر کردنی تەواوی (جەزیرە و شام)

هۆلاکۆ سوپایەکی گەورەی ئامادەکرد بۆگرتنی شام، بەو ئومێدە بوو دوای شام بەرەو میسرٍ بکەوێتەڕێ، ناوچەی(جەزیرە) جگە لەئەییوبییەکان چەند هێزێکی تری لێبوو وەکو (ئەرمەنییەکان) و (ڕۆمییەکان) خاچپەرستەکان، بنەماڵەی ئەییوبی لەو کات کۆك و تەبا نەبوون، بەڵکو کێشەو گرفتێکی یەکجار زۆریان لەنێواندا هەبوو، کە ئەوەش بەگەورەترین خاڵی لاوازی ئەو دەسەڵاتە هەژمار دەکرا، خۆ ئەگەر ئەییوبییەکان لەنێو خۆدا(تەباوتفاق)بان بێگومان، دەبونەکۆسپێکی گەورە لەبەردەم هێزەکەی هۆلاکۆ، بەڵام بەهۆی ململانێ لەسەر دەسەڵات ئیتر(خوا و خاك و خەڵکیان) لەبیرچوبووەوە، بیریان لەوە نەدەکردەوە کە چ هێزێکی دڕندەی تێکدەر ڕووی تێکردوون، مەلیك (ناصرٍ یوسف ٦٤٠-٦٥٩) کەخاوەنی حەلەب بوو لەوێوە هێزەکانی ئاڕاستە دەکرد لەناوچەی جەزیرە، دەتوانین بڵێین بە بەهێزترینی بنەماڵەی ئەییوبییەکان هەژمار دەکرا، مەلیك ناصرٍ بەر لەکەوتنی بەغدا وەفدێك دەنێرێ بۆ لای هۆلاکۆ، بەسەر پەرشتی عەزیزی کوڕی، ئەو وەفدە دیاریەکی زۆر پێشکەش بەهۆلاکۆ دەکەن، لەهەمان کاتدا پشتگیری تەواوی خۆیان بۆ هۆلاکۆ دەردەبڕن، مەلیك

ناصــرٍ ئامــادەیی خــۆی دەردەبــڕێ لەگەڵ هۆلاکــۆ هێــرش بکــاتە سەرمیســرٍلەبەرئەوی پێــی وابوومیســرٍ موڵکی ئەوانەو (مەمالیکەکــان) داگیریان کردوە، بەڵام هۆلاکۆ ئەوەی قبوڵنابێ و دەڵێ:

دەبوایە مەلیك ناصرٍ خۆی بهاتبایە نەك کوڕەکەی بەنوێنەری خۆی بنێرێ بۆیە نامەیەکی بۆ دەنێرێ و پێی دەڵێ: کە ئەونامەیەت بەدەست گەیشت بەبێ هیچ قسەو مەرجێك خۆت بگەیەنە خزمەتم (اذا وقفت على كتابي هذا فسارع برجالك وأموالك وفرسانك الى طاعة سلطان الارض تامن شره وتنل خيره، وقد بلغنا ان تجار الشام وغيرهم انهزموا باموالهم وحريمهم الى (كروان كسرى، بەزمانی مەغۆل) یانی میسرٍ، فان كانوا في الجبال نسفناها وان كانوا في الارض خسفناها.[(١)]

مەلیك ناصرٍ نیازی وابوو شەڕی مەمالیکەکان بە هۆلاکۆ بکا، بەڵام هۆلاکــۆ پلانــی خــۆی هەیەو لەنیــازی مەلیــك ناصــرٍ دەگــاو دەزانــێ مەبەستیەتی شەڕی مەمالیك بە مەغۆل بکا بۆگێڕانەوەی دەسەڵاتی خۆی نەك وەکو خزمەت کارێکی هۆلاکۆ.

ئینجا مەلیك ناصرٍ ترسێکی زۆری پێدەگا، بۆیە خێزان و منداڵەکانی ڕەوانەی میسرٍ دەکا خەڵکێکی زۆریش لەگەڵ ئەوان ڕوو لە میسرٍ دەکەن، لەکاتی ئەو کۆچڕەوە گەورەیە خەڵکێکی زۆر لەڕێگادا دەمرن و زۆریشیان

---

(١) القلقشندي صبح الاعشى، بەرگی٨ لاپەڕە ٦٠.

دەکەونە بۆسـەی ڕێگرەکـان ئەوپـارەوپوڵەی پێیـان بـوو لەڕێگـا لێیـان دەسەنرێ.[١]

ئەوەی کە زۆر سەیرە لەو ڕووداوانە پادشاکان ئەوەی ڕەچاویان نەکردوە (وەلائـو بەڕا) بـووە، پشـتگیری دەربـڕین بـۆ هێزێکـی کاوڵکـاری وەکـو هێزەکەی مەغـۆل و تـاغوتێکی وەکـو هۆلاکۆ بەکامە شەرع جائیزە؟ لەبەر چی زانایان هەڵوێستیان نەبووە؟ سوڵتان و پادشاکانیش هەموو شتێکیان کـردۆتە قوربـانی کورسـی دەسـەڵات و زۆر جـار بـۆ پاراسـتنی دەسـەڵاتیان دینیان بەتەواوی نەماوە.

(هۆلاکـۆ) نـامەیەکی تـر دەنێرێ بـۆ حـاکمی موصـل (بدرالـدین لؤلـؤ) لەنامەکە پێی دەڵێ: کەتۆ بەتەمەن بووی، با کوڕەکەت ببێتە سەرکردەکەی ئەو هێـزەی کە ئامـادەت کـردوە بـۆگرتنی شـام، بەدرەدیـن لؤلـؤ یـش بەڵـی قوربـانی بـۆ دەکـاو، خـۆی لەمەیـدانەکە دەکشـێتەوەو سـوپاکەی تەسـلیم بەکـوڕەکەی دەکـا، کـوڕەکەی حـاکمی موصـل نـاوی (مەلیـك صـالح) بـوو، کەدەچێـتەلای (هۆلاکـۆ) هۆلاکـۆ ڕێزێکـی زۆری لێـدەگرێ و لەو ئافرەتانەی کەبەدیلی گرتبوون کچێکی سوڵتان جلالەدینی خەواریزمشا بوو بـۆیە کـچەکەی جەلالەدینـی خەواریـزم شـاه دەکـاتە دیـاری بـۆ کـوڕەکەی

---

(١) البداية والنهاية، لاپەڕە٣٤١ بەرگی ١٥.

حاكمی موصل و پێی دەڵێ ئەو كچە بخوازەو بابێتە ژنی تۆ، مەلیك صالح كچەكەی جلال الدين خەواريزم شاه دەخوازێ.[١]

لەڕەمەزانی ساڵی (٦٥٧) هۆلاكۆ خۆی و هاوپەیمانەكانی لە پادشاكانی جۆرجیاو ئەرمینیا بەسوپایەكی گەورەی زیاد لە (١٥٠) هەزار كەس لە(ئازەربایجانەوە) بەرەو گرتنی (سوریا) كەوتنە ڕێ، سەرەتا ناوچەی (وان) و (خیلات)ی داگیركرد، ئینجا چوو بۆ (دیاربەكر) و ئەویشی داگیر كرد (یەشموت)ی كوڕیشی پێشتر ناردبوو بۆ داگیركردنی (مەیا فارقین) بەڵام لەساڵی (٦٥٦) ڕا هێزەكەی (یشموت) گەمارۆی شاری (مەیافارقین)ی دابوو، نەیان توانی بوو ئەو شارە داگیر بكەن، مەلیك صالحی كوڕی بەدرەدین لؤلؤ لەموصڵەوە بەهێزێكی گەورە بەرەو گرتنی (ئامەد) و دواتر (ڕوها و نەصیبین) كەوتبونە ڕێ، كەبەداخەوە بەماوەیەكی كەم ئەو شارانە داگیر دەكرێن، ئینجا هۆلاكۆ لەڕووباری فوڕات دەپەڕێتەوەو گەمارۆی شاری (حەلەب) دەدەن.

تێبینی: ناوچەی (ماردین) ئەو كات لەژێر دەسەڵاتی مەلیك سەعید بوو، مەلیك سەعید بڕیاری دا كە ڕوو بەڕووی سوپاكەی مەغۆل ببێتەوە، بۆیە توانیان بۆ چەند مانگێك شەڕی مەغۆل بكەن، بەڵام مەلیك سەعید دوو كوڕی هەبوون، یەكیان ناوی (مظفر)دەبێ و دەچێتە لای باوكی و دەیەوێ قەناعەتی پێبكا كەسوپاكەی مەغۆل كەس ناتوانێ بەرەنگاری

---

(١) جامع التواريخ، بەرگی٣ لاپەڕە ٣٣١.

بێتەوە، بەڵام مەلیك سەعید بڕیار دەدا ڕوو بەڕووی مەغۆل ببێتەوە، ئەو کوڕەی مەلیك سەعید شەو باوکی خۆی دەکوژێی و کلیلی قەڵاکە دەنێرێ بۆ (هۆلاکۆ) هۆلاکۆش بەوە دەزانێ و سوپاسی دەکا و دەیکاتە والی (ماردین) و بە سوڵتانی لەو شارە دەمێنێتەوە تاوەکو ساڵی (٦٩٥) دواتر دەمرێ و کوڕێکی دەبێ بەناوی شمس الدین کە ئەویش دەمرێ کوڕی شەمسەدین کەناوی نجم الدین دەبێتە سوڵتانی ئەو شارەو پەیوەندێکی زۆر جاکی دەبێ لەگەڵ سوڵتانی ئەوکاتی مەغۆل (غازان خان). (١)

---

(١) جامع التواريخ، بەرگی ٣ لاپەڕە ٣٢٦ . وە کتێبی، تاريخ الدولة المغولية فی ايران، دکتور عبدالسلام عبدالعزيز فهمی، لاپەڕە ١٣٩.

# هاوپەیمانی نێوان
# مەغۆل و نەسڕانییەکان و خاچپەرستەکان

یەکێك لەو هۆکارانەی وای کرد هۆلاکۆ گورج بکەوێتە ڕێ بۆ گرتنی شام، ئەو هاوپەیمانی و بەرەیەبوو کەلەنێوان هەرسێ هێزی (نەسڕانییەکان و خاچپەرستەکان و مەغۆلەکان) ئەنجامدرا.

مەبەست لەخاچپەرستەکان ئەو نەسڕانییە ئەوڕوپایانە بوون کە بەنیازی گرتنی قودس و دەرهێنانی لەدەست موسڵمانان ڕوویان کردبوە ناوچەکە (هیتوم) مەلیکی ئەرمینیا کەدەزانێ پایتەختی خیلافەتی ئیسلامی (بەغدا) دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان، لەهەمان کاتدا ناوچەی (جەزیرە) بەتەواوی خەریکە دەکەوێتە دەست مەغۆلەکان، ئەوەی بەهەلێکی گەورە زانی و پەیوەندی کرد بە مەغۆلەکان، مەلیکی ئەرمینیا بڵاوی کردوە کە ئێستا چاکترین کاتە بۆ ئەوەی (قودس) لەچنگی موسڵمانان دەربهێنرێ، بۆیە (بوهمیندی شەش)ی مەلیکی (ئەنتاکیە) ئەویش هاتە نێو ئەو بەرەیە و پەیوەندێکی زۆر توندو تۆڵی لەگەڵ پادشای ئەرمینا دەبێ و دوای ئەوەی کچی پادشای ئەرمینیا دەخوازێ هەندەی تر لەیەك نزیك دەبنەوە، لەولاوەش خێزانی هۆلاکۆ کەناوی (دوقزخاتون) بوو، ببوە نەسڕانی و ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لە نزیك کردنەوەی هەموو ئەو لایەنانە ئینجا

هۆلاکۆ نەسرانییەکان دڵنیا دەکاتەوە کەبەشێك لەکارەکانی ئەو ڕزگارکردنی نەسرانییەکانی ژێر دەستی موسڵمانەکانە، هەر وەها هۆلاکۆ جەختی لەسەر ئەوە دەکردەوە کە زۆرێك لەعەشایەرو قەبیلەکانی مەغۆل بونەتە نەسرانی بۆیە هەر شوێنێکیان دەگرت زوو مزگەوتەکانیان دەکردە کڵێسەو کڵێسەکانیان ئاوەدان دەکردەوە.[١]

هەردوو ئیمارەتی نەسرانی لەناوچەکە بەهاتنی مەغۆل تەواو بوژانەوە، ئەرمینیای بچوك(ارمينيا الصغرى) کە پایتەختەکەی شاری (سیس)بوو لەباشوری (ئەنادۆڵ) شاری (مێرسین و ئەدەنەو دەوروبەری شاخی تۆڕۆس)ی تورکیا و سنوری لەسەر سنوری ئیمارەتی (ئەنتاکیا)ی نەسرانی بوو کە ئەویش شاری تەرسوسی سوریای ئیستا و زۆربەی قەراغ دەریاکەیان لەبەر دەست بووە، هەردوو ئیمارەتی نەسرانی هەردەم دوژمنێکی گەورەی ئەو ئوممەتە بویینە لەگەڵ هەموو هەوڵێك بووینە بۆ داگیر کردنی (قودس) و دەرهێنانی لەدەست موسڵمانان کە دواتریش باسی ئەو ئیمارەتە دەکەین لەسەردەمی (زاهیر بێبرس)ی مەملوکی.

---

(١) تاريخ ايران بعد الاسلام، لاپەڕە ٤٤٢ عباس اقبال.

# کەوتنی(مەیافارقین)[1] و
# شەهید بوونی(مەلیك کامیل محمدی ئەییوبی) (*)

سەرەتا کەهێزەکانی مەغۆل دەگەنە دەوروبەری شاری (مەیا فارقین) ئەو شارە گەمارۆ دەدەن و (یشموت)ی کوڕی هۆلاکۆ نامەیەك دەنێرێ بۆ مەلیك (کامیل) داوای لێدەکات قەڵاکە تەسلیم بەهێزەکانی مەغۆل بکرێ، مەلیك کامیل ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ بەم جۆرە وەڵامی (یشموت) دەداتەوە.

واچاکە ئەمیر ئاسنی سارد نەکوتێ (مەبەستی یشموتی کوڕەکەی هۆلاکۆیە) و چاوەڕوانی شتێکی موستەحیل نەکات، هیچ متمانە بە پەیمانتان ناکرێت، منیش قەت بەقسە شیرینەکانتان ناخەڵەتێم، هیچ ترسیشم لەسوپای مەغۆل نییە، چۆن متمانە بەکوڕی پیاوێك بکەم، وەفای بۆ هیچ پەیمانێك نەبووە کەداویەتی بۆنمونە (خورشاە و حسام الدین عەککەو تاج الدین اربل) مەلیك ناصیر بەتایبەت هاتە لاتان ئینجا

---

(١) مەییافارقین شارێکی کوردستانییەو لەبەناو بانگترینی شارەکانی دورگەی فوڕات بووە ئێستا ناوی (سلوان، Silvan) لەوڵاتی تورکیا لەباکوری خۆهەڵاتی دیاربەکرە، ناوی تەواوی شەهید کامیل (الْكَامِل مُحَمَّد بن المظفر غَازِي بن الْعَادِل أبي بكر بن أَيُّوب بن شادي)

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٦ .

هەڵوێستی وای بینی کە لەنزیکیتان پەشیمانە منیش بەهەمان شێوە، ئەگەر بەقسەتان بکەم ئەوە دەبینم کە ئەوان بینینان. [(١)]

تێبینی: مەبەست لەناوی (خورشاه) ڕوکنەدین خورشایە گەورەی ئیسماعیلییەکانە، ئەوکاتەی قەڵای ئیسماعیلیەکان دەکەوێتە دەست هۆلاکۆ، ڕوکنەدین خورشاه گەورەی ئیسماعیلەکان دەستی هەبوو لەتەسلیم کردنی ئەو قەڵایانە و زۆربەی گەنجینەکان کە شاردرابوونەوەو خورشاه شوێنەکانی بە هۆلاکۆ گوت، بەو ئومێدەی کە گیان و دەسەڵاتی بپارێزێ، سەرەتا هۆلاکۆ بەوەی زانی و ڕێزی تایبەتی لە ڕوکنەدین خورشاه گرت، بۆیە کچێکی مەغۆلی پێبەخشی و شاری قەزوینی بۆ دیاری کرد، خۆی و دەوروبەرەکەی لەو شارە دەمێننەوە، بەوەش هۆلاکۆ توانی تا ڕادەیەك متمانەی مەلیك و پادشاکانی ناوچەکە بەدەست بێنێ و ناڕاستەوخۆ پێی وتن: ئەگەر ئێوەش هاوکاریمان بکەن ئاوا ڕێزتان لێدەگرین هەروەکو ڕێزمان لە خورشاه گرتوە، ئینجا هۆلاکۆ ڕێ بەخورشای پادشای ئیسماعیلییەکان دەدا کە سەردانی (قراقورم) بکاو بچێتە خزمەت خانی گەورە (منکوخان)، بەڵام خانی گەورە زۆر بەسوکی سەیری (خورشاه)ی کردو ڕیی نەدا بێتە خزمەتی و گوتی: پێویستی نەدەکرد کەسێکی ئاوا بێتە سەردانم و وڵاغی مەغۆلی پێ ماندوو بکەن، بیگەڕێننەوە بۆ ئەو شوێنەی کەلێی هاتوە، فەرمانی بەهەندێکیش کرد لەڕێی گەڕانەوەی بیکوژن، ئەوەبوو چەند

---

(١) الاعلاق الخطيرة، بەرگی٣ لاپەڕە ٣٤٥.

کەسێك لەڕێی گەڕانەوە هەڵیان کوتایە سەر (خورشاه)و لەڕێگادا کوشتیان.

ئەوە چیرۆکی (ڕوکنەدین خورشا)یە، بۆیە مەلیك عادیل بە کوڕەکەی هۆلاکۆ دەڵێ: ئێوە جێی متمانە نین و پەیمان ناپارێزن.[1]

ئینجا مەلیك کامیل ڕەحمەتی خوای لێبێ، لەگەڵ ئەو سەرکردەو موجاهیدانەی لەگەڵی بوون، ڕێك دەکەون کەدەبێ دەستنەدەن و جیهاد بکەن تا دوا هەناسەیان، مەلیك کامیل ڕوو لەخەڵکی (مەیافارقین) دەکاو دەڵێ: هیچ ڕەزیلێتان لەگەڵ ناکەم بەو ئاڵتون زیوەی کە لە گەنجینەکانداهەن، هەرهەمووی دەبەخشمەوە بە خەڵکی پێویست، من سوپاس بۆخوا وەکو موستەعصیم نیم، (مەبەستی خەلیفەیە) کە بەندەی دینارو درهەم بوو، ئەو دینارو درهەمەی سەری خوارد، موڵکی بەغدای هەموو لەدەستدا بەهۆی ڕەزیلی و چاوچنۆکی.

ئینجا هێزەکانی مەغۆل خەندەقێکی گەورە لەدەوری شارەکە هەڵدەکەنن و مەنجەنیق بەرامبەر شارەکە دادەنێن و دەست دەکەن بە بەردباران کردنی شارەکە، مەلیك (کامیل) خۆی و چەند سوارچاکێك ناوە ناوە لەقەڵایەکە دەردەهاتن و شێرانە پەلاماری هێزەکانی مەغۆلیان دەداو چەندین کەسیان لێدەکوشتن و بەسەلامەتی دەگەڕانەوە قەڵاکە، مەلیك (کامیل) دوو پاڵەوانی لەگەڵ بوون یەکیان ناوی (سیف الدین لوکبلی)بوو ئەوەی تر

(١) رشید الدین فضل الله: جامع التواریخ، لاپەڕە ٢٥٧-٢٥٨.

ناوی (عنبر الحبشی)بوو، ئەو دووکەسەش زۆر جار لەقەڵاکە دەردەهاتن و شێرانە پەلاماری مەغۆلیان دەداو سوارچاك و پاڵەوانەکانی مەغۆلیان دەکوشت، ڕۆژێکیان ئازاترینی مەغۆلەکان سوارچاکێك بوو بەناوی (ناوری کورجی) ئەو پیاوە لەناو مەغۆلەکان هەندە ئازاو ڕەشید بووە، گوتراوە خۆی بەتەنها سوپایەك دەبەزێنێ، بەڵام ئەو پیاوەش بەدەستی پاڵەوانەکانی ئیسلام دەکوژرێ، مەغۆلەکان بەکوشتنی (ناوری کورجی) زۆر دەشڵەژێن.

# چیرۆکی ئەو موسڵمانەی بە مەنجەنیقەکەی سوپاکەی هۆلاکۆی هەراسان کردبوو

لەناو قەڵاکە مەنجەنیقێکی لێبوو ئەو موسڵمانەی بەکاری دەهێنا زۆر بەوردی حیساباتی بۆ دەکرد و زۆربەی هەدەفەکانی دەپێکاو هەر بەردێکی گەورەی ڕادەوەشاند چەندین سەربازی مەغۆلی دەکوشت، ئەو مەنجەنیقە کۆسپێکی زۆر گەورە بوو لەبەردەم سوپای مەغۆلەکان، هەواڵ دەگاتە (یشموت) کە (بەدرەدین لؤلؤ)ی حاکمی موصل، کەسێکی لایە زۆر زانایە لەبەکارهێنانی (مەنجەنیق) و زۆر ئەستەمە هەدەفێکی بۆ دیاری بکرێ و لەدورەوە نەیشکێنێ.

یەشموت فەرمان دەکا ئەو کەسەی بۆبێنن، ئەوپیاوە لەموصلەوە بەڕێدەکەوێ و دەگاتە مەیدانی جەنگ و مەنجەنیقەکەشی لەگەڵ خۆی هێنا و ڕێك بەرامبەر بەمەنجەنیقی موسڵمانەکانی دامەزراند، ئنجا دەستی کرد بە بەردبارانکردنی مەنجەنیقی موسڵمانان، ئەوەی لێرە زۆر سەیرە (ڕەشیدەدین هەمەدانی)[1]، دەڵێ ئەو دوو مەنجەنیقە کە کەوتنە بەرامبەر یەك ئەوەندە بەوردی بەردیان بۆیەك ڕادەوەشاند، زۆر جار بەردەکان لە

(١) لەکتێبی (جامع التواریخ، ج٣ لاپەڕە ٣٢٠) کە بەیەکێك لەگرنگترینی ئەو سەرچاوانە هەژمار دەکرێ کە باسی شەڕەکانی مەغۆل دەکەن.

ئاسمان بەیەك دەكەوتن ئینجا وریایی و زیرەكی خاوەن مەنجەنیقەكەی (مەیافارقین) زۆر لەوەی موصل چاكتر و باشتر بوو بۆیە دوای ماوەیەك مەنجەنیقەكەی هۆلاكۆ دەشكێنێ، ئەوەش بێگومان پەیوەندی بەزانستی (ڕەصەد) هەبووە، كە ئەو كەسەی مەنجەنیقی بەكارهێناوە زۆر لێی شارەزابووە، بەڵام بەداخەوە گرنگی زۆر كەم بە گێڕانەوەی ئەو جۆرە ڕوداو ناساندنی ئەو جۆرە كەسانە دراوە كەڕۆڵی زۆر سەرەكیان هەبوو لە بەرەنگاربوونەوەی هێزەكانی مەغۆل، ئینجا (یشموت)ی كوڕی هۆلاكۆ تەواو قەناعەتی بۆ دروست دەبێ كە ئەو شارە ناگیرێ، خەندەقێكی زۆر گەورەو فراوانیان لەدەوری قەلاكە هەڵكەندو گەمارۆیەكی زۆر توندیان خستە سەر شارەكە، ئەو گەمارۆیە نزیكەی دوو ساڵی خایەند، لەو ماوەیەدا خەڵكی شارەكە خۆراكیان نەماو دوچاری برسیەتیەكی زۆر گەورە هاتن، تاگەیشتە ئەو ئاستەی هەر چی سەگ و پشیلەی شارەكەش هەبوو ئەوانیشیان هەموو خوارد، برسیەتی ڕووی تێكردبوون زۆر جار گۆشتی مردووەكانیشیان دەخوارد، ئەو دوو پاڵەوانە تا دوا نەفەس شەڕیان كرد، هەتا لەهەڵمەتێكیان توانیان بگەنە سەر سەركردەی سەربازی مەغۆل(ئیلكا نەویان) لەئەسپەكەی خستیانە خوارەوەو خەریك بوو بیڕفێنن، بەڵام كەتیبەیەكی گەورەی مەغۆلەكان بەهانای (ئیلكا) هاتن و لەبەر دەستی ئەو دوو پاڵەوانە ڕزگاریان كرد.

برسیەتی تا دەهات زیاتر تینی بۆ دەهێنان، ئەو دوو پاڵەوانە بەناچاری ئەسپەکانیان کوشتەوەو گۆشتەکەیان خوارد، ئەوە بوو هیچ خواردنێك لەشارەکە نامێنیٚ و یەکێك بەرەو مەغۆلەکان ڕادەکاو ڕێی هاتنە ناو قەلاکەیان پێدەڵیٚ، بەمەغۆلەکان دەڵیٚ: ئەوانەی ماون تەنها بەناو ماون ئەگەر نا برسیەتی بەتەواوی پەکی خستوون، ئینجا مەغۆلەکان هێرش دەکەنە سەر شارەکەو دەتوانن (مەلیك کامیل) بەدیل بگرن و هەردوو پاڵەوانەکەش (سیف الدین لوکبلی) و (عنبر الحبشی، عەنبەر حەبەشی) خۆیان بەدەست نادەن تاوەکو هەردوکیان شەهید دەکرێن فیردەوس جێگەیان بیٚ.

هۆلاکۆ داوای (مەلیك کامیل) دەکات، ئەو کات (هۆلاکۆ) لەناو چەی (الرها، ڕوها) دەبێت کەئێستا شاری (ئورفەیە) لەعنەتی خوای لەسەربیٚ تا ڕۆژی دوایی لە ڕۆژی دواییش خوای گەورە تۆڵەی ئەو هەموو خوێنەی لێبکاتەوە کەڕشتویەتی، هۆلاکۆ کە چاوی بەمەلیك کامیل دەکەویٚ لێی دەپرسیٚ: لەبەر چی نەهاتی بۆلامان گوێڕایەڵیت نەکردین .

مەلیك کامیل: ئەتۆ کێی تاوەکو من گوێڕایەڵی تۆبکەم و ناو چەوانت ببینم، من زۆر لەتۆ چاکترم و جیهادی تۆ لەدین دایەو واجیبە بەڕوی تۆ بجەنگم.

هۆلاكۆ: بەچی تۆ لەمن چاكتری؟

مەلیك كامیل: بەوەی من موسڵمانم باوەڕم بەخواو پێغەمبەری خوا هەیە (صلی الله علیه وسلم)، لە (عەدەن) تاوەكو (تبریز) موڵكی ئێمە بوو هەمومان لەدەست دەرچوو، تەنها خوای گەورە خاوەن موڵكەو هەرئەوە موڵك بەوە دەبەخشێ كەویستی لەسەریەتی و لەوەشی دەسەنێتەوە كەویستی لەسەریەتی، ئەگەر خوای گەورە ویستی لەسەربێ ئەوەی بەسەرئێمە هات بەسەرتۆش دێی و ماڵ ومناڵەكانت بەدیل دەگیرێن و سوپاكەت لەناودەچێ خۆشت بەدەستی كەسێكی تر دەكوژرێی.

هۆلاكۆ: قسەكانت زۆر لەخۆت گەورەترن، ئینجا پەرداخێك مەی پێدەبەخشێ.

مەلیك كامیل: مەی حەرامەو ئێمە مەی ناخۆیینەوە.

هۆلاكۆ داوا لەخێزانەكەی خۆی دەكا كە ئەو پەرداخێك مەی بداتێ و بەو ئومێدەی مەی لەدەستی ئافرەت نەگێریتەوە، بەڵام مەلیك (كامیل) لەویشی قبوڵ ناكات و ئینجا بەر لەوەی بكوژرێ مەلیك(كامیل) ڕەحمەتی خوای لێبێ، تفێك لە هۆلاكۆ دەكاو زۆر قسە پێدەڵێ. (هۆلاكۆ) لەعنەتی خوای لەسەر بێ، فەرمان دەكا پەنجە پەنجە گۆشتی جەستەی لێبكەنەوەو بیخەنە زاری تا بەو ئەشكەنجەیە گیانی دەردەچێ ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ، ئینجا سەری لە لاشەی جودا دەكەنەوە، شار بەشار سەرەكەی دەگێرن، دواتر دەیبەن لەدیمەشق لەدەرگای (الفرادیس) سەرەكە

هەڵدەواسرێ تا دەرکردنی مەغۆل لەشام، لەلای دەرگای (الفراديس) گۆڕستانێك هەبووە بەناوی (مشهد الحسين) و سەرەکەی لەوێ دەنێژرێ ڕەحمەتی خوای لێبێ.[1]

شێخ شهاب الدين أبو شامة ڕەحمەتی خوای لێبێ بەچەند بەیتە شیعرێك لەمەدحی ئەو پیاوە دەڵێ:

ابن غازى غزا وجاهد قوما    أثخنوا فى العراق والمشرقين

طاهرا عاليا ومات شهيدا    بعد صبر عليهم عامين

لم يشنه إذ طيف بالرأس منه    وله أسوة برأس الحسين

واتە: کوڕی غازی جیهادی قەومێکی کرد خوێنێکی زۆریان لە عێراق و خۆرهەڵات ڕشت، پیاوێکی پاك و خوا ویست و هیمەت بەرز بوو و بەشەهیدی سەری نایەوە، دوای ئارامگرتنێکی دوو ساڵەیی، هیچ سوکایەتی نییە بۆ ئەو کەسەریان لەشاران گێرا لەبەر ئەوەی نمونەی حوسەینە ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ کە سەرەڕای گەورەیی ئەو پیاوە، بەڵام دەستی دوژمنی پێگەیشت و سەریان لەلاشەکەی جودا کردەوە،

---

(١) الأعلاق الخطيرة في ذكر أمراء الشام والجزيرة (لاقەڕە ١٩٢) وە سير أعلام النبلاء (٢٣/ ٢٠١) وە طبقات الشافعية الكبرى للسبكي (٨/ ٢٧٦) وە السلوك لمعرفة دول الملوك (١/ ٥٢٣)

زۆربەی سەرچاوەکان کەباسی مەلیك (کامیل)دەکەن بەشەهید ناوی دەبەن خوای گەورە بەشەهیدی قبوڵکات و فیردەوس جێگەی بێ.[١]

مەلیك کامیل ڕەحمەتی خوای لێبێ نمونەی حاکمێکی ئازاو بەجەرگە، دیواری ترس لەمەغۆل دەڕمێنێ و بەهەڵوێستەکانی بەو ئوممەتە دەڵێ: کە (ژیان وموڵك و دەسەڵات) شایستەی ئەوە نین بەسەرشۆڕی بیانپارێزین، هەڵوێستەکەی مەلیك کامیل وەکو ئەو چەرخەیە کە لەسەرجەم غیرەت و مەردایەتی دەدرێت و دواتر بەڕووی مەغۆلەکان دەتەقێتەوەو (عین جالوت)ی پێهەڵدەگیرسێ ودەیکەنە دۆزەخێك بەڕووی مەغۆلەکان، پێم وایە کە بەداخەوە داستانی (مەیافارقین) و پاڵەوانێکی وەکو مەلیك (کامیل) وەکو پێویست خزمەت نەکراوە بەتایبەت لەو کتێبە تازانەی بەو دواییە لەسەر هێرشەکانی مەغۆل نوسراوە، کورد دەیان پاڵەوانێتی ئاوایان نواندوە بەرامبەر بەهێرشی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی، بەڵام بەداخەوە نوسەرە عەلمانییەکان باسیان نەکردوە وە نوسرە عەرەبەکانیش مافی ئەو میللەتەیان نەداوە.

---

(١) بڕوانە: مسالك الأبصار في ممالك الأمصار (٢٧/ ٣٨٢).

# هۆلاكۆ لەڕوباری (فوڕات) دەپەڕێتەوەو دەگاتە (شام)

هۆلاكۆ بەو هێزە زەبەلاحەیەوە لەڕوباری فوڕات دەپەڕێتەوەو، دەگاتە شام سوپاكەی مەغۆل چەند پردێكیان دروستكرد بۆئەوەی زوو لە فوڕات بپەڕنەوە[١]، هەندێك سەرچاوەی دەڵێن ژمارەی سوپاكەی هۆلاكۆ (٤٠٠) هەزار كەس بوو، [٢] بێگومان سەرەتای هاتنی هێزەكەی هۆلاكۆ لە ئازەربایجانەوە بەو ژمارەیە نەبووە، بەڵام لەگەڵ كەوتنی شارەكانی سەر ڕێگا، هەندێك لەپادشاكانی ناوچەكە، چونەژێر دەسەڵاتی هۆلاكۆ ئەوانیش بەسوپا بەشداری هێزەكانی هۆلاكۆیان كردو دەرەنجام ئەو هێزە گەورەیەی لێ دروست بوو.

ئەوەی جێی ئەسەفە كە ئەو ڕووداوانە دەخوێنیتەوە، دەگەیتە یەقین كە زۆربەی پادشاو سوڵتانەكان شتێكیان نەماوە بەناوی (وەلاءو بەڕاء) ئەو زیللەتەی بۆ هۆلاكۆیان نواند، خۆ ئەگەر بۆیەكتریان بنواندبایە، بێگومان دەیانتوانی ڕووداوەكان بەرەو ئاڕاستەیەكی تر ببەن، لەهەمان كاتدا هەڵوێستی ئەو پادشاو سوڵتانانە ڕێك پێچەوانەی قورئانی پیرۆزە.

---

(١) البدايةوالنهاية، بەرگی ١٥ لاپەڕە ٣٨٤.

(٢)تاريخ مختصر الدول، لاپەڕە ٤٨٦ ابن العبري.

خوای گەورە کەباسی موسڵمانان دەکا دەفەرمێ: {يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا مَنْ يَرْتَدَّ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَسَوْفَ يَأْتِي اللَّهُ بِقَوْمٍ يُحِبُّهُمْ وَيُحِبُّونَهُ أَذِلَّةٍ عَلَى الْمُؤْمِنِينَ أَعِزَّةٍ عَلَى الْكَافِرِينَ يُجَاهِدُونَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَلَا يَخَافُونَ لَوْمَةَ لَائِمٍ ذَلِكَ فَضْلُ اللَّهِ يُؤْتِيهِ مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ وَاسِعٌ عَلِيمٌ (٥٤)}[١] توندو تیژ لەسەر ئەهلی کوفر و بەسۆزو بەزەیی لەگەڵ یەکتر، هەروەها خوای گەورە کەباسی ئەوانە دەکات لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بووینە دەفەرمێ: {مُحَمَّدٌ رَسُولُ اللَّهِ وَالَّذِينَ مَعَهُ أَشِدَّاءُ عَلَى الْكُفَّارِ رُحَمَاءُ بَيْنَهُمْ تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا سِيمَاهُمْ فِي وُجُوهِهِمْ مِنْ أَثَرِ السُّجُودِ ذَلِكَ مَثَلُهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَمَثَلُهُمْ فِي الْإِنْجِيلِ كَزَرْعٍ أَخْرَجَ شَطْأَهُ فَآزَرَهُ فَاسْتَغْلَظَ فَاسْتَوَى عَلَى سُوقِهِ يُعْجِبُ الزُّرَّاعَ لِيَغِيظَ بِهِمُ الْكُفَّارَ وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ مِنْهُمْ مَغْفِرَةً وَأَجْرًا عَظِيمًا(٢٩)}[٢] ئەوانەی لەگەڵ پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) بوینە توند و تیژ بوینە لەگەڵ ئەهلی کوفر، بەڵام بەسۆزو بەزەیی بوینە لەگەڵ یەکتر، ئینجا خوای گەورە دەفەرمێ: تَرَاهُمْ رُكَّعًا سُجَّدًا يَبْتَغُونَ فَضْلًا مِنَ اللَّهِ وَرِضْوَانًا. ئەوانە

---

(١) المائدة: ٥٤

(٢) الفتح: ٢٩.

خاوەن عیبادەت بووینە لەسجودو ڕکوع دەیان بینی، بەڵام بەراوردی نێوان موسڵمان بکە کەلەو ئایەتە پیرۆز باسی کراوە لەگەڵ سوڵتان و پادشاکانی ئەو کات ئەوان بەڕاستی (لم یکونوا رکعا ولا سجدا) ئەوەی ڕکوع و سجودە لێیان باس ناکرێ، بەڵکو تەنها خەریکی هەوەسی خۆبوینە، دینیان فرۆشتوە بۆ پاراستنی کورسی دەسەڵاتەکەیان.

خەڵکی شام کە بەوە دەزانن هۆلاکۆ لەفوڕات پەڕیوەتەوە زۆریان (سوریا) جێدەهێڵن و بەرەومیسڕ دەکەونەڕێ، زۆرێك لەو خەڵکە لەڕێگای گەیشتن بە(میسڕ) وەفات دەکەن و خەڵکێکی زۆر دەربەدەر دەبن و ماڵ و شارەکانیان جێدەهێڵن، ئەو کات سوڵتانی (دیمەشق و حەلەب) مەلیك (ناصر صلاح الدین یوسف کوڕی عەزیز محمد کوڕی زاهیر غازی کوڕی ناصر صەلاحەدینی ئەییوبی) دەبێ.

یەکەم شار لەشام گەمارۆ دەدرێ شاری (حەلەب)ە ئەو شارە بەتەواوی گەمارۆ دەدرێ و چەند دەرگایەکی هەبووە، هۆلاکۆ کردنەوەی هەر دەرگایەك دەخاتە ئەستۆی یەکێك لەسەرکردەکانی ئەو سوپایە و بیست مەنجەنیقی گەورە لەدەوری حەلەب دادەنرێ و شارەکە زۆر دڕندانە بەردباران دەکەن و خەندەقێکی گەورەش بەدەوری شارەکە هەڵدەکەنن بۆ ئەوەی کەس نەتوانێ ڕابکا، بەماوەیەکی کەم مەغۆلەکان دەچنە نێو شارەکە، خەڵکی شارەکە ئازایەتێکی زۆر دەنوێنن، بەڵام دەرەنجام شارەکە دەکەوێ، خەڵکێکی یەکجار زۆر لەحەلەب دەکوژرێ زیاتر لە (١٠٠)هەزار

ژن و منـاڵی حەلەب بەدیـل گیـران و کـرانە کەنزیەوکۆیلە لە مەمەلەکەتـی (ئەرمینیـا و ئەنتاکیـا)ی نەسڕانی فرۆشران. (ولاحـول ولاقـوة الا باللـه)، ئەرمەنی و سەڵیبییەکان ڕۆڵێکی یەکجار خراپ دەبینن بەتایبەتی مەلیك (هیتـوم)ی ئەرمەنـی کە مزگەوتـی گەورەی سـوتاند، حەلەب قەڵایەکـی لێبــوە خەڵکــی ئەو قەڵایە زۆر ئازایــانە بەرەنگــاری، هێزەکــانی مەغــۆل دەبنەوە، دوای نزیکەی چل ڕۆژ قەڵاکەش دەکەوێ.

# کەوتنی قەڵای (حارم) (*)

دواتــر مەغۆلەکــان بەرەو قەڵای (حــارم) دەکەونەڕێ، قەڵای (حــارم) دەکەوێتە باکوری خۆر هەڵاتی شاری (ئیدلب) ئەو کات دەکەوتە بەرامبەر ئیمارەتی (ئەنتاکیا)ی نەسرانی، هێزەکانی مەغۆل داوا لەخەڵکی قەڵاکە دەکەن قەڵاکە تەسلیم بکەن، ئەوانیش دەڵێن ئێمە متمانەمان بەئێوە نییە، بەڵام ئامادەین تەسلیمی کەین بە والی قەڵای حەلەب کەناوی (فخرالدین المعروف) بوو ناسراو بەساقی، لەبەر ئەوەی ئەو پیاوە پیاوێکی ڕاستگۆیە و متمانە بەبەڵێنەکانی دەکرێ، هۆلاکۆ زۆر تورە دەبێ، بەڵام بەنیفاق دەڵێ: بڕۆن (فخرالدین الوالی)بێنن با سویندیان بۆ بخوا کە ئەگەر قەڵاکە تەسلیم بکەن سەلامەت دەبن، ئەوە بوو (فەخرەدین) دێنن و لەبەر دەم هۆلاکۆ و سوپاپەکەی سوێندی بۆخواردن کە گیانتان سەلامەتەو (هۆلاکۆ) بەڵێنی سەلامەتی ئێوەی پێداوم، ئینجا خەڵکی قەڵاکە، هاتنە دەرەوەو قەڵاکەیان تەسلیم بەسوپاکەی (مەغۆل)کرد، هۆلاکۆ لەعنەتی خوای لەسەربێ، پێی گوتن ئێوە تاوانبارن متمانەتان بەمن نەکردوە بە

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٧ .

(فخرالدین)تان کردوه، بۆیە سەرەتا (فخرالدین)ی کوشت[١]، دواتر خەڵکی قەڵاکەی هەر هەموو کوشت لەژن و مناڵ و گەنج و پیرو پەککەوتە.

ئەوەش دیسان بەڵگەیەکی زۆر گەورەیە لەسەر ئەوەی کەنەهۆلاکۆ نە غەیری ئەو لەسەرانی کوفر متمانەیان پێناکرێ، بەتایبەت لەو کاتەی موسڵمانان لاوازن، دەکرێ دووهێزی بەرامبەر بەیەك لە توانا وەکو یەکبن، پەیمانیان لەنێواندا هەبێ، بەڵام لەحاڵەتی بە هێزی ئەهلی کوفرو لاوازی موسڵمانان ئەگەری پابەند نەبوون بە برِگەکانی پەیمانەکە هەردەم لەئاراداهەیە، ئینجا دوای ئەوە شارەکانی (حەما و مەعەڕەو حیمص) هەموی یەك بەدوای یەك کەوتن و ترس باڵی کێشا بەسەر تەواوی سوریا و ئەو پادشایانەی مابوون بەخۆیان هاتنە لای هۆلاکۆ، شوێنەکانیان تەسلیم کرد، مەلیك (ناصرِ)یش ڕای کرد بەرەو شاری غەززە.[٢] ئەو کاتەی (هۆلاکۆ) لەحەلەب دەبێ هەواڵی مردنی (منگو)خانی گەورەی مەغۆلی پێدەگاو، سەرکردیەکی سەربازی گەورە بەناوی (کتبغانوین) لەشوێنی خۆی جێدەهێڵێ و خۆی دەگەڕێتەوە بۆ (خیلات).[٣] لەو ماوەیە مەغۆلەکان خەڵکێکی یەکجار زۆریان کوشت بەتایبەت لەناوچەی حۆران و نابلس و دەوروبەری تاگەیشتنە (کەرەك)ی ئەردەن و شاری خەلیل و غەززە، لەو ناوچانە پیاوەکانیان دەکوشت و ژن و مناڵەکانیشیان بەکۆیلە

(١) تاريخ مختصر الدول، لاپەڕە ٤٨٨.

(٢) المغول فی التاريخ، لاپەڕە ٢٩٦. فؤاد عبدالمعطي الصياد.

(٣) تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة المغولية، عباس اقبال، لاپەڕە ٢٠٩.

دەبرد، یەکێك لەو پاڵەوانانەی لەو شەڕانە دەکوژرێ، کەسێك بوو بەناوی (مجیرالدین کوڕی سیف الدین) پیاوێکی ئازاو ڕەشید بووە، نزیکەی نۆزدە کەس دەوریان دابوو لەمەغۆلەکان هەر هەموویانی کوشت، دواتر لەدوورەوە تیری تێدەگرن و شەهیدی دەکەن.[1]

(١) المذیل علی الروضتین بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٤١.

# کەوتنی شاری (دیمەشق)

دوای گرتنـــی حەلەب و قەڵای حـــارم ســـوپای مەغۆلەکـــان چەنـــدین مەنجەنیقـی گەورەیـان بەجوانەگـاو ئێستر ڕادەکێشـا و تیرۆرمێکـی زۆریـان لەجوانەگاکان بارکردبوو و گەمارۆی دیمەشقیان دا ئەوەی سەرپەرشتی ئەو هێـزەی دەکرد (کەتبغـا نـوین) بـوو کە دواتـر لەجەنگـی (عـین جـالوت) دەکوژرێ، کەهەواڵی کەوتنی تەواوی شـاری (حەلەب) دەگـاتە (دیمەشـق) دیمەشـقییەکان دیـاری بـۆ هۆلاکـۆ دەنێـرن، بـۆ ئەوەی دووچـاری هەمـان دواڕۆژی (حەلەبییەکان) نەبنەوە (دیمەشق) بەبێ شـەڕ تەسلیم بە هۆلاکۆ دەبـێ دوای ئەوەی (مەلیـك) ناصـر ڕادەکـا، سـەرەتا خەڵکێـك لەدەوری مەلیك ناصر کۆبونەوە بۆئەوەی ڕووبەڕوی هێزەکەی مەغـۆل ببنەوە، بەڵام کەچاویـان بەزۆری سوپای مەغـۆل کەوت هەر کەس بەلایەکەوە ڕای کـردو دیمەشقیان چۆڵکرد، دیمەشقییەکان لیژنەیەکیان پێکهێنـاو تەسلیم بەهۆلاکـو بـوون، مەغۆلەکـان دەچـنە نێـو دیمەشـق و بـورجە بەرزەکـانی ئەو شـارە دەڕوخێنن و ئەو مەنجەنیقانەش دەشکێنن کەلەسەر بورجەکان بوون، ئینجا خودی (کەتبغانوین) ببوە نەسڕانی، بۆیە ئەو شارە تەسلیم بەکەسێك دەکات بەناوی (ایـل سـیان) ئەو کەسـەش نەسـڕانییەکانی زۆر لا گەورە بـوو، نەسڕانییەکانیش ئەوە بە هەلێکـی زۆر گەورە دەزانـن و هێـرش دەکەنە سـەر

مزگەوتەکان و لەگەڕەك و کوچەو کۆڵانەکانی دیمەشق دەگەڕان و وتاریان دەدا کە ئەوە ئـــایینی حەق ئـــاینی نەســـڕانییەت گەڕایەوەو ئیســـلام کەئایینێکی باتیڵ بوو(پەنابەخوا) لەنێو چوو.

نەسڕانییەکان دەچونە بەردەرگای مزگەوتەکان و عەرەقیان بەدەرگای مزگەوتەکان دادەکرد و موسڵمانانیان بەعارەق تەڕدەکردو داوایان لەخەڵکی بازاڕو مزگەوتەکان دەکرد بۆ سەلیبەکان هەڵسنەوە سەرپێ و پلانیان دانابوو تەواوی مزگەوتەکان بکەن بە کڵێسە.[1]

نەسڕانی و شیعە وەکو دوو دوژمنی سەرسەختی ئەو ئیسلامە سەڕەرای ئەوەی مافیان لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئیسلامی پارێزراو بوو، بەڵام هەموو کاتێك لەبۆسەدابووینەو هەرکاتێك هێزی دوژمن ڕووی لە موسڵمانان کردبێ ئەوان بوونەتە چاوساغی دوژمنان و هێرشیان کردۆتە سەر مزگەوت و بونەتە ژمارەیەکی گەورە لە دژایەتی ئەو ئیسلامە ئەوەش ڕێك مانای ئەو ئایەتەیەکەخوای گەورە دەفەرمێ: {وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ}[2] جولەکەو گاور قەت لێت ڕازی نابن تاوەکو شوێن میللەتی ئەوان نەکەوی، بەڵی زۆربەی جەنگەکانی مێژوو ئەو جەنگانەی ئێستاش جگە لە هۆکاری ئابوری پاشخانێکی عەقایدی هەیە.

(١) البداية والنهاية، ج ١٥ لاپەڕە ٣٥١.
(٢) البقرة: ١٢٠.

# سەرەتاو و دروستبونی دەوڵەتی (مەمالیك)

بەر لەوەی باسی جەنگی عەین جالوت(بکەین گرنگە ئەگەر بەکورتیش بێت، باسی سەرەتاو دروستبوونی دەوڵەتی(مەمالیك) بکەین لەبەر ئەوەی دروستبوونی دەوڵەتی مەمالیك لەو کات و ساتە گەورەترین ڕەحمەت بوو بەو ئوممەتە، لەهەمان کاتیشدا دروستبونی دەوڵەتی مەمالیك ئەوەمان پێدەڵێ، کەنەکەن بێئومێد بن لەڕەحمەتی خوای گەورە، زۆر جار لەخراپترین حاڵەت، بارودۆخێك دروست دەبێ ئاڕاستەی ڕووداوەکان دەگۆڕێ، کە مێژووی ئەو کات دەخوێنیتەوە ئەوەت بۆ ڕوون دەبێتەوە، کە سوڵتان خاوەن دەسەڵاتی ڕەهابووە، لەهەمان کاتیشدا خەڵکەکە ئەوەیان قبوڵ بوەو گوێڕایەڵی سوڵتان و دەرنەچون لەفەرمانەکانی بەدینیان زانیوە، سوڵتان و پادشاکانی ئەو کات نەك خاوەنی کۆشك و تەلار، بەڵکو خاوەن وڵات بووینە، ئەوەش تایبەت نەبووە بەسوڵتان و پادشاکان لە جیهانی ئیسلامی، بەڵکو لەتەواوی جیهان ئەوە پەیڕەو کراوە، بۆنمونە ئەوکاتەی (جەنگیزخان) دەمرێ ئەو مەملەکەتە فراوانەی لەنێوان کوڕەکانی دابەش دەکا، پادشاکانیش لە جیهانی ئیسلامی بەهەمان شێوە، دوای مردنی خۆیان

مەملەکەتەکەیان دابەشکراوە بەسەر کوڕەکانیان، ئەوەی کە جێی سەرنجە لەو بابەتە ئەو خەڵکە ئەوەیان قبوڵکردوەو پێیان شتێکی ئاسایی بووە، بۆیە نەمان زانیو شوڕشێك هەڵگیرسابی لەسەر ئەو بابەتە وەکو بڵێی ئەوەیان بەمافی سوڵتان زانیوەو لایان جێی گفتوگۆنەبووە.

خاڵێکی تریش کە زۆر گرنگە باسی بکەین، مێژوونوسان کەباسی ڕووداوەکانی ساڵی (٦٥٧ و ٦٥٨) یان کردوە، دەڵێن: ساڵی تازە دەستی پێکرد و موسڵمانان بێ خەلیفەنە، (بێ خەلیفە)بون بەکارەساتێکی گەورە زانراوە، سەرەڕای بونی ئەو هەموو پادشاو حاکمانەی کە یەکلاکردنەوەی کێشەکان لەنێو خەڵکی بەپێی شەریعەت کراوە کەچی ئەو بێ خەلیفە بونە بەموسیبەتێکی گەورە زانراوە، لەبەر ئەوەی بونی خەلیفە یانی بونی مەرجەعێکی گەورە خەڵکی موسڵمان لەگەڵ جیاوازی نەتەوەکانیان لەدەوری ئەو خەلیفەیە کۆبونەتەوە.

دەبێ ئێمە ئەوڕۆ ئەرکمان چەند قورس بێ کەنەك خەلیفە، بەلکو شەریعەتیش لە واقیع بونی نەماوە، زۆر لەکێشەکانی ئەوڕۆمان پێویستە لە سێبەری ڕووداوەکانی ئەو دوو ساڵە دیراسە بکرێ و (بێ خەلیفە بوون) بە نەزەری ئیعتبارەوە وەربگیرێ بەتایبەت ئەو بابەتانەی پێویست بەدەسەڵات دەکا بۆ جێبەجێکردن و یەکلایی کردنەوەی.

## مانای مماليك

(المماليـك) كـۆی (مەملـوكه) واته: كـۆیله، بەڵام ئەو كـۆیلانه هەر لەسـەرەتاوه بەنیـازی ڕاهێنـان لەسـەر شـەڕو ئەنجامـدانی كـاری سـەربازی دەهێنران، زۆر جار له تەمەنی منداڵییەوه دەكرِدران و لەسەر سوار چاكی و هێرش كردن و جەنگ ڕادەهێنران، ئەو كۆیلانەی دەكرِدران زیـاتر تـورك و قه‌فقـاس و مەغـۆل و ڕۆمـی بـوون، ئەوانه لەمنـاڵیەوه دەهێنـران و دوای ئەوەی فێره ئاینی ئیسلام دەكران ئینجا ئامادە دەكران بۆ ڕاپەڕاندنی كـاری سـەربازی، دەتـوانین بڵێـین مەلیـك صـالح یەكەم كەس بـووه كەكـۆیلەیەكی زۆری هێنایه میسر بۆڕاپەڕاندنی كاره سەربازییەكانی.

سـەرەتا (مەلیـك صـالح) ئەو كـۆیلانەی هێنـایه شـاری (قـاهیره)، بەڵام ژمارەیـان زۆر بـوو خەڵكیـان بێـزار كـرد بـۆیه قەڵایەكـی دروسـت كـرد لەناوچەی (ڕەوزه) لەدەرەوەی قاهیره، ئەوانه ناو نران(مەمـالیكی دەریـایی) كەژمارەیان هەزار كەس بوو. [1]شـوێنی ئەو قەڵایه لەسـەر ڕووبـاری (نیـل) بـوو، چەنـد كەشـتییێكیش بەبەردەوامـی پڕ چەك و لەئامـادە باشـی دابـوو، هەركاتێـك خاچپەرسـتەكان هێرشـیان بكردبـا ئەو مەمالیكـانه بەو كەشـتییه ئامادەكراوه ڕوو بە ڕوویان دەبوونەوه.

---

(١) بدائع الزهور فی وقائع الدهور: محمد بن احمد بن اياس الحنفي، لاپەڕه ٢٦٩ بەرگی یەكەم.

دەوڵەتی ئەییوبی و دەوڵەتی مەمالیك لە دوو كاتی زۆر گونجاو هاتنە بوون، ئەییوبییەكان بونە بەربەستێكی گەورە بەڕووی نەسرانییەكان و ڕۆژ هەڵاتی ئیسلامیان لە سەلیبییەت ڕزگاركرد، مەمالیكەكانیش ئەو شەپۆلەسەرشێتەی مەغۆلیان سنوردار كردوو پاشەكشەیان بەدڕندەترین هێز كرد كە مێژووی مرۆڤ بەخۆوەی بینییەوە، بۆیە دەبێت لەچوارچێوەی باسەكان دەربارەی دەوڵەتی مەمالیك باسی هێرشی حەوتەمی خاچ پەرستەكانە بكەین بۆ سەر جیهانی ئیسلامی گەرچی لەبەشی یەكەم بەكورتی باسمان كرد.

# هێرشی حەوتەمی خاچپەرستەکان بۆ سەر جیهانی ئیسلامی دەوڵەتی مەمالیکی هێنایە بوون

ئیمپراتۆری ئەڵمانی (فریدریك)ی دووەم، بەیەکێك لەگەورەترین پادشاکانی ئەورووپا هەژماردەکرێ، سنوری دەسەڵاتی ئەڵمانیاو باکوری ئیتاڵیاو صقلیه بوو، ئینجا پاپا (هونوریوسی سێیەم) فریدریك هاندەدا بۆئەوەی هەڵمەتی خاچ پەرستی بۆ سەرخاکی موسڵمانان دەستپێبکاتەوە، قودس ڕزگار بکا لەدەست موسڵمانان، (فریدریك)ی دوو، پەیوەندی هەبوو لەگەڵ جیهانی ئیسلامی و بەتایبەتی لەگەڵ مەلیك عادلی ئەییوبی، بۆیە ساردبوو لەدەستپێکردنی ئەو هەڵمەتە، دوای مردنی پاپا هونوریوسی سێیەم و هاتنی پاپا گریگۆری نۆ بۆ سەر کورسی پاپایەتی، ئەو ساردییەی لە (فریدریك) قبوڵ نەکردو کەوتە پلانگێران دژی، پاپا (فریدریك)ی ناچار کرد بەرەو خاکی موسڵمانان بکەوێتەڕێ، لەولاوە دووبەرەکی باڵی کێشابوو بەسەر پادشاکان لەجیهانی ئیسلامی، بەتایبەتی بنەماڵەی ئەییوبییەکان، لەگەڵ مردنی (مەلیك عادل) کێشە نێوخۆییەکانی بنەماڵی ئەییوبی زیادی کرد، مەلیك عادیل سێ کوڕی هەبوو، مەلیك کامیل دەبێتە خاوەنی (میسر) وەمەلیك موعەززەم دەبێتە خاوەنی (دیمەشق و قودس) وەمەلیك ئەشرەف دەبێتە خاوەنی ناوچەی

(جەزیرەو خیلات) مەلیك موعەززەم دژی هەردوو برای مەلیك (كامیل و مەلیك ئەشرەف) هاوپەیمانییێك ئەنجام دەدا لەگەڵ جلال الدینی كوڕی خەواریزم شاه، مەلیك كامیلی خاوەنی (میسر) لەڕقی ئەو هاوپەیمانییەی نێوان جلال الدینی خەواریزم شاو و مەلیك موعەززەمی خاوەنی دیمەشق، دەچێ لەگەڵ ئیمپراتۆر(فریدریك) ڕێك دەكەوێ دەڵێ: سوپاكەت بهێنە ناوچەی عەككە و لەوەدڵنیابە كەئێمە لەمیسرەوە هێرشت ناكەینە سەر، لەهەمان كاتدا بەڵێنی ئەوەی پێدا كە (قودس)ی تەسلیم بكا.

ئەوە خیانەتێكی گەورەیە مەلیك (كامیل) ئەنجامی دا، نەك دژ بەبرایەكەی، بەڵكو دژ بەو ئوممەتە ئەگەر چی هەندێ تەفسیری بۆ دەكرێ، گوایە ویستویەتی فشار بخاتە سەر(مەلیك موعەززەم)ی برای بۆئەوەی بەرەی (موعەززەم و، جلال الدین خەواریزم شاه) سەرنەگرێ، بەهەر حاڵ هیچ شتێك قبوڵ نییە بكرێتە بەهانەی تەسلیم كردنی قودس بە خاچپەرستەكان، لەبەر ئەوەی قودس موڵكی ئوممەتە نەك هی پادشاكان وەكو فشارێكی سیاسی لەسەر یەك بەكاری بێنن، لەساڵی (٦٢٤) مەلیك موعەززەم وەفات دەكا بەرلەوەی هێزی خاچپەرستەكان بگەنە ناوچەكە بۆیە (ئەشرەف و كامیل) هەردوو برا لە نێوان خۆیان بڕیار دەدەن مەملەكەتەكەی موعەززەم دابەش بكەن و كێشەی نێوانیان حەل دەكەن، بەڵام (فریدریك)ی دوو گوتی ئێمە خاوەن پەیمانێك بووین مردنی موعەززەم هیچ لەو بابەتە ناگۆڕێ، لەساڵی (٦٢٥) (فریدریك)ی دوو دەگاتە شاری (عەككا) هەر

لەو کاتیش لەگەڵ مردنی مەلیك(موعەززەم) مەلیك(کامیل) لەمیسرەوە دەگاتە شام بۆئەوەی دەست بەسەر موڵکی براکەی دابگریٚ، کوڕی مەلیك (موعەززەم) ناوی (داود)بوو، دوای مردنی باوکی ئەو هاتە سەر کورسی دەسەلآت، بەڵام کەسێکی لاواز و بێدەسەلآت بوو، ئەوە بوو مەلیك (کامیل) کەوتە دانوساندن لەگەڵ ئیمپراتۆر (فریدریك)ی دوو لەسەر ئەو خاڵانە پێکهاتن.

یەکەم: قودس تەسلیم بەخاچپەرستەکان بکریٚ، بەو مەرجەی دیواری شارەکە چاك نەکرێتەوە، واتە شارەکە بەبیٚ شورە بمێنێتەوەو مزگەوتی (ئەقصا) لەژێر دەسەلآتی موسڵمانان بیٚ و گوندەکانی دەورو بەری قودسیش لەژێر دەسەلآتی موسڵمانان بیٚ.

دووەم: خاچپەرستەکان دەبنەخاوەنی هەموو ئەو دێیانەی دەکەونە سەر ڕێی (قودس) تاوەکو مەملەکەتی عەککا.[(١)] [(*)]

سێیەم: ئیمپراتۆر فردریکی دوو پەیمان دەدا کە پشتیوانی مەلیك (کامیل) بکات بەرامبەر ناحەزانی ئەگەر نەسرانی بن یان موسڵمان، هەروەها ئیمپراتۆر پەیمان دەدا نابیٚ بەهیچ جۆرێك یارمەتی سەربازی هێزە سەڵیبییەکانی شام بدات ئەو پەیمانەش دە ساڵ دەخایەنیٚ.

ئەو پەیمانەی نێوان مەلیك (کامیل و فریدریك) بوە جێی نیگەرانی

---

(١) عەککا ئێستا لەژێر دەسەلآتی ئیسرائیلەوکەوتۆتە باکوری ئیسرائیل.

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٨ .

لای موسڵمانەکان، لەزۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکان بوو بەتەعزیەو زاناو شێخەکان ڕوویان کردە مزگەوتەکان و دەستیان بەوتاردان دا، ئیمام شمس الدین یوسف ناسراو بە(سبط ابن الجوزی)[1] لەڕوداوەکانی ساڵی (٦٢٦) کۆچی باسی ئەو ڕوداوە دەکا کە خۆی تێیدا ژیاوە، دەفەرمێ داوام لێکرا لە شام وتار بدەم، لەمزگەوتی دیمەشق وتارمدا لەسەر ئەو بابەتە، خەڵکێکی زۆر هاتنە گریان و هەموویان ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ ئەوەی چەك هەڵگرن و قودس ڕزگار بکەن لەدەست نەسرانییەکان، ئینجا دەفەرمێ: ئیمپراتۆر فریدریك چوە قودس و کەچوە لای بەردەکە، بینی قەشەیەك لەوێیا دانیشتوە دوعا بۆخەڵکی دەکا بەپارە (فریدریك) لێیدەداو سەرزەنشتی دەکا و گوتی، سوڵتان یارمەتی داوین بۆ ئەوەی سەردانی قودس بکەین کەچی تۆش بازرگانی پێدەکەی، خزمەت کاری بەردەکەی (بیت المقدس) پیاوێکی نەسرانی بوو دەگێریتەوە دەڵێ: ئەو ماڵە صلاح الدین ئەییوبی پاکی کردەوە کەچی ئێوە هاتون پیستان کرد، دیارە ئاهەنگیان گێڕاوەو عەرەقیان لای بەردەکە خواردۆتەوە، خزمەتکارەکە پێیان دەڵێ: ئەو تۆڕەی لەپەنجەرەی ژورەکان دراوە بۆئەوەی باڵندە نەیەتە ژوەرەوە پیسی نەکات، کەچی بەرازەکان هاتونەتە ژوورەوەو ئەو شوێنەیان پیسکرد.[2] ئەوەی کلیلی قودسی تەسلیم بە (فریدریك)کرد قازی نابلس

(١) شمس الدين أبو المظفر يوسف بن قِزْأُوغلي بن عبد الله، سبط ابن الجوزي (٥٨١ - ٦٥٤ هـ).
(٢) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٣٠٠).

بوو، ناوی شمس الدینی قازی بوو، بەفەرمانی مەلیك (کامیل) کلیلەکە تەسلیم دەکاو داواش لەخەڵکی مزگەوتەکانی قودس کرد کەنەچنە سەر منارەکان و بەدەنگی بەرز بانگ نەدەن، یەکێك لە بانگبێژەکان ناوی (عبدالکریم)ەو ئەو فەرمانەی سوڵتانی بیر دەچێتەوە، بەیانی دەچێتە سەر منارەکەو چەند ئایەتێك دەخوێنێتەوەو ئینجا بانگدەدا (فریدریك) قازی بانگ دەکات ودەڵێ: ئەی سوڵتان چی پێ گوتن نەی گوت کەس بانگ نەدا.

قازیەکەش بانگبێژەکە بانگدەکاو ئەویش دەڵێ: بیرم چویەوە جارێکی تر بەدەنگ بانگ نادەم.

بۆ ڕۆژوو دووەم (فریدریك) هەستی خۆی ڕادەگرێ و لە هەمان کاتی دوێنێ کەس بانگ ناداو هیچ دەنگ نایە.

قازی بانگ دەکاو پێی دەڵێ: ئەو پیاوە دوێنێ بانگی دا چی بەسەر هات؟

قازی دەڵێ: بەفەرمانی سوڵتان قەدەغەمان کردوە لەبانگدان.

ئینجا (فریدریك) دەڵێ : نەکەن دینی خۆتان بۆ ئێمە بگۆڕن بەوە لەبەر چاوی ئێمەش کەم دەبن، دەی خۆ ئەگەر ئێوە لای من بن من لەبەر خاتری ئێوە دەنگی ناقۆسی کڵێسەکان قەدەغەناکەم .[١]

---

(١) مرآة الزمان في تواريخ الأعيان (٢٢/ ٢٩٦).

کە ئەو ڕوداوانە دەخـوێنیتەوە بەتەواوی بـۆت ڕوونـدەبێتەوە، کەخـوای گەورە ڕێنـادا ئەو ئـوممەتە لەنـاوبچێ، بەداخەوە ئەو مێژووەش نمونەیەکی زۆری لەجۆری ئەو پادشایانە تێدایە، کە بازرگانیـان بە موقەدەساتی ئەو ئـوممەتە کـردوە بـۆئەوەی خۆیـان لەسـەر کورسـی دەسـەڵات بمێنـنەوە، مەفهـومی دەرچـون لەدەسـەڵات و ئەوانەی ناویـان نـراوە (بـاغی) دەبێت بەتەواوی چاوی پێدا بخشێنرێتەوە، دورنییە ئەوەی لەدەسەڵاتی ئەو جۆرە سوڵتانەش دەرچوبا، چەند زانایەکیان بۆ کۆبکردبایەوە و فەتوای (خروج) دەرچون لەدەسەڵاتی حاکمیان بەسەر بسەپاندبایە!.

ئەو ڕێککەوتـنە نیگەرانێکـی زۆری لـێکەوتەوە، فریـدریك دوای ئەو سەردانەی قـودس دەگەڕێتەوە ئەوڕوپا، لەدوای مردنـی مەلیـك (کامیـل) لەساڵی (٦٢٧) مەلیـك (صالح ئەیوب)ی کوڕی دێتە شوێنی ئەو، ئەو سـوڵتانە بەیەکێـك لەچـاکترینی سـوڵتانە ئەییوبییەکـان هەژمـاردەکرێ، نەسـڕانییەکان لەو مـاوەیە هێزێکـی زۆریـان هێنـایە نـاوچەکە بـۆیە مەلیك(صـالح) لەگەڵ خەواریزمییەکـان ڕێکـدەکەوێ و لەسـاڵی (٦٤٢) خاچپەرسـتەکان دەشـکێنن و قـودس بـۆ جـارێکی تـر ئـازاد دەکەنەوەو نەسڕانییەکان زۆریـان لێـدەکوژرێ و زۆریشـیان لـێ بەدیـل دەگیـرێ، ئەو شکەسـتە گەورەیەی خاچپەرسـتەکان ئەوڕوپـای هەژانـد، پاپـا و شـەقام فشارێکی یەکجار زۆریان خستە سەرپادشاکان و داوایان کرد قودس لەدەست موسڵمانان بۆجارێکی تر دەربهێنرێتەوە.

# هەڵمەتی حەوتەمی خاچپەرەستەکان
# ساڵی (٦٤٧)

(لویسی نۆ) مەلیکی فەرەنسا زۆر نەخۆش دەبێ و (نەزر) لەخۆی دەگرێ ئەگەر لەو دەردە چاکببێتەوە سوپاسی خوا بکاو قودس بگێریتەوە بۆ نەسرانییەکان و لەدەست موسڵمانان دەریبهێنێ، ئەوەبوو لەنەخۆشیەکەی چاك دەبێتەوە، لەولاوەش تەواوی ئەوروپا لەدەستدانی قودسیان بەکارەساتێکی گەورە دەزانی، بۆیە خەڵکێکی یەکجار زۆر ئامادەیی خۆیان دەربڕی بۆ گوێڕایەڵی (لویسی نۆ) ئەوەی بۆ ئەو کۆبوەوە پاپاو کڵێسە پێشتر نەیانتوانی بوو کۆی بکەنەوە، سەرچاوەکانی مێژوو دەڵێن هێزی دەریایی مەلیك لویس (١٣٠٠)کەشتی دەریایی بوو، نزیکەی دە هەزار سوراچاك و (١٣٠)هەزار سەرباز جگە لەخزمەت کارو خەڵکی خۆبەخش کە بەگەڵ ئەو هێزە کەوتبوون.

سەرەتا ئەو هێزە گەورەیە دەگاتە (قوبرس) لە قوبرسەوە بەرێ کەوتن ڕاستەو خۆ بۆ (میسر) مەبەستی ئەو هێزە گرتنی (قودس)بوو، بەڵام لەبەر چی لەمیسرەوە دەستیان پێکرد؟

بـۆ وەلامـدانەوەی ئەو پرسـیارە خـاڵێکی زۆر گرنـگ هەیە مەبەسـتمە سەرنجی خوینەری بۆ ڕاکێشم.

## قودس و میسرٍ یەك کەیسن

مێـژوو پێمـان دەڵـێ: لای موسـڵمانەکان و لای نەسـڕانییەکان(قودس و میسـرٍ) یەك مەلەف و یەك (کەیسـن) بەو مانـایەی، ئەوەی مەبەسـتی ئـازادکردنی قـودس بـێ لەمیسـڕەوە دەست پێدەکات، وە ئەوەی مەبەسـتی داگیرکردنـی قودسـیش بێـت هەرلە میسـڕەوە دەسـتپێدەکات، بـۆیە صەلاحەدینی ئەییوبی ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لێبێ تا میسڕی ئازاد نەکرد نەیتـوانی قـودس ئـازاد بکـا، ئەو مەلەفە تـاوەکو ئێسـتاش هەر وەکـو خۆی ماوەتەوە، سیاسەتی ئیستای نێو دەوڵەتـی کەلەبەرژەوەنـدی ئیسـرائیل دایە، هەردەم لەهەوڵی ئەوەدان (میسرٍ)سەقامگیر نەبێ، لەبەر ئەوەی سەقامگیر بـونی میسـڕو پێشـکەوتنی هەڕەشـەی ڕاسـتەوخۆیە لەسەرئیسـرائیل، پێچەوانەکەشـی ناسـەقامگیر بـونی میسـڕو بەدواکەوتـویی مـانەوەی لەبەرژەوەنـدی ئیسـرائیل دایە، هەر لەبەر ئەوەشـە سیاسـەت کـردن لەمیسـڕ زۆر جیاوازە لەسیاسەت کردن لە شوێنەکانی تـر، لەبەر ئەوەی میسـڕییەکان ڕاستەوخۆ لەسەر هێڵی بەیەککەوتـن و ڕوو بەڕووبـونەوەن لەگەڵ سیاسـەتی نێـودەوڵەتی کەلەبەرژەوەنـدی ئیسـرائیل دایە، کـاتی خۆشـی (سـوڵتان و پادشا) بوون لەمیسرٍ ئەرکی قورس و جیاواز تر بوو لەسوڵتان وپادشا بـوون لەشوێنەکانی تری جیهانی ئیسلامی.

ئەو هێــزە گەورەیەی نەســڕانییەکان بەرەو میســڕکەوتنە ڕێ، ئەو هێــزە زەبەلاحە لەگەشـتـەکەی بەر زریـانێکی دەریـایی دەکەوێ، تـاڕادەیەکی زۆر هێزەکەیـان پەرت دەبـێ، کە بـووە مـایەی ئەوەی تەواوی هێـزەکە پـێکەوە نەگەنە میسڕ بەڵکو، ناوە ناوە پارچەیەکی ئەو هێزە دەگەیشتە میسڕ، بەشـی یەکەمـی هێـزەکە کەگەیشـتنە میسـڕ ئەو پـارچەیە بـوو کەخـودی (لویسی نۆ) سەرپەرشتی دەکرد.

(مەلیــك صــالح) هەر لەســەرتای هــاتنی ئەو هێرشــە، خــۆی بــۆ ئامادەکردبوو، چەند سەرکردەیەکی سەربازیشی ڕەوانەی (دومیات، دمیاط) کرد یەکێك لەو سەرکردە سەربازیانە ناوی (فخرالدين ابن الشيخ)بوو، لەبەر ئەوەی دەیـانزانی یەکەم شوێن کە هێرشـی بکـرێتە سـەری شـاری دومیـاتە، هێزەکەی مەلیك (لویس) لەکەشتیەکەیان دابەزیـن و هێرشیان کردە سەرئەو شارە.

هەنـدێك لەسـەرکردە سـەربازییەکان شـەهید کـران، کە بـوە مـایەی ئەوەی سەرکردە سەربازییەکانی تر لەگەڵ ئەو هێزەی لەو شارە بون، شـوێنەکانیان چـۆڵبکەن و نەسـڕانییەکان بەئاسـانی گەیشـتنە نـاو شـارەکەو شـارەکەیان گرت. خەڵکێکی یەکجار زۆریش ڕایانکرد و چونە دەرەوەی شارەکە زۆریـان لەڕێگادا مـردن و زۆریشـیان کەوتـنە بەر دەسـتی هێـزی نەسڕانییەکان، ئەو شکەسـتە بەشکەسـتێکی گەورە هەژمـار کـرا بـۆ موسـڵمانان و لەهەمـان کاتیشدا هێزی نەسڕانییەکان بەسەرکەوتنێکی گەورەیان زانی.

كە هەواڵی ئەو شكەستە دەگاتە مەلیك (صالح) سوێند دەخوا كە سزای هەمــوو ئەو ســەركردە ســەربازیانە بــدات كەڕایــان كــردوەو شــوێنەكانیان چۆڵكردوەو، چەند سەركردەیەكی سەربازی لەسێدارە دەدا، مەلیك (صالح) ئەو كات نەخۆش دەبێ، سەرەڕای ئەوە بڕیار دەدا خۆی سەرپەرشتی ئەو هێزە بكا كە ڕوو بەڕووی خاچپەرستەكان دەبێتەوە، دكتۆرەكان بەمەلیك صالحیان گوت كەسێكی تر لەشوێنی خۆت بنێرە لەبەر ئەوەی، شەڕێكی گەورەیەو بەو نەخۆشــیەوە نــاتوانی بەرەنگــاری ئەو هێــزە ببیــتەوە، بەڵام (مەلیك صالح) بەقسەیان ناكات و خۆی سەركردایەتی هێزەكە دەكات، ئەو هەڵوێستەی مەلیك (صالح) بوە جێی متمانەی ئەو خەڵكەو ئیتر پۆل بەپۆل خۆبەش و كەسی ئازا دەهاتنە ڕیز هێزەكەی مەلیك صالح، سوپای موسڵمانان بەڕێ دەكەون تادەگەنە شاری (مەنصورە) كە بەرامبەر بەهێزی نەسرانییەكان دەوەستن، لەو ماوەیە مەلیك صالح نەخۆشیەكەی توندتر دەبێت لە (١٥)مانگی شەعبانی ئەو ساڵ مەلیك صالح وەفات دەكا، خێزانەكەی بەناوی(ام خلیل، شجرة الدر)مردنی مەلیك صالح دەشارێتەوە تەنها چەند كەسێكی نزیكی مەلیك صالح بەوەفاتی دەزانن، شاردنەوەی هەواڵی مردنی مەلیك صالح لەبەر ئەوە بوو ورەی خەڵكی میسر نەڕوخێ و ورەی خاچپەرستەكان بەرز نەبێتەوە، بەتایبەت ئەو كات مردنی پادشا و سەركردەی سوپا كاریگەری ڕاستەوخۆی كردۆتە سەر هیمەت و خۆڕاگری ئەو خەڵكە.

خاتوو(شجرة الدر) نامە دەنێرێ و فەرمانەکان دەردەکا بەناوی (مەلیك صالح) بەنهێنیش وەفدێك دەنێرێ بەشوینی (تۆرانشاهی) کوڕی مەلیك صالح بەوەفدەکەدەڵێ:

نامەکە مەکەنەوە تا دەیدەنە دەست(تۆرانشاه) کە ئەو کات پادشای قەڵای (کەیفا)بوو لە (دیاربەکر). (*)

ئینجا وەفدەکە دەگەنە لای (تۆرانشاه) هەواڵی وەفاتی باوکی پێدەگاو ئەویش دەگەڕێتەوە میسر، دوای ئەوەی (تۆرانشاه) دەگاتە مەنصورە بەیعەتی پێدەدرێ (وتۆرانشاه) سەرکردایەتی سوپاکەدەکا. (١)

سەرەتا هێرشی نەسرانییەکان زۆر توند بوو، بەر لەوەفاتی (مەلیك صالح) خاچپەرستەکان هێرشێکیان کردو گەیشتنە دەوروبەری بنکەی مەلیك صالح، بەڵام چەند سوارچاکێکی دەوروبەری مەلیك صالح هێرشەکەیان شکاند، ئینجا وردە وردە سوپای نەسرانییەکان گەمارۆدرا، موسڵمانان کەتیبەیەکیان پێکهێنابوو، زۆربەی شەوان دەچون سەربازانی خاچپەرستەکانیان دەدزی و دەیانهێنایە بازاڕەکان و بەو خەڵکەیان ڕادەگەیاند کە ئەو هێزە هیچ نییە و موسڵمانان دەتوانن لەشوێنی خۆیان بیانڕفێنن.

---

(*) بڕوانە نەخشەی ژمارە ١٩ .

(١) البداية والنهاية (١٣/ ١٧٧).

سوپای خاچپەرەستەکان لەگەڵ گەمارۆدانەکە ورەیان بەجارەك ڕووخا، خۆراکییشیان بەرەو نەمان دەڕۆیشت کەشتییە دەریاییەکانی موسڵمانانیش لەپشتەوە دەریایان لێگرتن و ڕێی گەڕانەوەو گەیشتنی یارمەتیان بەتەواوی لە هێزی خاچپەرستەکان بڕی بۆیە مەلیك (لویس) بەناچاری هێرشێکی گەورەی کردە سەر سوپای موسڵمانان بۆئەوەی گەمارۆی سوپای موسڵمانان بشکێنێ، لەناوچەی (فارسکور) کە دەکەوێتە (نێوان دومیات و مەنصورە)ئەوە بوو موسڵمانەکان توانیان، گەمارۆی (لویسی نۆ)بدەن و لەگەڵ چەند سەرکردەیەك بەدیل دەگیرێ.

سەرچاوەکان دەڵێن: تەنها لەو شەڕە زیاتر لە سی هەزار سەلیبی کوژران جگەلەوەی غەنیمەیەکی یەکجار زۆر کەوتە دەست موسڵمانان، دوای ئەوە (لویسی نۆ) خۆی دەکڕێتەوە بەپارەیەکی یەکجار زۆر ئینجا بەشکەستێکی گەورەوە دەگەڕێتەوە بۆ عەککە دوای ماوەیەك لەوێ دەمێنێتەوە دواتر دەگەڕێتەوە فەرەنسا[1]، دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیەی موسڵمانان بەدەستیان هێنا، تۆرانشاه گرنگییەکی زۆر بە سەرکردە مەمالیکەکان نادا، بەڵکو زیاتر گرنگی بەدەورو بەرەکەی خۆی دەدا، چەند سەرکردەیەکی سوپای مەمالیکەکان بڕیار دەدەن تۆرانشاه بکوژن و ئەوە بو تۆرانشایان کوشت، ئینجا حوکم دەکەوێتە دەست (شجرة الدر) بۆماوەیەك ئەو ئافرەتە

(١)بۆ وردەکاری ئەو جەنگە گەورەیە بگەڕێوە سەر کتێبی: حملةلويس التاسع و هزيمته في المنصورة، محمد مصطفى زيادة.

حوكم دەكات كە بەيەكەم پادشای ئافرەت هەژمار دەكرێ لە ئيسلام.[(١)]
بەكوشتنی سوڵتان (تۆرانشاه) لەساڵی (٦٤٨) كۆتايی بەدەوڵەتی ئەيیوبی دێت كەلەساڵی (٥٦٧) تاوەكو ساڵی (٦٤٨) كەنزيكەی (٨٠) ساڵ حوكمی ميسرپيان كرد.

لەكتێبی (بدائع الزهور فی وقائع الدهور) بەرگی ١ لاپەڕە ٢٨٧ شعرێكی (ابو الحسين كوڕی ئەلجزار) نەقڵكراوە كەتێدیا بەچەند بەيتە شيعرێك باسی پادشای ئەيیوبييەكان دەكات و دەفەرمێ:

ثم تولاها الصلاح يوسف ثم العزيز ابنه مستنصف
ثم اتی الافضل نورد الدين وبعده العادل ذو التمكين
ثم ابنه الكامل ثم العادل كلاهما بالحكم فيها عادل
ثم أتی الصالح وهو الأعظم ثم تلاها بنه المعظم
وبعده ام خليل ملكت وطالت الأفعال منها وزكت
والملك الأشرف كان طفلا فلم يدبر عقدها والحلا

---

(١) شذرات الذهب، بەرگی ٧ لاپەڕە ٤١٢ . الحروب الصليبيه فی المشرق والمغرب، لاپەڕە ١٢٣ محمد العروسی المطوی.
تێبينی: مەبەست لە قەڵای (كەيفا) ئەوەی ئوردن نيە، بەڵكو ئەو قەڵايە لەناوچەی دياربەكربووە، كە بەداخەوە هەندێ لەو كتێبانەی باسی ئەو بابەتە دەكەن ئەو دوو شوێنەيان لێتێكەڵ بووە لەبەر ئەوەی يەك ناوی هەبووە.

دوای تۆرانشاه بۆماوەیەکی کەم (شجرة الدر) حوکمی میسرڕ دەگرێتە دەست، بەڵام خەلیفە لەبەغداو زانایان، پادشا بونی (شجرة الدر) یان قبوڵ نییە، بۆیە شجرة الدر شوو بە (عیزەددین ئەیبەك) دکاو سەرکردە سەربازییەکانی مەمالیك بەیعەت بە (عیزەددین ئەیبەك) دەدەن و دەبێتە سوڵتانی میسرڕ، (عیزەددین ئەیبەك) بەیەکەم سوڵتانی مەمالیکەکان هەژماردەکرێ، خاتوو(شجرة الدر) ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لەوەی کە (عیزەددین ئەیبەك) ببێ بەسوڵتانی مەمالیك، بەڵام دوای ئەوەی (ئەیبەك) دەبێتە سوڵتان ساردیەك دەکەوێتە نێوان ئەو و (شجرة الدر)ی خێزانی، لەبەر ئەوەی (ئەیبەك) نیازی وابوو، کچی (بدرالدین لؤلؤ)ی مەلیکی (موصل) بخوازێ، کە (شجرة الدر) بەوە دەزانێ، پیلانەك دادەنێ و (عیزەددین ئەیبەك) دەکوژن، لەساڵی (٦٥٢) کۆچی تاوەکو ساڵی کۆچی (٦٥٥) سەرکردایەتی سەربازی میسرڕ دەکەوێتە دەست کەسێکی ئازاو بەجەرگ کەناوی (سیف الدین قطز)ە، سەرکردە سەربازییەکان بەگشتی و بەتایبەتی (سیف الدین قطز) کوشتنی (عیزەددین ئەیبەك) بەتاوانێکی گەورە دەزانن، بۆیە بڕیار دەدەن تۆڵە لە (شجرة الدر) بکەنەوە، (شجر الدر)یان کوشت لەچیرۆکێکی دورو درێژ شایتەی ئەوەی بەتەنها باسی لێوەبکرێت، بەڵام باسکردنی لێرە لەمەبەست دورمان دەخاتەوە، ئینجا ئەو سەرکردانە کوڕێکی بچوکی (عیزەددین ئەیبەك) یان هێنا کەتەمەنی تەنها پازدە ساڵ بوو، بەیعەتیان پێداو کردیانە سوڵتانی میسرڕ، بەڵام

حاكمی فیعلی وڵات (سیف الدین قطز) بوو، لەگەڵ كەوتنی بەغدا لە ساڵی (٦٥٦) و دواتر كەوتنی شام، (سیف الدین قطز) زانی كە ئەو باروو دۆخە كەسێكی ئازاو بەجەرگ و خاوەن ئەزمونی دەوێ، كوڕەكەی(عیزەددین ئەیبەك)ی لەحوكم لاداو، خۆی بوو بەسوڵتانی میسرو خەڵكیش پێی ڕازی بوون و زانیان كە ئەو باروو دۆخە سەختە كەسێكی خاوەن ئەزمون سەركردەیەكی گەورەی سەربازی دەوێ.

## چەند سەرنجێكی گرنگ

یەكەم: ژیاننامەی خاتوو (شجرة الدر) ئەو خاتونە ئافرەتێكی ئازاو بەجەرگ بووە هەندێ لەسەرچاوەكان دەڵێن ئەرمەنی بووە، هەندێكیش دەڵێن تورك بووە، سەرەتا جاریەی(مەلیك صالح)بووە، مەلیك صالح زۆری خۆش ویستوەو دەیخوازێ، ئینجا كوڕێكی لێدەبێ بەناوی (خلیل)، بەڵام ئەو كوڕەی زوو دەمرێ، خاتوو (شجرة الدر) سەرەڕای ئەوەی ڕۆڵێكی گەورەی بینی لە شكاندنی هێزی سەلیبییەكان و ڕێی نەدا هەواڵی مردنی سوڵتان بڵاو ببێتەوە ناردی بەشوێنی (تۆڕانشاە)ی (زڕكوڕی) بۆئەوەی سەنتەری بڕیار تێك نەچێ لای موسڵمانان، سەرەڕای هەموو ئەو هەڵوێستە ئازایانە، بەڵام زۆر ناحەكیمانە مامەڵە دەكا ئەو كاتەی دەبیستێ كە (عیزەددین ئەیبەك) خەریكە كچی (بدرالدین لؤلؤ)ی حاكمی موصل دەخوازێ.

خاتوو (شجرة الدر) کە بڕیاری کوشتنی (عیزەددین ئەیبەك) دەدا لەبەر ئەوە نەبوە کەژنی بەسەر هێناوە، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە دەیزانی (عیزەددین ئەیبەك) مەبەستیەتی پەیوەندی خۆی لەگەڵ پادشاکان توند و ڕێکبخات، خۆی ڕۆڵی سەرەکی ببینێ لەحوکمی میسرٍ، بەڵام (شجرة الدر) کە شوی بە (عیزەددین ئەیبەك) کرد، تەنها لەبەر ئەوەی بوو کە دەسەڵات و کورسی حوکمی لەدەست دەرنەچێ وخۆی ناڕاستەوخۆ حوکمی میسرٍ بکات، لەبەر ئەوەی نەخەلیفە لەبەغدا نە شەقامی ئیسلامیش ڕێیان بە (شجرة الدر) نەدەدا، ڕاستەو خۆ حوکمی میسرٍ بکات، بۆیە کوشتنی (عیزەددین ئەیبەك) هەڵەیەکی گەورە بوو (شجرة الدر) پێی هەڵسا، چیرۆکی (شجرة الدر) قۆزراوە تەوە بەتایبەت لای (خۆرهەڵاتناسەکان) و ناحەزانی ئەو ئوممەتە، بۆنمونە ئەو کتێبانەی کە خۆرهەڵاتناسەکان لەسەر ژیانی (شجرة الدر)یان نوسیوە هەوڵێکی زۆرە بۆ ناشرین کردنی، یەکێك لەو کتێبانە کتێبی (شجرة الدر)ی جورجی زێدانە، گەرچی حەزناکەم لەبابەتەکە دەرچم و زەینی خوێنەر پەرت نەبێ، بەڵام زۆر گرنگیشە هەر لێرە ئاماژەیەکی کورت بەناحەزانی ئەو ئوممەتە بکەین کە وەکو مێژوونوس نیشان دراون و کە بەداخەوە کتێبەکانیان کراون بەسەرچاوە بەتایبەتی لە دیراساتی ئەکادیمی.

## جورجی زێدان کێیە؟

(جرجي زيدان) کابرایەکی نەسڕانییەو لەساڵی (١٨٦١)لە لوبنان لەدایك بووە، جگە لەزمانی عەرەبی، سریانی و فەرەنسی و ئنگلیزی زانیوە لەساڵی (١٩١٤) مردوە، جورجی زێدان کەسێکی چەندی بڵێی ئەوەندە حاقیدە بەرامبەر بە ئیسلام، بۆیە هەوڵێکی زۆری داوە مێژووی ئیسلام بشێوێنێ، لەڕێی چیرۆکە مێژووییەکان لەنێوان ساڵی (١٨٩١) تاوەکو ساڵی (١٩١٤) زیاتر لە (٢٢) چیرۆکی مێژوویی نوسیوەتەوە، باس لە کەسایەتیی و ڕووداوە مێژووییەکان دەکات، بەڵام بەشێوازێکی وا کە خوێنەر بخوێنێتەوە، واحاڵی دەبێ کە مێژووی ئیسلام تەنها مێژووی خوێن ڕشتن و خیانەت و کاوڵکاری بووە، (جرجي زيدان) چەند چیرۆکە مێژووییەکی لەو بووارەوە نوسیوەتەوە وەکو (عروس فرغانة) و (استبداد المماليك) و (شجرة الدر) و (فتاة القيروان) و زۆری تر، بۆیە گرنگە ئەگەر بەکورتیش بێ قسە لەسەر ئەو کتێبەی بکەین کە لەسەر (شجرة الدر)ی نوسیوە.

ئێمە لێرە بەکورتی ئاماژە بە چیرۆکی(شحرة الدر) دەکەین، بەڵام گرنگە خوێنەر بگەڕێتەوە سەر ئەو سەرچاوانە بۆ زیاتر شارەزابوون لەو پیلانەی دژ بە مێژووی ئیسلامی چنرا لەسەر دەستی (جورجی زێدان) سەرچاوەکان: نبش الهذيان من تاريخ جرجي زيدان، أمين بن حسن حلواني

المدنی، جرجی زیدان فی المیزان، شوقی ابو خلیل، وقفة مع جرجي زيـدان د.عبدالرحمن العشماوي.

## جرجی زێدان و چیرۆکی (شجرة الدر)

جرجی زێدان لەسەرتای کتێبەکەی دەڵێ: هەوڵمداوە بەسەرهاتەکانی ئەو چیرۆکە لەسەرچاوە باوەڕ پێکراوەکان وەربگرم، ئینجا ناوی سەرچاوەکانی نوسیوەو لەوانەی وەرگرتوە

یەکەم: کتێبی (حسن المحاضرة) ئیمام سیوتی کە بەهیچ شێوەیەك ئەو بابەتانەی تێدانییە کە (زێدان) ئاماژەی پێکردوە.

دووەم: کتێبی (سیر الملوك، سیاسەت نامە) ئەو کتێبە هی (نظام الملك)ە، کە گەورە وەزیری سەلجوقییەکان بووە، لەساڵی (٤٠٨) لەشاری (توس، طوس) لەدایك بووە، لەساڵی (٤٨٥) بەدەستی ئەندامێکی ئیسماعیلیەکان دەکوژرێ، کتێبی (سیر الملوك یان سیاسەت نامە) هیچ پەیوەندی بەو بابەتەوە نییە ئەوەندەی سەرنجم دا (جرجی زێدان) تەنها یەك دێریشی لێنەقڵ نەکردوە.

سێیەم: کتێبی (تاریخ ابن ایاس) کەناسراوە بە(بدائع الزهور في وقائع الدهور)، ئەو سەرچاوەیەش بەهەمان شێوە ئەوە دەسەلمێنێ کە (جورجی زیدان) بوهتان بەو سەرچاوانە دەکات.

چوارەم: (معجم یاقوت) ئەوەش فەرهەنگێکی جوگرافیەو باسی شوینەکان دەکات هیچ پەیوەندی بە بەسەرهاتی (شجرة الدر) نییە

دەکرێ تەنها بۆ زۆرکردنی سەرچاوەکان باسی ئەو سەرچاوەیەی کردبێ.

پێنجەم: باسی (مجلد ١٩) گۆڤاری هیلال دەکات کە خۆی دایمەزراندوە، ئەوەش بێ گومان نابێتە بەڵگە بۆ ئەو قسانەی لە چیرۆکەکە گێڕاویەتەوە.

شەشەم: (تاریخ ابن جبیر) مەبەستی (رحلە ابن جبیر) کەلەساڵی (٦١٤) وەفاتی کردوە، هیچ باسی خاتوو (شجرة الدر)ی تێدانییە، لەبەر ئەوەی (شجرة الدر) لەساڵی (٦٥٥) دەکوژرێ.

حەوتەم: (تاریخ الفخری) کەناوی کتێبەکەی (الفخري في الآداب السلطانية والدول الإسلامية) هی محمد کوڕی علی کوڕی تەباتەبایە ناسراوە بە(ابن طقطقا). لەساڵی (٦٦٠) لەدایك بووە لەموصل وە لە ساڵی (٧٠٩) وەفاتی کردوە، ئەو سەرچاوەیەش بەردەستەو هیچ لەوباسانەی تێدانییە کە جورجی زێدان باسی کردوون.

هەشتەم: (تاریخ مصر الحدیث) خۆی نوسەریەتی کە ئەویش پڕە لەچەواشەکاری و شێواندن.

جورجی زێدان دەڵێ: ئەو چیرۆکانەم لەو سەرچاوانە وەرگرتوە، بەڵام بەداخەوە بوهتانێکی ئاشکرا بەو سەر چاوانە دەکات، ئینجا جورجی زێدان

لەو کتێبەی کەبەناوی (شجرة الدر) بڵاوی کردۆتەوە، قسە لەسەر ئەو کەسایەتیانەدەکات.

یەکەم: خودی (شجرة الدر) و گوایە جاریەکی هەبووە بەناوی (شوکار).

دووەم: باسی (عیزەددین ئەیبەك) دەکات، وەکو سەرکردەیەکی سەربازی، (شجرة الدر) گوایە عاشقی بوە.

سێیەم: باسی (رکن الدین بێبرس) دەکات، ئەویش وەکو سەرکردەیەکی سەربازی، خاوەن پەوەندیێکی خۆشەویستی بووە لەگەڵ (شوکار)ی جاریەکەی خاتوو (شجرة الدر).

وەباسی ئافرەتێك دەکات بەنای (سولافە) گوایە ئافرەتێکی (کورد) بووە، باسی کەسێکی بازرگان دەکات بەناوی (سحبان) گوایە بازرگانێك بووە لەهەوڵی گێرانەوە (خیلافەی عەلەوییەکان) بووە بۆمیسرِ و ڕۆڵی بینوە لە هێنانی هۆلاکۆ، باسی (موستەعصیمی) خەلیفە دەکات لەگەڵ (احمد ابوبکر)ی کوڕی و باسی (هۆلاکۆ)ش دەکات گوایە لەشێوەی سواڵکەرێك هاتۆتە بەغدای پایتەخت و بەنهێنی چاوی بە وەزیر (ابن العلقمی) کەوتوە.

ئەوانە ئەو کەسایەتیانەن کە (جرجی زیدان) لە کتێبی (شجرة الدر) باسی کردون، هەر یەك لەوانە چەند بوهتانێکی بۆ هەلبەستون، سەرەتا بەچەند دێرێك باسی (شجرة الدر) دەکات، کە چۆن دوای مردنی مەلیك(صالح)ی پیاوەکەی، حەز لە (عیزەددین ئەیبەك) دەکا، ئینجا

جاریەکەی (شجرة الدر) حەز لە (ركن الدين بێبرس) دەکات، گوایە کاتی خۆی مەلیك(صالح) دوو جاریەی هەبوون، زۆری خۆش ویستون و زۆر جوان بووینە، یەکیان (شجرة الدر)ە، ئەوەی تر ئافرەتێکی کورد بووە بەناوی (سلافە).

دوای ئەوەی مەلیك صالح دەمرێ و (شجرة الدر) حوکم دەگرێتە دەست (سلافە) زۆری پێناخۆش دەبیٚ، بۆیە دەکەوێتە پلان گێران دژ بە(شجرة الدر) ئەوە بوو (سلافە) لەڕێی بازرگانێکی شیعی بەناوی(سحبان) نامەیەك دەنێرێ بۆ خەلیفە موستەعصیم، سولافە گوایە لەگەڵ بەرپرسی ئافرەتەکانی قەصری خەلیفە پەیوەندێکی زۆر خۆشی هەبووە، هەر لەبەر ئەوەشە نامەکە زوو دەگاتە دەست خەلیفە، ئینجا خەلیفە فەرمان دەکا بەلادانی (شجرة الدر) لەحوکمی میسرٍ، لەهەمان کاتدا (سولافە) بەخەلیفە ڕادەگەیەنیٚ کە (شجرة الدر) جارییەکی هەیە بەناوی(شوکار) ئەو جاریەیە، دەنگی زۆر خۆشە، بۆیە خەلیفە داوای ئەو جارییەیەش دەکا، ڕوکنەدین بێبرس کە دەزانیٚ، خەلیفە داوای خۆشەویستەکەی کردوە، بەنهێنی بەدوای خۆشەویستەکەی دەچێتە، بەغدا بۆ هێنانەوەی (شوکار) لەبەغدا چاوی بەتاوانەکانی (احمد ابوبکر)ی کوڕی خەلیفە دەکەوێ، لەکۆتاییدا هۆلاکۆ دەگاتە بەغدا و ڕوکنەدین بێبرس (شوکار)ی خۆشەویستی ڕزگار دەکاو (سولافە)ی جاریە دەکوژێ، ئینجا دەگەڕێتەوە میسرٍ.

ئەوە ئەوبابەتـانەیە کە(جـورجی زێـدان) لەو کتێـبە باسـی کـردوە، کە هەرهەمـووی لەدرۆو بوهتـان زیـاتر هیچی تـر نـین، نوسینەکانی (جورجی زیدان) بەشێکە لەو هەوڵەی کە (خۆرهەڵاتناسەکان) داویانە بۆ شێواندنی مێـژوو و ناشـرین کردنـی کەسـایەتییە مێژووییەکـان، چەنـد دەزگـایەکی گەورەی چاپەمەنی لە(میسرو لوبنان) ئەرکی بەچاپگەیاندنی کتێبەکانی (جورجی زێدان)یان گرتۆتە ئەستۆ، نەك بۆ یەك جار، بەڵکو بۆچەند جار کتێبەکانیان بەڕەنگاو ڕەنگی و شێوازێکی زۆر جوان بۆ چاپکردۆتەوە.

لەبەرامبەر ئەوە هەندێ، لەزاناو بیرمەندەکان هەوڵی ئەوەیان داوە تیشك بخەنە سەر ئەو جۆرە نوسەرانەو ئەو دەزگایانەی ئەو جۆرە کتێبە بەچاپ دەکەیەنن، بۆنمونە (یوسف العظم) ڕەحمەتی خوای لێبێ لەکتێبی (تاریخنا بین تزویر الأعداء و غفلة الأبناء) زۆر بەجوانی تیشکی خۆستۆتە سەر هەوڵی شێواندنی مێژووی ئیسلامی، ئەوە لەکاتێکدا هەوڵە شێواندنەکان زۆر گەورەو وردن، بەڵام بەداخەوە هەوڵەکـان بـۆ تیشکخستنە سەر پیلانـی ئەو تەوژمە لەئاستی پێویست دانییە.

شـیخ ڕەشـید ریضـا ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ لە (گۆڤـاری مەنـار) لە بەرگـی ٥ لاپەڕە ٥٠٠ هەروەهـا لە بەرگـی ١٧ لاپەڕە ٤٦٧ ستایشـی (جـورجی زێـدان) دەکـا، ئـێمە لەوە دڵنیـاین کە (شـیخ ڕەشـید) تەواوی کتێبەکـانی جرجـی زێـدانی نەخوێنـدۆتەوە ئەو کـاتیش شـیخ ڕەشـید وەکـو زانـایەکی گەورە دەرنەکەوتبوو لەبەر ئەوەی خـودی شێخ بەچەنـد قۆناغێك

تێپەڕیوە سەرەتا وەکو نوسەرێکی ئاسا دواتر وەکو صۆفییێك و دواتر دەکەوێتە ژێر کاریگەری (بزووتنەوەی وەهابی) و بە بیرو بۆ چونەکانی محمد کوڕی عبدالوهاب سەرسام دەبێ، لە بەرئەوە باسی ڕەشید رەیزامان کرد، نەبادا کەسێك بۆچونی ڕەشید ڕەیزا لەسەر جرجی زێدان بخوێنێتەوەو پێمان بڵێ ستەمتان لە جورجی زێدان کرد ئەوەتا ڕەشید ڕەیزا ستایشی کردوە، ئینجا بۆ ناسینی تەواوی جرجی زیدان پێشتر باسی ئەو سەرچاوەنەمان کرد کە گومانەکانی ئەو پیاوەیان ڕەواندۆتەوە.

## (سیف الدین قطز) کێ بوو؟

(سەیفەدین قوتز، سیف الدین قطز) قوتوز ناوێکی مەغۆلییە بەمانای سەگێکی دڕ دێت، سەیفەدین قوتز ئەو کاتەی کەمناڵە دەدزرێ بەکۆیلە دەیفرۆشن کەسێك دەیکڕی بەناوی (ابن الزعیم) لە شام، زۆر جار ناوەکە بەهەڵە دەخوێندرێتەوە، دەگوترێ (قەتز)، بەڵام ڕاستییەکەی وایە (قوتوز)[1] ئەو پیاوە سەرەتا کەسێکی مەملوك بوو، واتە کۆیلە بوو، کەسێك ئەو گەنجە دەکڕێ بەناوی (ابن الزعیم) لەدیمەشق، ابن الزعیم واتە خاوەنەکەی (سەیفەدین) زۆر خۆشی دەوێ و ڕێزێکی زۆری لێدەگرێ و زۆر جار کارەکانی بەو ڕادەپەڕێنێ، تا ڕۆژێکیان(ابن الزعیم) لەسەیفەدین تورە دەبێ و زلەیەکی لێدەدا و پێی دەڵێ: لەعنەتی خوا

---

(١) النجوم الزاهرة، بەرگی ٧ لاپەڕە ٧٢.

لەخۆت و لەباو و باپیرت، سەیفەدین قوتز ئەو ڕۆژە تا ئێوارە دەست بەگریان دەکا ئەو شەو تابەیانی نان ناخواو زۆر بێتاقەت دەبێ، ابن الزعیم برادەرێکی دەبێ زۆر خۆشەویستە لای دەچێتەلای و پێی دەڵێ: سەیفەدینی خزمەت کارم زۆر بێتاقەت بووە لەبەرئەوەی لێمداوە ئێستا هەست دەکەم بەردەوام دەگریێ و نان ناخۆا بۆیە ئەگەر قسەی لەگەڵ بکەی هەوڵبدەی دڵی چاك بکەیەوە، ئەو کەسە واتە: برادەرەکەی (ابن الزعیم) کەناوی (حاجی علی) بووە، دەڵێ چومە لای (سیف الدین) کەبینم ئەوگەنجە دەگریێ، دەڵێ منیش پێم گوت: ئەوە بە زللەیەکی (ابن الزعیم) ئاوا دەستت کردۆتە گریان، ئەی ئەگەر ڕم وتیرو شمشێرت بەرکەوێ دەبێ چی بکەی؟!، (سیف الدین قوتز) پێی دەڵێ: والله لەبەر زللەکە نەگریاوم، بەڵام لەبەر ئەو جنێوە دەگرێم کە بۆ باوك و باپیرمی نارد، والله باوك و باپیرم لەباوك و باپیری ئەو باشترن. (حاجی علی) پێی دەڵێ: چۆن باوك و باپیری تۆ لە باوك و باپیری ئەو باشترن خۆ ئەوان کافر بووینە و باوك و باپیری (ابن الزعیم) موسڵمانن؟! سەیفەدین قوتز دەڵێ: والله باوك وباپیری من کافر نەبوینە، بەڵکو موسلمان بوینە، من ناوم (محمودی کوڕی مەمدود)ە کوڕە خوشکی سوڵتان خەواریزم شاهی سەلجوقیم وەڕۆژێك دادێ دەبمە خاوەن دەسەڵاتی میسرو تەتارەکان دەشکێنم، حاجی علی دەڵێ: منیش بەقسەکەی پێکەنیم و دڵیم چاکردەوە،

دیـــارە حـــاجی (علی)قســـەکانی ســـەیفەدینی قـــوتزی بە خەونـــی (هەرزەکارەکان) زانیوە.[(١)]

کەوابوو سەرچاوەکان ئاماژەیان بەوە کردوە کە (قوتوز) خەواریزمیە، دواتر (مەلیك صالح) کە دەست دەکا بەهێنانی کۆیلەکان بۆ میسرِ، یەکێك لەو کۆیلانە ئەو گەنجەیە (سیف الدین قوتوز) ئینجا لە میسرِ پەیوەندییێکی زۆر چاکی بۆ دروست دەبێ لەگەڵ (عیزەددین ئەیبەك) کەسەرکردەیەکی گەورەی ئەو مەملوکانە بووە، زۆریش نزیك بووە لە (مەلیك صالح) دوای وەفاتی مەلیك صالح و هاتنی کوڕەکەی تۆڕانشاە، وردە وردە ئازایەتی سیف الدین قوتوز دەردەکەوێ، ئینجا دوای ئەوەی (تۆڕانشاە) دەکوژرێ و عزالدین ئەیبەك دێتە سەر کورسی دەسەڵات، دواتر (شجرة الدر) عیزەددین ئەیبەك دەکوژێ سەیفەدین قوتز یەکێك دەبێ لەوانەی تۆڵەی (عیزەددین ئەیبەك) دەکاتەوەو دەستێکی سەرەکی هەبوو لەکوشتنی (شجرة الدر) ئینجا سەرکردە سەربازییەکانی مەمالیك بڕیار دەدەن کوڕەکەی (عیزەددین ئەیبەك) کەناوی (نورالدین علی) بوو بکرێتە سوڵتان، دواتر نازناوی (الملك المنصور)ی پێدەبەخشن، لەهەمان کاتدا سەیفەدین قوتوز دەبێتە جێی متمانەی زۆربەی سەرکردەکانی مەمالیك و لەدەوری کۆدەبنەوە.

لەو کاتانە (ابن العدیم) لەشامەوە دێتە، میسرِو باسی مەغۆل و

(١) ئەو ڕیوایەتە لەکتێبی (الدرة الزكية في أخبار الدولة التركية)، لاپەڕە ٣٩ هاتوە. وە لەکتێبی النجوم الزاهیرە، لاپەڕە ٨٥ بەرگی ٧.

هەڕەشەکانی ئەوان دەکات و داوای یارمەتی لە میسرییەکان دەکا (سیف الدین قوتوز) دەستەیەکی گەورەی ڕاوێژکاری دامەزراند کە زۆربەی سەرکردە سەربازی و زاناکانی میسری تێدابوو، لەو گەورە زانایانە ئیمام (عیزی کوڕی عەبدولسەلام) و قازی (بەدرەدینی سینجاری) کەئەو کات قازی میسربووەو زۆری تر لە زانایان.

لەو مەجلیسە باس لەوە دەکرێ کە(بیت المال) پارەی تێدانەماوەو، مەغۆلەکانیش بەرەومیسر دێن، دەکرێ و جائیزە لە ڕووی شەرعەوە پارە لەدەوڵەمەندو خەڵکی ئاسایی وەربگرین بۆ ئەوەی بتوانین سوپا ئامادە بکەین و ڕوو بەڕووی مەغۆلەکان ببینەوە.

ئیمام عیزی کوڕی عەبدولسەلام دەفەرمێ: دوای ئەوەی ئاڵتون و دڕو و هەموو ئەو بەردە گرانبەهایانە لە دەسکی شمشێر و زینی ئەسپەکانتان و ئاڵتونی خێزانەکانتان دەکەنەوە، ئەو کات بۆتان هەیە داوای پارە لەو خەڵکە بکەن، بەڵام تا ئێوە خاوەنی کەرستەی گران بەهابن و خێزان و جارییەکانتان خاوەنی ئاڵتون بن بۆتان نییە پارە لەو خەڵکە بستێنن بەناوی جیهاد. (١) لەو مەجلیسە (نورالدین علی) کوڕەکەی (عیزەددین ئەیبەك) کە لەشوێنی باوکی بۆتە سوڵتان هیچ نازانێ و هیچ قسەیەکی لەسەر ئەو بابەتە هەستیارە نابێ، (سیف الدین قوتوز) باوەڕی تەواوی بۆ دروست دەبێ کە بارودۆخەکە زۆر لەوەترسناك ترە بەمناڵێکی ئاوا بێ ئەزمون بەڕێوە بچێ،

---

(١) النجوم الزاهیرە لاپەرە ٧٢ بەرگی ٧.

بـۆیە بڕیـاری لادانـی دەدات لە دەسـەڵات و خـۆی دەچێـتە شـوێنی ئەو، هەمـوو سـەرکردە سـەربازییەکانیش ئەو هەنگاوەی (سیف الـدین) یـان زۆر پێبـاش دەبـێ و بەیعەتیـان پێـداو (سـیف الـدین قوتـوز) بـو بەسـوڵتانی میسر.[1]

(١) المقریزی، ج ١ لاپەڕە ٤١٧. النجوم الزاهرة، بەرگی ٧ لاپەڕە ٥٥.

# جەنگی عەین جالوت (عين جالوت)
# لە ٢٥ مانگی ڕەمەزانی ساڵی (٦٥٨)[١]

خوای پەروەردەگار پیغەمبەری خۆشەویستی (صلى الله عليه وسلم) هەڵبـژارد بە دواپێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی پیرۆزیشی کردە دوا پەیامی بۆ مـرۆڤ، ئـوممەتی ئیسـلامیش بـوو بەدوا ئـوممەت، دەکـرێ ئەو ئـوممەتە لاوازی بەخـۆوە بینـێ، بەڵام موستەحیلە ئەو ئـوممەتە لە نـاوبچێ تـا ئەو ڕۆژەی خـوای گەورە کۆتـایی بە مـرۆڤ و ئەو دونیـایە دێنـێ، خـاڵی زینـدوو بـونەوەی ئەو ئـوممەتە ئەوەنـدە زۆرە، زۆر جـار لەشـوێنیکی ئـاوا زیندوو دەبێتەوە، کە ناحەزانی بەهیچ جۆرێك زەینیـان بۆ نەچوەو بۆنـاچێ، کێ دەیزانی جەبەروتی خاقانی تەتـاری و لـوت بەرزی و ستەمی هۆلاکـاو سـوپا کاوڵکـارەکەی لەسـەر دەسـتی کـۆیلەیەکی ئـازادکراو کۆتـایی پێـدێ، مەغۆل لە مەنغۆلیاوە هاتن تاوەکو گەیشـتنە غـەززە، هەر چی مەمـلەکەت و شـاری ڕێگایـان بـوو کاوڵیـان کـرد، لەهەر هەمـوو ئەو مەملەکەتـانە موسـڵمانان لەبەرگـری دابـوون، هەرکەدەیـان بیسـت مەغـۆل بەڕێـوەیە بـۆ هێرشـکردنە سـەریان ڕوویـان دەکـردە قەڵاکانیـان، لەنـاو قەڵاکـانەوە دەکەوتـنە

---

(١) (عين جالوت) دێیەکە دەکەوێتە نێوان (بەيسان) و (نابلس) لە فەلەستين.

بەرگری لە خۆیان و دەرەنجامیش دەشکان، بەڵام (سەیفەدین قوتز) ئەو عەقڵیەتەی گۆڕی و ڕوو بەڕوو بونەوەکەی گواستەوە بۆ دەرەوەی میسر، مەردانە بۆ مەغۆل چویە مەیدان، پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) دەفەرمێ: (الخَيْلُ مَعْقُودٌ فِي نَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ).[(١)]

لەریوایەتی تر (جەریری کوڕی عبدالله)دەفەرمێ: پێغەمبەری خوام بینی (صلی الله علیه وسلم) دەستی بەناوچەوانی ئەسپ دادەهێناو فەرموی: الخَيْلُ مَعْقُودٌ بِنَوَاصِيهَا الخَيْرُ إِلَى يَوْمِ القِيَامَةِ: الأَجْرُ وَالغَنِيمَةُ .[(٢)]واتە: ئەو کاتەی ئەسپ زین دەکرێ بۆ جیهاد پاداشت و غەنیمەی لەناوچەواندایە، ئەو کاتەی ئەسپەکانی خەلیفە کران بە ئاژەڵی زینەو تەنها بۆجوانی ڕادەگیران، ئەو کاتە بوو زیلەتی بەسەر ئەو ئوممەتە داهێنا، بەڵام ئەو کاتەی ئەسپ زینکرا بۆ جیهاد و بەرگری لە خواو خەڵك و خاك ئەوە ئەو کاتەیە کە بەرەکەتی لە ناوچەواندایە، هەر هێزێکی سەربازی ئەگەر دەوری درا و کرا بەنیشان لەلایەن دوژمنانی، ئەوە بێگومان سەرەتای شکەستی ئەو هێزەیە، جەنگی مەغۆلەکان بەخۆ حەشاردان لەنێو قەڵاو و پشت دیوارەکان نەدەکرا، مەغۆلەکانیش چاوەڕوانی ئەوەیان دەکرد، سوڵتان سەیفەدین قوتز، وەکو باقی سوڵتانەکانی تر، یان بچێ زەوی بەردەست و پێی هۆلاکۆ ماچ بکات، یان ئەوەتا خۆی و دەورو بەرەکەی

---

(١) رواه البخاری.

(٢) رواه مسلم .

لەقەڵایەك لەقەڵاكـان خۆیـان حەشـار بـدەن و دوای مـاوەیەك لەگەمـارۆدان بەسەرشـۆڕییەوە تەسـلیم بەمەغۆلەكـان ببـنەوە، هۆلاكـۆ هەر لەسـەرتاوە نامـەیەك بۆ سوڵتان قوتوز دەنێرێ، و بەزمانێكی لەخۆبایی و پڕ لەغـرورەوە بۆی دەنوسێ:

(من ملك الْمُلُوك شرقاً وغرباً القان الْأَعْظَم بِاسْمِك اللَّهُمَّ باسط الأَرْض وَرَافِـع السَّـــمَاء) لەپادشـاى پادشـاكانى خـۆر هەڵات و خۆرئـاوا، خـانی گەورە بەناوی ئەو خوای ڕاخەری زەوی و ڕاگری ئاسمان (يعلم الْملك المظفر قطـز الَّذِي هُوَ من جنس المماليك الَّذين هربوا من سُيُوفنَا إِلَى هَـذَا الإقلـيم يتنعمـون بإنعامه وَيقْتلُونَ من كَانَ بسلطانه بعد ذَلِك. يعلم الْملك المظفر قطز وَسَار أُمَـرَاء دولته وَأهل مَمْلَكَته بالديار المصرية وَمَا حولهَا من الْأَعْمَال) بەمەلیك قوتـوزی ڕادەگەیەنین كە یەكێك بـووە لەو كۆیلانەی لەشمشێری ئێمە ڕای كـردو و هاتۆتە ئەو ئیقلیمە حوكمی ئەو ئیقلیمەی كەوتۆتە دەست (أَنـا نَحـن جنـد الله فِي أرضـه خلقنَـا مـن سـخطه وسـلطنا علـى مـن حـل بِـهِ غَضَـبه) پێتـانی ڕادەگەیەنین كە ئیمە سەربازانی خواین لەسەر زەوی، خوا ئێمەی لەتوڕەیی خـۆی دروسـتكردووەو زاڵـی كـردوین بەسـەر ئەوەی كە غەززەبـی لێـدەگرێ. (فلكم بِجَمِيع الْبِلَاد مُعْتَبر وَعَن عزمنا مزدجر فـاتعظوا بغيركـم وَأَسْـلمُوا إِلَيْنَـا أَمركُم قبل أَن ينْكَشف الغطـاء فتنـدموا وَيعـود عَلَـيْكُم الْخَطَـأ). ئەو وڵاتـانە بابۆتـان ببیـتە پەنـد، پەنـد لە خەڵكـی تـر وەرگـرن و تەسـلیمی ئـێمە بـبن بەرلەوەی ئەو هەلەتان لەدەست دەرچێ و پەشیمان ببـنەوە هەڵەكەتـان ببێـتە

بار بەسەرتان (فَنحْن مَا نرحم مـن بَكَـى وَلَـا نـرق لمـن شـكى) ئێمە ڕوحم بەو کەسە ناکەین کەدەگرییێ و دڵمان نەرم نابێ بۆ ئەوکەسەی سکاڵا بکا (وَقد سَمِعْتُمْ أننا قد فتحنـا الْبِلَـاد وَطَهِّرْنَـا الأَرْض مـن الْفسـاد) ئەوەتـان بیست کە ئێمە وڵاتێکی زۆرمان ئازاد کردوە لەگەندەڵێ خاوێنمان کردۆتەوە (وقتلنـا مُعظم الْبِلَاد فَعَلَيْكُم بالهرب وعلينا بِالطَّلَبِ) زۆربەی ئەو خەڵکەشمان کوشت دەبێ ئێوە لەبەر مـان ڕابکەن و ئیمەش سەرمان لەدوونـاون تـا دەتـانگرین. (فَأَي أَرض تأويكم وَأي طَرِيق تنجيكم وَأي بِلَـاد تحميكم) چ زەوێك باوەشتان بۆ دەکاتەوەو چ ڕێگـایەك ڕزگارتـان دەکـا و چ وڵاتێك دەتانپـارێزێ. (فَمَـا من سُيُوفنَا خلاص وَلَا من مهابتنا منـاص) ئەستەمە لە شمشێرو هەیبەتمان ڕزگارتـان ببێ. (فخيولنا سوابق وسهامنا خـوارق وسـيوفنا صـواعق) ئەسپەکانمان توندو تـۆڵ و پێشـەڕون تیرەکانمـان دەپێکن و شمشێرەکانیشـمان بروسکە دەکەن (وقلوبنا كالجبال وعددنا كالرمال) دڵەکانمان وەك شاخ قایمە و ژمارەشمان بەقەد دانەی زیخە. (فالحصون لدينا لَا تمنـع والعسـاكر لقتالنـا لَـا تَنْفَـع ودعـائكم علينـا لَـا يسـمع) قەڵاکـان ناتـان پـارێزن و سوپاکان شەڕی ئیمەیان پێناکرێ و دوعـاکانتان لەسەر ئێمە قبوڵ نابێ (فَإِنَّكُم أكلْـتُم الْحَـرَام وَلَا تعفون عِنْد الْكَلَام وخنتم العهود والأيمان وَفَشَا فِيكُم العقوق والعصيان) ئێوە حەڕامتـان خـوارد و زمـان پـاك نینـە و وەفاتـان بـۆ پەیمـان و سـوێند نیـیە سەرپێچی لەنێوانتان بڵاو بـۆتەوە. (فأبشروا بالمذلة والهوان فاليوم تُجْزونَ عَذَاب الْهون بِمَا كُنْتُم تستكبرون فِي الأَرْض بِغَيْـر الْحق وَبِمَـا كُنْـتُم تفسـقون وَسَـيعْلَمُ

الَّذين ظلمُوا أَي مُنْقَلب يَنْقَلِبُون) سەرشۆڕی و زیلەت مژدەتان بێ ئەوە ئەو ڕۆژەیە سزای سەر شۆڕیتان پێدەگا و ستەمکاران دەزانن چ ڕۆژێك چاوەڕوانیان دەکا (فَمن طلب حربنا نَدم وَمن قصد أماننا سلم) ئەوەی چاوی لەشەڕی ئێمە بێ پەشیمان دەبێتەوەو ئەوەی مەبەستی ئاشتی و ئەمانی ئێمە بێ سەلامەت دەبێ. (فَإِن أَنْتُم لشرطنا ولأمرنا أطعتم فلكم مَا لنا وَعَلَيْكُم مَا علينا) ئەگەر بێت و گوێڕایەڵی فەرمان و پابەندی مەرجەکانمان بن، ئێمە چیمان بۆ هەیە ئەوەش بۆ ئێوە هەیە، ئێمە چیمان لەسەرە ئەوەش لەسەر ئێوەیە (وَإِن خالفتم هلكتم فَلَا تهلكوا نفوسكم بِأَيْدِيكُمْ) ئەگەر بۆچونی جیاوازی ئیمەتان هەبێ لەناو دەچن و خۆتان بەدەستی خۆتان دووچاری هەلاکەت مەکەن. (فقد حذر من أنذر) ئەوە هۆشیاری و ئاگادارییە (وَقد ثَبت عنْدكُمْ أَن نَحن الْكَفَرَة وَقد ثَبت عندنَا أَنكُمْ الفجرة) ئێوە بۆتان ڕونبۆتەوە کەئێمە کافرین و ئێمەش بۆمان ڕوون بۆتەوە کە ئێوە گەندەڵکارن (وَقد سلطنا عَلَيْكُم من لَهُ الْأُمُور الْمقدرَة وَالْأَحْكَام الْمُدبرَة) ئەوەی هەموو فەرمان و تەدبیرەکانی بەدەستە ئەو ئێمەی بەسەر ئێوە زاڵ کردوە کەمەبەستی خوایە. (فكثيركم عندنَا قَلِيل وعزيزكم عندنَا ذليل وَبِغير الأهنة لملوككم عندنَا سَبِيل) زۆرتان لای ئێمە کەمەو سەربەرزتان لای ئێمە سەرشۆڕە. (فَلَا تطلوا الْخطاب وأسرعوا برد الْجَواب قبل أَن تضرم الْحَرْب نارها وترمى نحوكم شرَارهَا فَلَا تَجِدُونَ منا جاهاً وَلَا عزا وَلَا كَافِيا وَلَا حرْزا) پەلە بکەن و زوو وەڵامەمان بدەنەوە بەرلەوەی ئاگری جەنگ هەڵبگیرسێ

ئەو کات هیچ کەس پەناتان ناداو هیچ شوێنێك نابێ ڕووی تێبکەن. (وتدهون منا بأعظم داهية وتصبح بِلَادكُمْ مِنْكُم خَالِيَة) باگەورەترین کارەسات لەسەر دەستی ئێمەوە پێتان نەگا و نیشتمانتان لە ئێوە چۆڵ دەبێ. (فقد أنصفنا إِذْ راسلناكم وأيقظناكم إِذْ حذرناكم فَمَا بَقِي لنا مقصد سواكم) خاوەن ئینصافین کە نامەتان بۆ دەنێرین و بەخەبەرمان هێنان هوشیاریتان پێدەدەین. (وَالسَّلَام علينا وَعَلَيْكُم وعَلى من أطَاع الْهدى وخشي عواقب الردى وأطاع الْملك الْأَعْلَى) سلاویش لە ئێمەو لەئێوە و لەوانەی کە شوێن کەوتەی هیدایەتن و ترسی دەرەنجامی کارەکانیان هەیەو گوێڕایەڵی مەلیکی گەورە دەبن. (أَلا قل لمصرها هلاون قد أَتَى بِحَدّ سيوف تنتضى وبواتر يصير أعز الْقَوْم منا أَذِلَّة وَيلْحق أطفالاً لَهُم بالأكابر) بڵێن بەخەڵکی میسرئەوە هۆلاکۆ بەڕێوەیە شمشێرەکان هەڵکێشراون و گەورەو سەرداری ئەو قەومە ریسواو سەرشۆڕ دەکەین مناڵەکان بەگەورەکان دەگەیەنین.[1] ئەونامەیەی هۆلاکۆ دیارە لوت بەرزی و هەڕەشەی کوشتنی ژن و مناڵ و پیرو پەك کەوتەی لێدەچۆڕێتەوە، نامەیەکە تەعبیر لە ڕقی ئەهلی کوفرە بەرامبەر بە موسڵمانان.

بەر لەو نامەیەی هۆلاکۆ، سەیفەدین قوتوز ڕەحمەتی خوای لێبێ، چەند گۆڕانکاریەکی کرد لەسەرکردە سەربازییەکان و وەزیرەکان، ئەوەی لێی بەگومان بوو لایدا، ئینجا فەتوایەکەی ئیمام (عیزی کوڕی

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك (١/ ٥١٤).

عەبدولسەلام)ی جێبەجێ کرد، هەر چی ئاڵتونی ماڵی خۆی هەبوو سەرەتاخۆی هێنای و ئینجا داوای لەسەرکردە سەربازییەکان کرد کەئەوانیش ئاڵتون و خشڵی ماڵەوە بێنن، ئینجا داوای لەوەزیرو پیاوانی دەوڵەت و دەوڵەمەندەکان کرد کەیارمەتی ئەو سوپایە بدەن کە دەکەوێتەڕێ بۆ جیهادی مەغۆل کە ئەگەر بێت و بەریان نەگیرێ، میسر کاوڵدەکەن پیاوەکان دەکوژن و ئافرەتەکانیش بەکەنیزە دەبەن.

سوڵتان سەیفەددین قوتوز دوای گەیشتنی نامەکە دەستەی ڕاوێژکاری کۆدەکاتەوەو پێیان دەڵێ: ئەو نامەیەی مەغۆل ئێمە خستۆتە بەردەم سێ ئەگەر:

یەکەم: پیکهاتن و تەسلیم بوون.

دووەم: چۆڵکردنی میسر و چون بۆ مەغریب.

سێیەم: ڕوو بەڕوو بونەوەو جیهاد کردن.

هەموو کۆڕادەبن لەسەر ئەوەی هیچ متمانەیەك بەبەڵێنەکانی مەغۆل ناکرێ، بۆیە دەبێ بیر لەوە نەکەینەوە تەسلیم بەمەغۆل بین.

دەربارەی کۆچ کردن و جێهێشتنی میسریش ئەوە ئەگەرێکی زۆر دوورە لەبەر ئەوەی شتی وا نەبووە وڵاتێك چۆڵبکرێ.

تەنها ئەگەری سێیەم دەمێنێ ئەویش بڕیاری جیهاد و ڕوو بەڕوو بوونەوەی مەغۆلە.

بـۆیە (زاهیـر بێبـرس) پێشـنیار دەکـا وەفـدەکەی مەغـۆل بکـوژرێن، سـەیفەدین قـوتز بـۆ ئەوەی خەڵـکەکە بخـاتە واقیعـی جیهـاد کـردن پێشـنیارەکەی (زاهیـر بێبـرس) قبـوڵ دەکـات و دەم دەسـت لەگەردەنـی وەفدەکەی مەغـۆل دەدات و تەنها منالێکیـان لەگەڵ دابوو ئەو نـاکوژێ و لای خۆی دەی هێڵێتەوە، سەری وەفدەکەی مەغـۆل لەدەرگاکـانی قـاهیرە هەڵدەواسـێ، بەکوشـتنی ئەو وەفـدە هـیچ ڕیگـایەکی نەهێشـت بـۆ گفتوگـۆکردن و ئەگەری شـەڕ بـوو بە تـاکە ئەگەر لەبەر دەم تەواوی میسرییەکان.

(سـەیفەدین قـوتز) ڕەحمەتـی خـوای لێبـێ ئەوەنـدە بەجەرگ و ورە بەرز بوو گوتی: ئەگەر هیچ کەس لەگەڵم نەبێ ئەوا بەتەنها دەچم بۆ جیهادی مەغۆل.

ئەوەبـوو سـوپایەکی گەورە پێك هـات، زانایـان فەتـوای نەفیـری عامیـان داو گوتیـان جیهـاد فەرزی عەیـنە و ئەوەی بـۆی دەکـرێ بـا خـۆی بگەیەنێـتە ئەو سـوپایە، سـەیفەدین قوتـوز سـودێکی زۆری لە ئەزمـونی ڕووداوەکـانی جیهـانی ئیسـلامی وەرگرتبـوو بۆیە بەڕێ دەکەوێ و دەچێتە دەرەوەی میسـڕ بۆئەوەی ڕێـی لە هێزەکـانی مەغـۆل بگـرێ و پـێ نەنێـنە خاکی میسڕ.

قوتـوز سـەرەتا دەچێـتە فەلەسـتین و لەوێ پەیمانێـك لەگەڵ ئەو هێـزە سـەلیبیانە واژۆ دەکـا، کەنەکەن خیـانەت لە موسـڵمانەکان بـکەن و لەپشـتڕا

پەیوەندی بەمەغۆل بکەن، ئەو سەلیبیانەی لە فەڵەستین بونیان هەبوو بەڵێنیان پێیدا کە بەهیچ جۆرێك خیانەت لەموسڵمانەکان ناکەن، هێزی موسڵمانەکان بەسەلامەتی گەیشتە ناوچەی (عەین جالوت) و سەنگەریان لە مەغۆل گرت.

پێشەنگی سوپا گەورەکەی موسڵمانان، کەتیبەیەکی زۆر ئازابوو بەسەرکردایەتی(زاهیر بێبرس) سەرەتا لەناوچەی(غەززە) ئەو کەتیبەیە، ڕوو بەڕووی پێشەنگی سوپاکەی مەغۆل دەبێتەوەو کەبەسەرکردایەتی کەسێك بوو بەناوی (بەیدرا) ئەو پیاوە وەکو (کەتبغا نوین) سەرکردەیەکی ئازابوو زۆر لەهۆلاکۆ نزیك بوون، بەفەزڵی خوای گەورە پێشەنگی سوپاکەی مەغۆل دەشکێن و (بەیدرا) دەکوژرێ و (بێبرس) بەو خەڵکە ڕادەگەیەنێ ئەوە ئەفسانەیە کەدەگوترێ مەغۆل ناشکێن بەڵکو، ئەوان بەقەد ئێوە ئازاو بەجەرگ نین، بەڵام پێویستە شمشێرەکانتان هەڵکێشن و بیر لە ڕەزامەندی خوای گەورە بکەنەوە.

## (صارم ئۆزبەك) ڕووداوێکی سەیر دەگێڕیتەوە کەلەمەجلیسی (هۆلاکۆ) بینی

لەو کاتەی سوپای سەیفەددین قوتز بەڕێوە بوو بۆ (عین جالوت) چەند زانیارییەکی یەکجار گرنگی بۆ هات لەلایە کەسێك بەناوی(صارم ئۆزبەك) ئەو پیاوە خزمەتکاری (مەلیك ئەشرەف)ی مەلیکی (حیمص)بووە.

دەڵێ: خۆم لەئەشکەوتێك حەشاردابوو، ئەو کاتەی سوپای مەغـۆل هـاتن نەیـانزانی مـن لەوێم تـاوەکو ڕۆیشـتن، دوای ئەوەی ئەوان ڕۆیشـتن هـاتمە دەرەوە کەبینـیم یەکێـك لەسـەربازەکانی مەغـۆل کـوژراوە، منـیش جلـی کـوژراوەکەم لەبەر کـردو، نزیـك بـوومەوە لە ڕەشـماڵە گەورەکەی هۆلاکـۆ، (صارم ئۆزبەك) دەڵێ:

مەغۆلەکان عادەتێکیـان هەبـوو، لەنزیـك ڕەشماڵی هۆلاکۆ صندوقێکیان بەدارێك هەڵواسی بـوو، ئەوەی سکاڵای هەبـوایە نـاوی لەپـارچە کاغەزێك دەنوسـی و دەیخسـتە نـاو صـندوقەکەو هەفـتەی ڕۆژەك صـندوقەکە لەبەردەمی هۆلاکۆ دەکرایەوە، دەڵێ منیش ناوی خۆم نوسی، نوسیم (صارم ئـۆزبەك) خزمەتکـاری مەلیـك ئەشـرەف خـاوەنی حەلەب، ناوەکەیـان خوێنـدمەوەو چـوم چاوم کەوت بەهۆلاکـۆ، بینـیم کـابرایەکی کـورتە بـاڵای دەنـگ گەورە بـوو، چاوەکـانی زۆر لەڕوو بـوون، لوتیشـی زۆر بچـوك بـوو، دەم و چاوی خڕ و گەورەبوو، هەیبەتێکی زۆری هەبـوو دەوروبەرەکەی زۆر بەحـورمەت لەخزمەتـی دانیشـتبوون (صـارم ئۆزبـك) لەو کـاترا پەیوەنـدی لەگەڵ (هۆلاکـۆ) پەیـدا دەکـا، یەکێـك لەو ڕووداوانەی (ئـۆزبەك) دەیگێـڕێتەوە دەڵـێ: جارێکیـان لەلای هۆلاکـۆ بـووم خەڵکێکـی زۆری لەخزمەت بوو، کابرایەکی مەغۆل هاتە ژوورەوە، سەری کەسێکی بەدەستەوە بوو، سەرەکەی هەڵدایە بەر دەستوپێی هۆلاکۆ، بەزمـانی مەغـۆلی قسـەی کرد و دواتر سەرەکەی هەڵگرتەوەو مەجلیسەکەی بەجێهێشت.

(صارم) دەڵێ زۆرم پێ سەیر بوو، پرسیارم کرد ئەوە چی بوو، یەکێك لەوانەی لەوێ بوو زمانی مەغۆلی دەزانی پێی گوتم، ئەوە باوکێك بوو سەری کوڕەکەی خۆی لێکردۆتەوە، لەبەر ئەوەی خۆی سەرکردەیەکی سەربازی بووە، خاڵێك لەخاڵەکانی سەربازی لەئەستۆی ئەوبوە، ئەویش ئیشێکی زەروری دێتە پێش و داوا لەکوڕەکەی دەکا، ئاگاداری ئەو خاڵە بیت، لەو کاتە کوڕەکەی غافڵ دەبێ و موسڵمانان هێرش دەکەنە سەر خاڵەکە، دیارە چەند مەغۆلەك دەکوژرێن بۆیە کە باوکەکە دەگەڕێتەوە، لەگەردەنی کوڕەکەی دەداو سەری کوڕەکەی بۆ هۆلاکۆ دەهێنێ بۆئەوە هۆلاکۆ لێی توڕە نەبێ.

(صارم ئۆزبەك) دەڵێ کەئەوەم بینی گوتم: والله مەغۆلەکان تەواوی شام دەگرن.[1] (صارم ئۆزبەك) لە زۆربەی شەڕەکانی شام لەگەڵ سوپاکەی مەغۆل بوو، بەڵام دڵی هەر لەلای موسڵمانەکان بوو، بۆیە چەند زانیارییەکی یەکجار گرنگی دا موسڵمانان و پێی گوتن: سوپاکەی مەغۆل زۆر بەهێز نییە، لەبەر ئەوەی هۆلاکۆ بەشێکی زۆری ئەو سوپایەی لەگەڵ خۆی بردۆتەوە، واتە: ئەو کاتەی (هۆلاکۆ) هەواڵی مردنی براکەی پێدەگا، خۆی شام جێدەهێڵێ و دەگەڕێتەوە ئێران (کتبغا) نەوین دەکا بە جێگری خۆی لەشام. هەروەها پێی گوتن لای ڕاستی سوپاکەی تەتار زۆر بەهێزترە لەلای چەپی بۆیە ئێوە هەوڵبدەن لای چەپی

(١) تاريخ مجموع النوادر مما جرى للأوائل والأواخر، لاپەڕە ١٧١.

سـوپاكەتان بەهێـز بـكەن كە دەكەوێـتە لای ڕاسـتی سـوپاكەی تەتـار، لەهەمـوش گرنگتـر ئەوە بـوو كەپێـی ڕاگەیانـدن (ئەشـەڕفی ئەییـوبی) لەگەڵ خۆی كە مەبەست (صارم ئۆزبەك) ئێمە لەگەڵ سوپای تەتار دەبـین، بەڵام كەشـەڕ دەسـتی پێكـرد ئـێمە لەبەرامبەرتـان ڕادەكەیـن و مەیـدانەكەتان بـۆ چـۆڵ دەكەیـن.[١] بێگومـان ئەو زانیاریـانەی ئەو پیـاوە خزمەتێكی یەكجار گەورە بوو بەسوپاكەی سەیفەدین قوتوز، لەهەمان كاتدا سـەیفەددین بەحەزەرێكـی یەكجـار زۆرەوە ئەو زانیاریـانەی وەرگـرت، لەبەر ئەوەی دەیزانـی مەغۆلەكـان زۆر جـار ئەو جـۆرە فێڵەیـان بەكـار هێنـاوە ئەڵقەلەگوێكانی مەغۆلیش سودیان لەو جۆرە شانۆگەرییە بینیوە.

## (وا اسلاماه) هاوار بۆ ئەو ئیسلامە

سـوپای موسـڵمانان چـاك شـارەزای نـاوچەكە بـوون، زوو گەیشـتنە دۆڵایەكەو (سەیفەدین قوتز) سوپاكەی دەكاتە دوو بەش، بەشێكیان لەگەڵ (زاهیر بێبـرس) وایـان نیشـاندا هەمـوو سـوپای میسـڕییەكان هەر ئەوەندەیە، بەشەكەی تر لەپشت گردوو تەپۆڵكەكـان خۆیـان حەشـاردا، سـوپای مەغـۆل بەسـەركردایەتی (كتبغـا نـوین) بـوو زاوای هۆلاكـۆ، چاویـان بە سـوپای (زاهیر بێبرس)كەوت وایان زانـی هەرئەوەنـدە سـوپای میسـڕییەكانەو كەوتـنە تەڵەكەوە.

---

(١) كنز الدرر وجامع الغرر، بەرگی ٨ لاپەڕە ٥٧.

دوای ڕووبەڕوو بونەوەی هەردوو سوپا، میسرییەکان و وایان نیشان دا کەشکاون و پاشەکشەیان کرد، مەغۆلەکان سەریان لەدوو سوپاکەی (بێبرس)نا تا بەتەواوی کەوتنە بۆسەکە، ئینجا سوپاکەی (بێبرس) لێیان گەڕانەوەو، لەپشت گردو تەپۆڵکەکانیش بەشەکەی تری سوپای موسڵمانان بەدەرکەوتن و مەغۆلەکانیان خستە نێوان هەردوو بەشی سوپاکە و مەغۆلەکان کەوتنە نێو ئاگری تۆڵەو ئاسنی توڕەیی ئیمان.

ئا لەو کاتە شەڕێکی یەکجار گەورە ڕوویدا، سەرەتا لای چەپی سوپای موسڵمانان خراپ شکا، سەیفەدین قوتز کە ئەوەی بینی خۆی گەیاندە بەشە شکاوەکەی سوپاکەو هاواری کرد (وا اسلاماه) لەو کاتە ئەسپەکەی سوڵتان (قوتز) تیرێکی بەردەکەوێ و سوڵتان بەسەری کۆتی و شمشێری بەدەست وە مەیدان لەمەغۆلەکان دەگرێ.

مەغۆلەکان هێرشیان کردە سەری و دەیانزانی بەکوشتنی ئەو ئەنجامی جەنگەکە دەگۆڕدرێ، بەڵام سەیفەدین قوتز زۆر شێرانە هاتبوە مەیدان لەهەر بەشێکی سوپای مەغۆلی بدایە ڕایدەماڵی، ئالەو کاتە دەورو بەرەکەی (سەیفەدین قوتز) ئەسپێکی دەگەیەننێ بۆئەوەی سواری ئەسپەکەبێ نەبادا گیانی لەوە زیاتر بکەوێتە خەتەر، بەڵام سوڵتان سەیفەدین دیسان هاوار دەکا (واسلاماه).

تەپ و تۆزی جەنگ ئاسمانی داپۆشیبوو ئەوەی دەبیسترا تەنها دەنگی شمشێر و نەڕەی سەیفەدین قوتز بوو (وا اسلاماه).

دەنگی سەیفەدین لەگوێی موجاهیدان دەزرینگایەوە، تەواوی سوپاکە لەخواو ئیسلام و ئیمان هیچی تریان نەهاتە بەرچاو بەهاواری ئەو ئیسلامە هاتن ئاخر ئەوە قورئانی پیرۆزە دەفەرمێ:

{وَالْعَادِيَاتِ ضَبْحًا (١) فَالْمُورِيَاتِ قَدْحًا (٢) فَالْمُغِيرَاتِ صُبْحًا (٣) فَأَثَرْنَ بِهِ نَقْعًا (٤) فَوَسَطْنَ بِهِ جَمْعًا (٥)}.[1]

ئەوەئەو ڕۆژەیە ئیمان مەیدانی لەکوفر گرتوەو ڕۆژی ئەوەیە مەغۆلەکان پەیامی شمشێریان پێبگاو باجی کوفر و ستەمەکەیان بدەن، ئەو ڕۆژە ڕۆژی شیفای دڵ بوو خوای گەورە دەفەرمێ: {قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ (١٤)}[2]

زۆری نەبرد مەغۆلەکان شکان، زۆربەی زۆری مەغۆلەکان لەمەیدان کوژران، (کەتبغانەوین)ی سەرکردەی مەغۆل بەدەستی (جمال الدین آقوش الشمسي) دەکوژرێ، هەندێکیش ڕایان کرد بۆ ناوچەیەکی نزیك کە چوننە ناو (قەسەروقامیشەکان) خۆیان حەشار بدەن، سەیفەدین قوتوز فەرمانی کرد شوێنەکە بسوتێنن زۆربەی مەغۆلەکان لەوێیا سوتان و بوون بەغەڵوز، ئەو مەغۆلانەی کەڕایان کرد لەشوێنێکی نزیك گۆڕەپانی جەنگەکە بەخۆ

---

(١) العادیات: ١ – ٥.

(٢) التوبة: ١٤.

کەوتــنەوە، بەڵام ئەو جــارەی کەتیــبەکەی (زاهیــر بێبــرس) زوو گەیشــتنە سەریان و لەوێ دیسان کەوتنە بەر دەمی شمشێر و نوکی ڕم و کەوتـنە ژێر پێی ئەسپی موجاهیدان، مەغۆلەکان بۆ جاری دووەم ڕایانکرد، بەڵام لەبەر ئەوەی شـارەزای نـاوچەکە نەبـوون کەوتـنە ئەو دێهـات و دۆڵانە، خەڵکـی ئـاوارەی شام کەزانیـان مەغۆلەکـان شکاون ئیتر ئەوەی لەشـەڕ نەکوژرابـوو لەو ڕێگـایە کـوژران بـۆیە دەتـوانین بە (عـین جالوت)بڵێن (مەغـۆل قـران) زۆر بەکەمــی لە ســوپاکەی مەغــۆل ڕزگاریــان بــوو، لەهەمــوش گرنگتــر خودی سەرکردە گەورەکەی مەغۆل کوژرا (کەتبغانەوین) ئەو پیاوەی زۆر خۆشەویست بـو لای هۆلاکۆ، بۆیە هۆلاکـۆ کە هەواڵـی شـکانی سـوپای مەغــۆلی پیــدەگا دەڵــێ: هەمــوی بەلایەك و کوشــتنی (کەتبغــانەوین) بەلایەك، خەمێکی زۆر گەورەی پێدەخوات.

هەواڵــی ســەرکەوتنی موســڵمانان و شکەســتی مەغــۆل دەگــاتە شــام، دیمەشق بەڕوی مەغۆلەکان ڕادەپەڕێ و ئەوەی مەغـۆل بوو لەوێ گیـران و کــوژران ٢٧ مــانگی ڕەمەزان واتە دوای دوو ڕۆژ لە جەنگــی عــین جـالوت لەدیمەشـق و حەلەب دەورو بەری بـوە (ڕاوە مەغـۆل) مەغـۆلەکی یەکجار زۆر لەو شوێنانە کوژران و موسلمانێکی زۆر کەدیلی مەغۆلەکان بـوون ئـازادا کران مەغۆلەکـان شـامیان بەجێهێشت و بەرەو عێـراق و جەزیـرە ڕایـان کـرد زۆربەی مەغۆلەکـان خێزانەکـانی خۆیـان کوشـت نەبـادا بـکەونە دەست موسڵمانان.

بەداخەوە ئەو کاتەی مەغۆلەکان شامیان داگیر کرد نەسرانییەکان ستەمێکی زۆریان لەموسڵمانان کردو زۆر لە مزگەوتەکانیان ڕوخاند لەشوێنەکان کە چاویان بەموسڵمانان بکەوتابا (عەرەق، ریژیان) دەکردن و زۆریان لەموسڵمانەکان دەکرد کەلەبەر (خاچ، سەلیب)ەکان هەڵسنەوە، وتاریان دەدا کە ئاینی ئێمە حەقە و ئاینی درۆ کەئیسلامە ئەوە کۆتایی پێهات.[1] بۆیەلەگەڵ شکانی مەغۆل موسڵمانەکان هێرشیان کردە سەر نەسرانییەکان تۆڵەی ئەو خیانەتە گەورەیەیان لێسەندنەوە، یەکێکیش لەو خۆفرۆشانە کەسێك بوو بەناوی (مەلیك سەعید کوڕی مەلیك عەزیزی کوڕی مەلیك عادیل) خاوەنی (بانیاس) کاتی خۆ ئەو کەسە بەفەرمانی مەلیك صالح بەندکرابوو، ئەو کاتەی مەغۆل شامیان گرت ئەو پیاوەیان ئازاد کردو بوو بەچاوساغی مەغۆل، لەگەڵ کەتبغا نەوین شان بەشانی مەغۆل شەڕی موسڵمانەکان دەکا، بۆیە ئەو کاتەی دەستگیر کرا، سوڵتان سەیفەدین قوتز فەرمانی دا لەگەردەنی بدەن و لاشەی تێکەڵ بەلاشە بۆگەنەکانی مەغۆل بوو.[2]

دوای ئەو سەرکەوتنە گەورەیە سوڵتان (سەیفەدین قوتز) دەچێتە دیمەشق وەکو پاڵەوانێکی گەورە پیشوازی لێدەکرێ، گەورە و بچوکی شارەکە هاتنە دەرەوە بۆ پێشوازی کردن لەو پیاوەی کە مەغۆلی شکاند، سەیفەدین قوتوز

(١) المذيل على الروضتين، بەرگی ٢ لاپەڕە ١٥٢.
(٢) كنز الدرر وجامع الغرر، بەرگی ٨ لاپەڕە ٥١.

ئـارامی گێـڕایەوە بـۆ شـام (نجـم الـدین ابـو بکـر کـوڕی صـەدرەدین)دەکا بەگەورەقـازی و (علـم الـدین سـنجر)ی حەلەبـی دەکـاتە نـوێنەری خـۆی لەدیمەشـق و سـەرکردە (أبـو الهیجـاء کـوڕی عیسـی کـوڕی خشـترین) و (الأمیـر مجیـر الـدین الأزکشـی الکردی)دەکـاتە ڕاوێژکـارو بەهاوبەشـی نێوانیان زۆربەی کارەکانی وڵاتی شامیان ڕاپەڕاند، ئەو پیاوە (مجیرالدین) بەکۆڕای تەواوی سەرچاوە مێژووییەکان یەکێك بووە لەپاڵەوانە گەورەکانی ڕۆژی(عـین جـالوت) ڕۆڵێکـی زۆر سـەرەکی دەبینـێ لەو جەنـگە و ئەوشکەستەی بەسەر مەغۆلەکان هات، دواتر لەدیمەش دەمێنێتەوە تاساڵی (٦٦١)لەدیمەشـق وەفـات دەکـا ڕەحمەتـی خـوای گەورەی لێبـێ. [1]ئینجا بڕیـار دەردێ هێرشـەکان بـۆ سـەر نەسـڕانییەکان ڕابگیـرێ، بەڵـێ ڕاسـتە نەسڕانییەکان هەڵوێستێکی زۆر خراپیان نواند بەرامبەر بەموسڵمانان، بەڵام سەرەڕای ئەوە (سوڵتان قوتز) لێیان خۆش بوو و ئارامی گێڕایەوە بۆ شام.

سوڵتان (سەیفەددین قوتز) فەرمان بە سەرکردە (زاهیر بیبرس) دەکات، کە بچن بەدوای هێزەشکاوەکەی مەغۆل و لەماوەیەکی کەم تەواوی شام، پـاککرایەوە لەمەغۆلەکـان، ئەو مەغـۆلانەی هـاتبونە شـام زۆربەی هەرەزۆریـان کـوژران، تـۆڵەیەکی گەورە لەمەغـۆل کـرایەوە، کوشـتنی ئەو هەمـوو مەغـۆلە ئۆخەو وشیفای دڵی تەواوی موسڵمانان بوو موسڵمانان زۆر دەمێـك بـوو تـامی سـەرکەوتنیان نەچێشـت بـوو دوای کەوتنـی یەك

---

(١) ذیل مرآة الزمان (٢/ ٢٢٢). البدایة والنهایة (١٣/ ٢٨٠). نهایة الأرب في فنون الأدب (٣٠/ ٩٠).

بەیەکی مەمـلەکەتە ئیسـلامییەکان ئەوە یەکەم جارە بەو شێوەیە مەغـۆل دەشـكێن و دەكەونە بەر شمشـێری موسـڵمانان، ئەگەر زینـدوو كـردنەوەی بۆنەكان ئاسایی بوایە دەبوایە دوای شەڕی (بەدر) ڕۆژی جەنگی (عـین جالوت) یـادبكرێتەوە لەبەر ئەوەی پێچێكی هەنـدە گەورەیە لەمێژووی ئەو ئـوممەتە، دەرچـونە لەزیللەت بەرەو جیهـاد و سـەربەرزی. نەفەسی ئومێدە دوای مـاوەیەكی زۆر لە بێ ئومێدی. ئینجا سـوڵتان (سـەیفەددی قـوتز) ڕایگەیانـد كەمیسـرو شـام یەك دەوڵەتـن و لەژێـر فەرمـانی یەك سـەركردە بەرێوە دەچێ، لەتەواوی مزگەوتەكـانی میسـرو شـام و فەلەسـتین دوعـای خێر بۆ سوڵتان (سەیفەددین قوتوز) دەكرا.

داگیـر كردنـی مەغـۆل بۆشـام حەوت مانـگ و نـزیكەی دە ڕۆژی خایەند.[(١)]

## گرنگی سەركەوتنەكەی (عەین جالوت)

دوای كەوتنی بەغداو دیمەشق و حەلەب، لە جیهانی ئیسلامی بەداخەوە هەسـتێك دروسـت ببـو كە مەغـۆل هێـزێكە شـكانی ئەسـتەمە، خۆئەگەر مەغۆلەكان بەرەنگاری بكرابانەوە، ئاڕاستەی ڕووداوەكـان دەگۆڕدرا، بەڵام هەر بەبیسـتنی نـاوی (مەغـۆل) جەسـتەكان دەكەوتـنە لەرزیـن و شـوێنەكان چۆڵ دەكران.

---

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك، بەرگی١ لاپەڕە ٤٣٣.

زۆربەی پادشـاو سـوڵتانەکان پەیوەنـدیان بە هۆلاکـۆ دەکـرد و ملکەچـی دەبـوون، هێـزی سـوڵتان و پادشـای ویـلایەتە ئیسـلامییەکان تەنهـا بـۆ سـەرکوتکردنی ئەو خەڵـکەو ناحەزەکـانی خۆیـان بـوو شـتێك نەبـوو بەنـاوی هێزێکـی جیهـادی لەپێنـاو خـوا بـۆ پاراسـتنی ئیسـلام و موسـڵمانان، خـۆ ئەگەر مەغۆلەکـان لە(عـین جالوت) نەشکابان خودی مەککەو مەدینـەش دەکەوتـنـە ژێـر دەسـەڵاتی ئەو هێـزە دڕنـدەیەی کە لەهەمـوو ڕەوشـتێکی مرۆڤ داماڵدرابون.

دەوڵەتـی مەمالیـك دوو سـەروەری زۆر گەورەیـان تۆمـارکرد، یەکیـان شـکاندنی خاچپەرسـتەکان بـوو، ئەوەی تـر شـکاندنی مەغـۆل بـوو، )سـەیفەددین قەتـز(بەو سـەرکەوتنەی لە(عـین جـالوت) بەدەسـتی هێنـا، تەواوی هاوکێشـەکانی گـۆڕی و ڕۆحێکـی جیهـادی سـەرلەنوێ کـردە بەر ئەو ئـوممەتە، ئەو خەڵـکە زانیـان کەبەڵـێ: مەغۆلەکـانیش مـرۆڤن هـیچ هێزێکـی سـیحری بەدەر لەتوانـای مرۆڤیـان پێنیـیە، بەڵکـو ئەوە ئـێمەین خۆشەویستی دونیـاو لەیـادکردنی مـردن، هەم دونیـا هەم قیـامەتی لەدەست داوین.

دووەم: خوای گەورە دەربـاری ئەهلی کیتـاب بەپێغەمـبەری خۆشەویست (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمـێ: {وَلَنْ تَرْضَى عَنْكَ الْيَهُودُ وَلَا النَّصَارَى حَتَّى تَتَّبِعَ مِلَّتَهُمْ}(١) نەجولەکە نە نەسڕانییەکان قەت لەئێوە ڕازی نابن

(١) البقرة: ١٢٠

تاوەکو شوێنی میللەت و دینی ئەوان نەکەون، جوانترین ڕاڤەی ئەو ئایەتە مێژووە کە هەر کاتێك موسڵمانان بونیان کەوتبێتە ژێر هەرشە، ئەو جولەکەو نەسرانیانەی بەسەدان ساڵ لەنێوان موسڵمانان ژیاون لاوازی موسڵمانانیان بەهەلێکی گەورە زانیوەو لەموسڵمانان هەڵگەڕاونەتەوە کەدەستی خۆیان بینیوە مزگەوتیان ڕووخاندوەو گاڵتەیان بە پیرۆزییەکانی ئەو ئیسلامە کردوە، بۆیە ئەو کاتەی نەسرانییەکانی شام زانیان (کەتبغانەوین) بۆتە نەسرانی دڵیان زۆر پێخۆش بوو کەشامی داگیر کرد، بوون بە پاڵپشتێکی زۆر گەورە بۆ مەغۆلەکان مزگەوتەکانیان ڕووخاند و لەگەڕەك و کۆڵانەکان عەرەقیان دەرشاندە سەرموسڵمانان و خاچیان بەرز دەکردەوەو داوایان دەکرد موسڵمانان کرنۆش بۆ خاچ ببەن.

سێیەم: خوای گەورە دەفەرمێ: {وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ (٤٦)}[1] هەر کاتێك موسڵمانان دووبەرەکی کەوتبێتە نێوانیان، بەهۆی ئەو دووبەرەکییە بونەتە پارویەکی ئاسان و لەلایەن دوژمنانیان قوتدراون، بەر لەهاتنی مەغۆل جیهانی ئیسلامی پارچە پارچە بونێکی زۆر گەورەی بەخۆوە بینیبوو، هەر سوڵتان و پادشایەك خەمی تەنها ئەو قەوارەیەی لەبەر بوو کەلەژێر دەسەڵاتی ئەوە، نەوسرەت دان و پشتگیری کردنی یەکتر،

---

(١) الأنفال: ٤٦.

لەفەرهەنگی پادشا و مەلیکە موسڵمانەکان نەمابو، بۆیە سزایەکی ئەوەندە گەورە ڕووی تێکردن، تەڕوو وشکی پێکەوە سوتاند.

سەرکەوتنەکەی (عین جالوت) بەو ئوممەتەی ڕاگەیاند کە گەورەترین هێز لەیەکڕیزی ئێوەدایە ئەو کاتەی موسڵمانان دووبەرەکیان بەلاوەنا و لەبن ئاڵاکەی سوڵتان سەیفەدین قوتز کۆبونەوە خوای گەورە زاڵی کردن بەسەر دڕندەترین هێزی ئەو کات.

چوارەم: جەنگی (عین جالوت) گرنگی ڕۆڵی سەرکردەی دەرخست، زۆرجار میللەت خاوەن وزەو توانایەکی زۆرە، بەڵام سەرکردە دۆڕاوەکان ڕێ بەتواناکان نادەن بۆ ئەوەی بێنە پێشەوە، سەرکردەی سەرکەوتو دەبێ ئازاو چاو نەترس بێ خاون بڕیاری شێرانە بێ، سەرەڕای ئەو هەموو هەڕەشانەی هۆلاکو لە (سەیفەدینی قوتزی) کرد، ئەو سەرکردەیە نەشڵەژاو خۆڕاگر بوو باوەڕی بەتوانای خۆی هەبوو باوەڕی بەتوانای ئوممەتەکەشی هەبوو،

پینجەم: زۆر جار ئەگەر نییەت یەکلایی کراوە بۆ خوای گەورە، خوای گەورە دەرگایەك بەڕوو ئەو ئوممەتە دەکاتەوە، کە دوژمنانی ئەو دینە قەت زەینیان بۆی نەچوە، مەغۆلەکان زۆر بەسوکی سەیری مەمالیکەکانی میسریان دەکرد کەچی شکانیان لەسەر دەستی ئەوان بوو.

شەشەم: سەنتەری بڕیارو چەقی قورسایی لەجیهانی ئیسلامی گوازرایەوە بۆ میسر، ئەو خەڵکەی لەڕووی مەغۆلەکانەوە ڕایانکردبوو میسریان بەقەڵای ئەمان زانی ڕویان لەوێکرد، بۆیە لەساڵی (٦٥٩) ئەو

کـاتە سـولْتانی دەولْەتـی (بەنـی رەسـول) لەیەمەن کەدەچـێ بـۆ حەج، میسرییەکانیش زوتـر هـاتن و ئـاڵای سـولْتانی میسرِیان هەڵکرد لەحەج، دەورو بەرەکەی سـولْتانی یەمەن گوتیـان لەبەرچـی زوتـر ئـاڵای خـۆت هەڵناکەی؟ ئەویش لەوەڵامدا گوتی: چۆن رێ بەخۆم دەدەم ئـاڵای خۆم پـێش ئـاڵای سـولْتانێك بیـێخم کە دوێنـێ تەتارەکانیـان شـکاندوە، ئەوەش گێرانەوەی مەرکەزیەتە بۆ میسر، زۆربەی پادشـاو سولْتانەکان دانیـان بەو سەنتەرە تازە لەدایك بووەی میسرِنا. (١)

---

(١)کتێبی المغول في التاريخ فؤاد عبدالمعطي الصياد، لاپەڕە ٣١٩.

## هۆکارەکانی سەرکەوتنی موسڵمانان لە جەنگی (عین جالوت)

گرنگە لێرە بەکورتی بەچەند خاڵێك باسی هۆكارەكانی سەكەوتنی موسڵمانان بكەین لەجەنگی (عین جالوت).

یەکەم: هۆکاری یەکەم کە گەورەترین و گرنگترین هۆکارە، باوەڕ بەخوای گەورەو پشت بەستانە پێی، موسڵمانان دەبێ ئەوە بزانن کە پشت بەستان بەخوای گەورە یەکێکە لە هۆکارە هەرەگەورەکانی سەرکەوتن، بۆیە (سەیفەدین قوتز) ڕەحمەتی خوای لێبێ، گرنگێکی زۆری بەو خاڵەدا و ڕێزو حورمەتی زانایانی گێڕایەوە، هانی زانایانی دا ڕۆڵی سەرەکی ببینن لەگیرانەوەی ئەو خەڵکە بۆ خودا و نوێکردنەوەی فەریزەتی جیهادو خۆبەکوشتدان لەپێناو خواو سەرخستنی ئاینەکەی.

ئەوەش زۆر بەزەقی لەهەڵوێستەکانی قوتز دەرکەوت ئەو کاتەی لە گۆڕەپانی جەنگ بوو (هاواری کرد: خوایە قوتزی بەندەت سەربخە بەسەر مەغۆلەکان).

دووەم: یەکڕیزی موسڵمانان، یەکێك بوو لەهۆکارە سەرەکییەکان، بۆیە قوتوز ڕەحمەتی خوای لێبێ سەرکەوتو بوو لەوەی هەموو لایەنە ناکۆکەکان کۆبکاتەوە لەژێر یەك ئاڵاو چاو پۆشی کرد لەکێشەکان و توانی هەموو لایەك حاڵی بکات کەهەڕەشەی گەورە مەغۆلەو ئێمە دەبێ بەری ئەو شەپۆلە کوفرییە سەرشێتە بگرین و چیتر بەخۆمانەوە خەریك نەبین.

سێیەم: هۆکارێکی تریش لە هۆکارە سەرەکییەکان، ئەو ئامادەباشییە بوو کە قوتز کردی، بۆ ڕوو بەڕووبونەوەی مەغۆل، قوتز توانی سوپایەکەی پڕ چەك بکاو توانی فەتوا لەگەورە زانایەکی وەکو (عیزی کوڕی عبدالسلام) وەربگرێ لەسەر ئەوەی کە دەبێ خەڵکی بەسەرو ماڵەوە پشتگیری ئەو سوپایە بکەن، کە خوای گەورە کردوی بەئومێدی موسڵمانان، لەو زەمەنە پڕلەمەینەتییەی ئەو کات توانرا سوپایەکی دەوڵەمەندو پڕ چەك بەڕێبکرێ بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی مەغۆلەکان، لەهەمان کاتدا قوتز جگە لە پێداویستی سوپاکەی عەقڵە سەربازییە گەورەکانیشی لەدەوری خۆی کۆکردەوە، توانی پیلانێکی تۆکمە دابڕێژێ بۆ ڕووبەڕوو بونەوەی مەغۆل، توانی دوژمن ڕابکێشێتە ئەو شوێنەی کە خۆی دیاری دەکات، ئەوەش بێگومان پلانێکی زۆر گەورە بوو، لەبەر ئەوەی مەغۆلەکان لەوە ڕاهاتبوون کە موسڵمانان خۆیان لە قەڵایەك حەشار بدەن و ئەوانیش گەمارۆی قەڵایەکە بدەن تانەمانی خۆراك و دواتر خۆیان بەدەست بدەن، بەڵام قوتز چوە دەرەوەی وڵات و مەیدانی لە مەغۆلەکان گرت.

چوارەم: قوتز ڕەحمەتی خوای لێبێ بەکردەوە نیشانی ئەو خەڵکەی دا کە سەرکردە دەبێ چۆن بێ، ئەو گوتی ئەگەر کەسم لەگەڵ نەبێ، خۆم بەتەنها دەچم مەیدان لەمەغۆلەکان دەگرم، ئەو جۆرە عەزیمەتەو ئازایەتیە ئەو کات زۆر کەم بوو، موسڵمانان کەزانیان کەسی یەکەم ئامادەیە قوربانی بەڕۆح وماڵی خۆی بدات بۆ خوای گەورە ئەوانیش هەرهەمووی چونە

ژێر ئالاکەی.

پێنجەم: خاڵێکی تری زۆر گرنگ، قوتز ڕەحمەتی خوای لێبێ یەکێك بوو لەو سەرکردانەی، کە ئامادە نەبوو بەهیچ جۆرێك خۆی بفرۆشێتە مەغۆلەکان، ئەو دەیزانی مەغۆلەکان خاوەن سوپایەکی زۆر گەورەن، بەڵام ئامادە نەبوو بەهیچ جۆرێك ئەڵقە لەگوێیی بۆ مەغۆل بکات، کەبەداخەوە زۆرێك لەسەرکردەو سوڵتانەکانی ئەو کات خۆیان بەمەغۆل فرۆشت و دواتر هەم دینیان هەم دونیاشیان لەدەست دا.

شەشەم: قوتز توانی ئومێد بۆ ئەو خەڵکە بگێرێتەوە توانی بەو خەڵکە بڵێ کە ئەوە کۆتایی ڕیگایەکە نییە، ئێوە نابێ بێ ئومێد بن، بەتایبەت ئەو کات جۆرێك لەبێ ئومێدی باڵی کێشابوو بەسەر تەواوی موسڵمانان، بۆنمونە ئەو کاتەی قوتز فەرموی ئەگەر کەسم لەگەڵ نەبێ من بەتەنها دەچم بۆ جیهاد کردن و مەیدان لە مەغۆل دەگرم، ئەو کات سەرکردەی وا هەبوو پێشنیاری ئەوەی دەکرد، کەبا دانوساندن لەگەڵ مەغۆل بکرێ، بەڵام قوتز هەموو ئەو بێئومێدیانەی کۆتایی پێهێنا بەکوشتنی نوێنەرەکانی مەغۆل.

حەوتەم: گێرانەوەی (شورا) بۆ موسڵمانان، یەکێك لەو خاڵە هەرەگەورانەی قوتز ئەنجامی دا، هەنگاوەکانی بە(پرسو ڕاو مەشورەتی) زانا و سەرکردە سەربازییەکان بوو، سودی لەمەشورەتی گەورە زاناکانی شەریعەت و گەورە سەرکردە سەربازییەکانی زەمەنی خۆی وەرگرت، ئەو

هەوڵی نەدا تاك ڕەویانە بەو كارە گەورەیە هەڵسێ، مەشورەتیش بەداخەوە ئەوكات و ئێستاش زۆر پشت گوێ خراوە، ئەوانە هەندێك بوون لەو خاڵانە كە بوونە هۆی سەركەوتنی موسڵمانان بەسەر مەغۆلەكان.

## هەڵوێستی (هۆلاكۆ) كە بەشكەستی هێزەكەی زانی

هۆلاكۆ بەر لەجەنگی (عـین جالوت) شـامی بەجێهێشت و بەو نیـازەبوو بگەڕێـتەوە (قراقـورم) دوو هۆكـاری سـەرەكی وایكـرد هۆلاكـۆ شـام بەجێبهێڵێ.

یەكەم: مردنـی خـانی گەورەی مەغـۆل (مەنگۆ)كێشـەیەكی گەورەی دوای خـۆی نـایەوە لە(قەراقـورم) بـوو بەململانێـی نیـوان هەردوو بـرای هۆلاكـۆ (قـوبیلای) و (أريـق بوغـا) لەسـەر كورسـی دەسـەڵات، هۆلاكـۆ ویستی زوو بگاتە ئەوێ، بەو ئومێدەی كەئەو بەخانی گەورە هەڵبژێردرێ.

دووەم: خاڵێكی تریش كە ڕۆڵێكی سەرەكی بینی لەگەڕانەوەی هۆلاكۆ، ئەو هێرشانە بوو، كە كوڕە مـامەكەی هۆلاكـو (بەرەكەخـان) دەیكـردە سـەر ئێران و ئەو شوێنانەی لەژێر دەسەڵاتی هۆلاكۆ بوون.

(هۆلاكـۆ)لەعنەتی خـوای لێبـێ، بەوشكەسـتە زۆر تێـدك دەچـێ و خەمێكـی زۆری پێـدەخوا لەبەر ئەوەی ئەوە یەكەم شكەسـت بـوو بەسـەر سـوپای مەغـۆل داهـات، ئینجـا كوشـتنی خودی(كەتبغـانەوین) كاریگەرییەكی زۆری لەسەر هۆلاكۆ دەبێ.

یەکەم هەنگـاوی هۆلاکـۆ، کوشتنی (ناصـرٍ یوسـفی کـوڕی عەزیـزی کـوڕی زاهیـری کـوڕی صـلاح الـدین)بوو، مەلیـك ناصـرٍ کـاتی خـۆی دەکەوێتە بەردەستی هۆلاکۆ، دواتر هۆلاکۆ لێی خۆش دەبێ و دەیکاتەوە سوڵتان بەسەر شام، ئینجا ئەو کاتەی سوڵتان ناصرٍ لەڕێی گەڕانەوە بوو، هۆلاکـۆ هەواڵـی شکەسـتی سـوپاکەی پێگەیشـت، کەتیـبەیەك دەنێـرێ و دەڵـێ: بـڕۆن مەلیـك ناصـرٍ ڕزگـاری نەبـێ و بیکـوژن، مەلیـك ناصـرٍ دەکەوێتە بەردەستی مەغۆلەکان و لەنزیك(سەلماس) خۆی و مەلیك زاهیر غـازی بـراکەی و چەنـد کەسـێکی دیـار کە لەگەڵـی بـوون خۆیـان و کوڕەکانیـان لەگەردەنیـان دەدرێ تەنهـا کـوڕێکی مەلیـك ناصـرٍ بەتەمەن بچـوك بـوو ژنەکەی هۆلاکـۆ شـەفاعەتی بـۆ دەخـوازێ و ڕزگـای دەبـێ لەکوشـتن.[1]. هۆلاکـۆ دەم و دەسـت نـامەیەك دەنێـرێ بـۆ خـانی گەورەی مەغۆل، هەڵبەت هۆلاکۆ ناگاتە قەرەقورم و خانێکی تـر بۆمەغـۆل دیـاری دەکـرێ و پێیڕادەگەیەنـێ کە سـوپای مەغـۆل لە(عـین جـالوت) شـکا و (کەتبغـانوین)ی سـەرکردە کـوژرا، خـانی گەورە بڕیـار دەدا، لە ڕووبـاری (جەیحـۆن، ئاموداریـا) وە تـاوەکوو شـام هەرهەمـوی بەهۆلاکـۆ دەبەخشـێ، دیـارە بەو بڕیـارەی ویسـتویەتی لەکاریگەری ئەو شکەستە لەسـەر هۆلاکۆ کەم کاتەوە، ئەوەش یەکێکە لەو هۆکـارانەی کە هۆلاکـۆ خـۆی ئامـادە دەکـا بـۆ سـاڵی داهـاتوو تـۆڵەی (عـین جـالوت) لەموسـڵمانان بسـەنێتەوە، بەڵام

---

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك (١/ ٥١٨).

چەنـد کێشـەیەکی گەورەی دێـتە پـێش، لەو کێشـانە موسـڵمان بـوونی (بەرەکەخـان) و قەبـیلە ئاڵتونییەکـان (القبیلـة الذهبیـة) ئینجـا ئەوان پشـتگیری (مەمالیکەکـان) دەکەن دژ بەهۆلاکـۆ لەچەنـد ڕووبەڕووبـونەوەیەکیش هێزەکـانی مەغـۆل دەشـکێنن، کە دواتـر باسـی ئەو ڕووداوانە دەکەین (ان شاء الله).

## کوشتنی سوڵتان (سەیفەددین قوتز)ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ

دوای ئەوەی سـوڵتان (سـەیفەددین قـوتز) شـام ڕێـك دەخـاتەوەو ئـارامی دەگێریتەوە وڵاتی موسڵمانان، وڵاتی میسرێش زۆر بەپەرۆشەوە چاوەڕوانی هـاتنەوەی سـوڵتانەکەیان دەکـرد، ئەلێـرە کێشـەیەك دەکەوێـتە نێـوان سـوڵتان (سەیفەددین قوتوز) و (زاهیر بێبرس) کە سـەرکردەیەکی سـەربازی گەورەو ئـازایە، شـوێن دەسـتی لەزۆربەی ڕوو بەڕووبونەوەکـان دیـاربوە لەشـکانی هێزەکانی سەلیبی و مەغۆلەکان ڕۆڵێکی زۆر سەرەکی بینییەوە، دەربارەی ئەو ساردی و کێشەیەی نێوان (قوتوز و بێبرس) مێژوو نوسان باسی چەند هۆکارێکیان کردوە.

یەکەم: بێبـرس داوا دەکـات شـاری (حەلەب)ی پێبـدرێ، سـوڵتان(قوتز) داواکارییەکەی قبوڵ ناکات، کە دەبێتە هۆی ئەوەی دڵی گەرد بگرێ لە (قوتز).

دووەم: سەیفەددین قوتز یەكێك بوو لەوانەی دەستیان هەبوو لەكوشتنی (فارس الدین اقطای)بەفەرمانی (عیزەددین ئەیبەك) ئەقتای كەسێكی نزیك بوو لە(بیبرس) بۆیە (بیبرس) تۆڵەكەی لە(قوتز)كردەوە. [1]

سێیەم: ئەو مەمالیكانە كێشەو ململانێیەكی زۆریان لەنێوان بوو بۆ گەیشتن بەدەسەڵات، (بیبرس) دوای ئەوەی ڕۆڵی سەرەكی دەبینێ لە شكاندنی هێزی(خاچ پەرستەكان) و(مەغۆلەكان) خۆی بەڕەواتر دەبینێ لە(قوتز) و پێی وابوو ئەو دەبێ ببێتە سوڵتانی میسر.

ئەوانە چەند خاڵێكن كەمێژوونوسان باسیان كردوە، بەهەرحاڵ دوورنییە ئەو هۆكارانە هەموی پێكەوە كۆببونەوەو شەیتانیش ڕۆڵی سەرەكی بینی و كوشتنی (قوتوز)ی لای (بیبرس) ڕازاندەوە.

(بیبرس) لەگەڵ چەند سەركردەیەكی تری مەمالیك، بڕیاری كوشتنی (قوتوز) دەدەن لە دێیەك كەپێی دەگوترێ (القصیر) ئێستا ناوی ئەو دێیە (الجعافرة)یە لەپارێزگای شەرقییەی میسری. (بیبرس) لەگەڵ چەند سەركردیەكی تری سەربازی ڕێكدەكەون و لەگەڵ (سەیفەددین قوتز) دەچن بۆ ڕاو، لەڕێگادا دەیكوژن و دواتر دەگەڕێنەوە هەمویان كۆڕاو ویەك دەنگ دەبن لەسەر ئەوەی بەیعەت بە (زاهیر بیبرس) بدەن و دەیكەنە سوڵتانی خۆیان.

---

(١) تاریخ ابن خلدون، لاپەڕە ٢١٦٧ بەرگی سێیەم.

ئەو کاتەی خەڵکی میسرٍ خۆیان ئامادە کردبوو بۆ پێشوازی لە سوڵتان (سەیفەددین قوتز) کەچی ڕاگەیاندرا دوعا بۆ سوڵتانی تازەتان بکەن (زاهیر بیبرس)و لەخوای گەورەش داوا بکەن لەگوناهی (سەیفەددین قوتز) خۆش بێت.

سوڵتان قوتز ڕەحمەتی خوای لێبێ بەشایەدی تەواوی مێژوونوسەکان پیاوێکی خواپەرست و نوێژ خوێن بووە (شەڕاب و مەیی) نەخواردۆتەوە، نزیکەی ساڵێك سوڵتانی میسرٍبوو، هەوڵێکی زۆری دا دادپەروەری بگێریتەوە لەهەموش گرنگتر هەڵوێستە مەردەکانی بوو، کەوەك چەخماخەیەك مەشخەڵی جیهادی لەدڵی ئەو خەڵکە هەڵگیرساند.[1]

بەهاتنی سوڵتان (زاهیر بیبرس) قۆناغێکی تازە دەستپێدەکات لە دەوڵەتی مەمالیکەکان.

---

(١) المذیل علی الروضتین، بەرگی دووەم لاپەڕە ١٥٥ .

## ڕوکنەدین بێبرسی بوندقداری صالحی نەجمی (٦٥٨-٦٧٦) کۆچی

سەرکردە سەربازییەکانی مەمالیك، هەر کاتێك بۆیان بڕەخسابایە سوڵتانیان دەکوشت و خۆیان دەبوون بەسوڵتان، ئەو یاسایە زۆر باو بوو لەنێوانیان، بۆیە دوای ئەوەی بێبرس دەبێتە سوڵتان، دەست بەکاردەبێ لەدوو بوارەوە.

یەکەم: چەند سەرکردەیەك لەخۆی نزیك دەکاتەوەو پلەو پۆستیان پێدەدا، لەهەمان کاتدا چەند سەرکردەیەکیش دەکوژێ، ئەوانەی ترسی لێهەبوون.

دووەم: چەند هەنگاوێکی نا بۆ ڕێکخستنەوەی شەقام و خۆ نزیککردنەوە لەو خەڵکە، وەکو ئەوەی باجی لەسەر ئەو خەڵکە کەم کردەوە، خەڵکێکی زۆریشی ئازادکرد کە زیندانی کرابوون، نامەشی نارد بۆ مەلیکی یەمەن و زۆربەی مەلیك و پادشاکانی شام، پێی ڕاگەیاندن کە کوشتنی (قوتوز) پەیوەندی بەو بارودۆخە ناسکە هەیە کەمیسرِ پێی تێدەپەڕێ و ئێستامیسرِبەرەو ئارامی دەڕوات.

بەڵام دەبێ ئاگاداری ئەوە بین کە دوو هەڕەشە هێشتا بەتەواوی کۆتاییان پێنەهاتووە، هەڕەشەی خاچپەرستەکان و هەڕەشەی مەغۆلەکان، بۆیە پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ دەوروبەر ئاسایی دەکاتەوە.

(بێبرس) سەرکردەیەکی سەربازی ئازاو بەجەرگ بوو، لەهەمان کاتدا زوو هێرشی دەکردە سەر دوژمنەکانی و ڕێی پێنەدەدان بەخۆ بکەون، ئەو کاتەی (علم الدین سنجر) کە جێگری (قوتز) بوو لەوڵاتی شام لەدەسەڵاتی (بێبرس) دەردەچێ و ڕایدەگەیەنێ کە ئەو سوڵتانی دیمەشقە و پەیوەندی بە (حسام الدین لاجین)ی مەلیکی حەلەب و مەلیکی (حماة) مەلیك مەنصور و مەلیکی (حمص) مەلیك ئەشرەف موسا دەکات، بەو ئومێدەی بتوانێ بەرەیەك دروست بکەن دژ بە (بێبرس) سوڵتان (بێبرس) کەدەزانێ خەریکە وڵاتی شامی لەدەست دەردەچێ، سەرەتا وەفدێك دەنێرێ بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشەیە، کە دەزانێ کێشەکە زۆر لەوە گەورەترە بە (گفتوگۆ) چارەسەر بکرێ، هێزێکی سەربازی گەورە دەنێرێ بۆ شام، هەموو ئەوانە دەستگیر دەکات کە لەدژی ڕاپەڕیون، دوای ماوەیەك لە بەندینخانە ئازادیان دەکات، زاهیر (بێبرس) بەدەستێکی ئاسنین دەسەڵاتی میسرِ دەگرێ و بەماوەیەکی کەم ناحەزانی لەناو دەبات.

# ڕاپەڕینەکەی (کۆرانی) بۆگێڕانەوە حوکمی شیعە بۆ میسڕ

یەکێك لەو کێشە گەورانەی ڕوو بەڕووی بێبرس بویەوە، شۆڕشەکەی (کۆرانی )بوو (کۆران) نیسبەیە بۆ دێیەك لە نەیسابوور، ئەو پیاوە کەسێکی شیعی بوو، داوای دەکرد حوکمی شیعە بگەڕیتەوە میسڕ، و توانیبوی باوەڕبەچەند کەسێك بێنێ و بەناوی لایەنگیرانی (ئالوبەیت) ڕژانە سەر شەقامەکان و هاواریان دەکرد(یا ال علی ) چەند دوکانێکی (شمشێر فرۆشەکان) دەبرن و بەشمشێرەوە هاتنە سەرشەقام، بێبرس کەئەوەی بیست هێزێکی گەورەی ناردو سەرەکانی ئەوانەی گرت و لەگەردەنیانی دا، بێبرس ڕێی بەهیچ دوو بەرەکییەك نەدەدا بکەوێتە نێو دەسەڵاتی میسڕی لەبەر ئەوەی دەیزانی لەوقۆناغەی ئیستا میسڕ تاکە قەڵای موسڵمانانە هەم بەڕووی مەغۆلەکان و هەم بەڕووی خاچپەرستەکان.

# شكەستێكی تری
# گەورەی مەغۆلەكان لە (حەلەب)

لەساڵی (٦٥٩)ی كۆچی، هەندێك لەو مەغۆلانەی ڕزگاریان ببو لە جەنگی (عین جالوت) لەگەڵ مەغۆلەكانی دورگەی فوڕات كۆدەبنەوە ژمارەیان دەگاتە نزیكەی شەش هەزار كەس، دوای ئەوەی دەزانن سوڵتان سەیفەددین قوتز كوژراوە، هێرشێكی گەورە دەكەنە سەر شاری (حەلەب) لەوێوەش بەرەو (حمص) دەكەونە ڕێ.

پادشای (حمص) حسام الدین الجوكندار و پادشای (حەمما) هەردووكیان پێكەوە سوپایەكی نزیكەی (١٤٠٠) كەسی پێكدێنن، سوپای موسڵمانان دەتوانن شكەستێكی گەورەی ئاوا بەسەر مەغۆلەكان بێنن كەمێژوونوسان دەڵێن لەموسڵمانان تەنها یەك كەس شەهید دەكرێ و ئەو سوپا شەش هەزار كەسییەی مەغۆل هەر هەموی دەكوژرێن، تەنها سەركردەی سوپاكەی مەغۆل (بەندرا) لەگەڵ چەند كەسێك ڕزگاری دەبێت ئەوەی تر هەمویان دەكوژرێن.[1]

---

(١) كتێبی شذرات الذهب فی أخبار من ذهب، لاپەڕە ٢٩٦ بەرگی ٣.

# مردنی (بدرالدین لؤلؤ)ی خاوەنی موصل و شەهید بوونی مەلیك صالحی كوڕی

لەساڵی (٦٥٧) بەدرەدین لؤلـؤی خـاوەنی موصـل كەنازنـاوی (الملـك الرحیم) بوو وەفات دەكا، دوای خۆی (اسماعیل)ی كوڕی حوكمی موصـل دەگریتە دەست نازناوی (الملك الصالح) هەڵدەگرێ، كوڕێكی تریشی هەبوو بەناوی (اسـماعیل المجاهـد) كە خاوەنی (جەزیـرە ابـن عمر)بـوو، كـوڕێكی تریشـی بەنـاوی سـەعید خـاوەنی سـنجار بـوو[1]، لەدوای جەنگـی (عین جـالوت) مەلیـك صـالح پەیوەنـدی بە (زاهیـر بێبـرس) دەكـات و ڕیزەكـانی هۆلاكـۆ جێدەهێڵێ، زاهیـر بێبـرس یـارمەتی مەلیـك صـالح دەدات، هۆلاكـۆ ئەو كـات لە (ئازەربایجـان) دەبـێ، ئەوكـاتەی بەپەیوەنـدی (بێبرس و مەلیـك صـالح) دەزانـێ هێزێـك دەنێـرێ بـۆ داگیركردنـی موصـل، لەهەمـان كاتـدا (زاهیر بێبرس)یش هێزێك دەنێرێ بۆ یـارمەتی مەلیـك صـالح، مەغۆلەكـان بەو هێزە دەزانـن بەر لەوەی هێزی بێبـرس بگـاتە موصـل بۆسـەیەكی گەورە دادەنێنن و دەتوانن هێزی میسرییەكان بشكێنن، ئینجا بەرگـی میسـرییەكان دەكەنەبەر و دەچنە (موصل) خەڵكی موصل سەرەتا وایان زانی ئەوە هێزی

---

(١) تاریخ ابن خلدون بەرگی سێیەم، لاپەڕە ٢١٦٩.

میسرییەکانە بۆیە پێشوازیان لێکردن و دەرگای شارەکەیان کردەوە مەغۆلەکان گەیشتنە نێو موصل و خەڵکی موصلیان قەتڵوعام کرد، بەڵام قەڵای موصل توانی بۆ ماوەی شەش مانگ بەرەنگاری هێزەکانی مەغۆل ببێتەوە، دواتر قەڵاکەش گیرا، مەلیك صالح و کوڕێکی تەمەن سێ ساڵەی بەدیل کەوتنە دەست هێزەکانی مەغۆل، دوای مردنی بەدرەدین لؤلؤ سێ ساڵی خایەند تاوەکو موصل دەگیرێ و مەلیك صالح بەدیل دەکەوێتە دەست مەغۆل واتە کوشتنی مەلیك صالح و کوڕەکەی لەساڵی (٦٦٠)کۆچی دەبێ.

## چۆنیەتی کوشتنی (مەلیك صالح)ی کوڕی بدرالدین لؤلؤ

مەغۆل شەپۆلێکی دڕندەی سەرشێت بون، ڕوویان لەجیهانی ئیسلامی کرد، ئەوەی مانای سۆزو بەزەیی بوو لای ئەوان بونی نەبوو، لەهەموو هەستێکی مرۆڤایەتیش داماڵدرابوون، بۆیە ڕوویان لەهەر شوێنێك کردبا کاوڵیان دەکرد، ئەوەی مرۆڤ بوایە دەیانکوشت، مەلیك صالح ڕاستە بۆ ماوەیەك لەگەڵ مەغۆلەکان بوو، لەبەر ئەوەی باوکی ئەڵقەلەگوێ و خزمەت کارێکی گەورەی هۆلاکۆ بوو، کوڕەکەشی بەدوای هەلێك دەگەڕا بۆی بڕەخسێ و لەهۆلاکۆ دورکەوێتەوە دەرکەوتنی زاهیر بیبرس بۆ ئەو شتێکی زۆر گرنگ بوو بۆیە پەیوەندی پێوەدەکاو ڕیزەکانی هۆلاکۆ جێدەهێڵێ، هۆلاکۆ ڕقێکی زۆری لەمەلیك صالح هەڵسابوو، فەرمان بەکوشتنی مەلیك صالح دەکا، بەڵام چۆن کوشتنێك.

کوشتنێك بەر لەمردنی ئازارێکی زۆر بکێشی، فەرمان دەکا : لبادێك بهێنن چەوری کەن بە دونگی مەڕ هەروەها تەواوی گیانی مەلیك صالح چەور دەکەن بە (دونگی مەڕ) ئینجا مەلیك صالح دەخەنە ناو لبادەکەو لەبەر هەتاو دایدەنێن تاوەکو ڕۆن و لبادەکە (کرم) دەردەکەن و بۆگەن دەبێ ئینجا کرمەکان مەلیك صالح دەخۆن (ولاحول ولاقوة الا بالله العلی العظیم)، لەوەش ناخۆش تر مەلیك صالح کوڕێکی هەبوو تەمەنی سێ ساڵ بوو ئەو مناڵە لەناوەڕاستەوە دەکەنە دوو لەت، لەبەر چاوی باوکی، ئەوانە بەشێکن لەتاوانی مەغۆل کەمێژوو تۆماری کردوون دەبێ چەند تاوانی لەو جۆرەیان ئەنجامدابێ و مێژوونوسان لێیبێئاگا بووینە.

# سوڵتان بێبرس
# (خەلافەتی ئیسلامی) زیندوو کردەوە

یەکێك لەهەنگاوە هەرە گرنگەکانی زاهیر بێبرس خەلافەتی ئیسلامی زیندوو کردەوە، (أحمد کوڕی الظاهر محمد کوڕی ناصرٍ لدین الله) نازناوی (المستنصربالله)یە، ئەو پیاوە لەبەغدا بەندکرابوو، برای خەلیفە (المستنصربالله)یە ئەوەی زانکۆی موستەنصرییەی لەبەغدا دروست کرد، ئەو کاتەی مەغۆلەکان بەغدایان گرت ئەو لەگەڵ چەند کەسێك ڕادەکەن و دەگەنە وڵاتی شام، ئەوەی جێی سەرنجە خەلیفەکانی عەبباسی مام و کوڕەکانی خۆیان بەند دەکرد لەترسی دوو بەرەکی تاوەکو خەلیفە دەمرد، ئینجا بەیعەت دەدرایە یەکێك لەوان و دەکرایە خەلیفە.

لەوڵاتی شامەوە هەواڵ دەدرێتە (زاهیربێبرس) کەیەکێك لەبنەماڵەی عەبباس دەرکەوتوە، زاهیر بێبرس دەیزانی چەندە گرنگە دۆزینەوەی کەسێك لەو بنەماڵەیە، کەتەواوی خەڵکی پێیان وابوو خیلافەت موڵکی ئەوانە، بێبرس دەیزانی خەلیفە شەرعییەت بەدەسەڵات و (سوڵتان بوونی) ئەو دەدات، بۆیە دەنێرێ بەدوای ئەو کەسە.

(احمدی کوڕی زاهیر) خۆیو چەند کەسێکی دەوروبەری دەگەنە میسرِ، شەقامەکانی میسرِ دەڕازێندرێتەوەو، خودی سوڵتان بێبرس و گەورە

سەرکردەکانی دەوڵەتی مەمالیك لەپێشوازی ئەو کەسە دەبن، کە هاتوە بچێتە سەر کورسی خیلافەت، دوای ئەوەی بەو شێوە گەورەیە پێشوازی لێدەکرێ، ئینجا چەندین کەس دێن و شایەدی دەدەن کە ئەو کەسە لەبنەماڵەی (عەبباسییەکانە) بۆیە سەرەتا سوڵتان زاهیر بێبرس و گەورە سەرکردە سەربازییەکان بەیعەتی پێدەدەن، دواتر زاناکان یەکێك لەو زانایانە ئیمام (عیزی کوڕی عبدالسلام)ە ئینجا گەورە بازرگانەکان ئینجا خەڵکی میسر.

دوای ئەوەی بەیعەتدان بەخەلیفە تەواو دەبێ خیلافەت دەگێردرێتەوە کتێب دەنوسن بۆتەواوی جیهانی ئیسلامی بەگەڕانەوەی خیلافەتی عەبباسی، خەڵکی دڵیان زۆر پێخۆش دەبێ، ئینجا کتێبێك دەنوسن بۆ شام لەکتێبەکە دا هاتوە:

هذه مكاتبة الى القاضي نجم الدين نعلمه بما تجدد من أمر يبهج الامة، ويستدعي الرحمة، ويأخذ الثأر ممن هتكوا للاسلام حرمة، وهو أنه ورد علينا الامام أبو القاسم أحمد، ولد الامام الظاهر بن الامام الناصر_سلام الله عليه_ أكرمنا وفادته اكرام مثله، وتلقيناه باحسان يقضي لقاصده باجتماع شمله، وجمعنا العلماء والائمة والفقهاء والامراء والاكابر والتجار، ومن يشار اليه من أهل المدينتين، وفاوضناهم بحضور الامام_سلام الله عليه_ في أمر نسبه، واخذ البيعة له، فحضر جماعة شهدوا بالاستفاضة أنه ولد الامام الظاهر، وثبت ذلك عند قاضي القضاة لدينا ثبوتا شرعيا،

وأسجل عليه بحضور العالم، وعند ذلك بسطنا لمبايعته راحتنا، وقتفى اثرنا الامراء والحلقة والناس كافة في مبيايعته والرضى بخلافته، وذلك في رابعة يوم الاثنين ثالث عشر رجب، وتقدمنا بان يخطب له، ويتوج مفرق الدينار والدرهم باسمه الشريف ونحن بصدد اهتمام نصرة الاسلام علي يديه، واهداء كرائم الأموال والذخائر اليه، فاليستند من منصبه الشريف الى امام صحيح النسب، شريف الحسب، ويجعل استناد احكامه الى ولايته الصحيحة، ومبايعته الصريحة، وليعلن بهذا الخبر السار في البادين والحضار.

ئەوە ئەو نامەیەیە کە لەمیسرەوە دەنوسرێ بۆ شام، خەڵکەکە دڵیان زۆر پێخۆش دەبێ، سولْتان بێبرس لەگەڵ خەلیفە دەچنە شام لە مزگەوتی دیمەشق خەڵکێکی یەکجار زۆر کۆدەبنەوە، بەیعەت دووبارە دەکەنەوە بۆ خەلیفە بەو ئومێدەی خەلیفەو سولْتان بتوانن مەغۆلەکان لەخاکی موسڵمانان دەربکەن.

لەو کاتەی لەمیسر بەیعەت بەو خەلیفەیە درا لەهەمان کاتدا کەسێکی تریش بەناوی (الحاكم بأمر الله: أبو العباس أحمد کوڕی أبو علي الحسن کوڕی أبو بكر کوڕی الحسن کوڕی علي القبي –بەزەمی قاف و شەددەی بائەکە- کوڕی خەلیفە المسترشد بالله کوڕی المستظهر بالله). ئەو لە(حەلەب) وەکو خەلیفە بەیعەتی پێدرا، یەکێك لەوانەی بەیعەتی پێدا باوکی(شێخی ئیسلام ابن تيميه)بوو، بەڵام زووتر بەیعەت بە المستنصر

بالله درابوو لەمیسرٍبۆیە، ئەوکاتەی خەلیفە دەچێتە شام، ئەو پیاوە واتە خەلیفەکەی (حەلەب) بەیعەتی پێدەدا لەژێر یەك ئاڵا کۆدەبنەوە، سوڵتان بێبرس لەگەڵ سوپاکەی دەگەڕێنەوە میسرٍ.

خەلیفە (المستنصربالله) سوپایەك ئامادە دەكات لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی سەربازی لەوانە پادشای سنجارو پادشای موصل بەرەو عێراق دەکەونە ڕێ، سەرەتا دەچنە هیت لەوێرا هەوڵدەدەن بگەنە بەغدا، بەڵام دەکەونە بۆسەی مەغۆلەکان و خەلیفەو زۆرێك لەو سەرکردە سەربازیانە دەکوژرێن و چەند کەسێکیان ڕزگاری دەبێ بەم شێوەیە خەلیفە (المستنصربالله) نزیکەی شەش مانگێك لەسەر کورسی خیلافەت دەبێ.

ئەو ڕووداوە لەساڵی (٦٦٠) کۆچی بوو لەدوای ئەو بەیعەت بەخەلیفەکەی (حەلەب) دەدرێ، کە ناوی الحاکم بأمر اللە)یە. [(١)] بەم شێوەیە خیلافەتی عەبباسی دەگوازرێتەوە میسرٍ تا ساڵی (٩٢٣)ئەو کاتەی خیلافە لەبنەماڵەی عەبباسییەکان دەردەچێت و دەکەوێتە دەست عوسمانییەکان.

(حاکم بأمر اللە) نزیکەی (٤٠) ساڵ لەسەر کورسی خیلافەت دەمێنێتەوە، لەساڵی (٧٠١) وەفات دەکاو لە دوای ئەو بەیعەت دەدرێتە کوڕەکەی بەناوی(المستکفی باللە) ابو الربیع سلیمان، کە بەدووەم

---

(١) تاریخ الخلفاء، لاپەڕە: ٣٣٧. البدایة والنهایة (١٣/ ٢٣٣).المذیل علی الروضتین، بەرگی دووەم، لاپەڕە ١٦٨.

خەلـیفەی عـەبباسـی لەمیسـرٍ هەژمـار دەکـرێ، لەبەر ئەوەی (المستنصـر باللـه) ڕاسـتە لەمیسـرٍەوە بەیعەتـی خـیلافەی پێـدرا، بەڵام ئەو خـاوەن پـرۆژەی گێـرانەوەی خـیلافەت بـوو بـۆ (بەغـدا) کە هەر لەو ڕێـیەش دەکـوژرێ، لەمـاوەی ئەو (٤٠) سـاڵەی (الحـاکم بأمرالله) دوو ڕووداوی زۆر گەورە هاتنە پێش، یەکیان کێشەی نێو خۆیی بنەماڵەی (جەنگیزخان) بوو، ئەوەی تر دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانی بوو، کە گرنگە لەشوێنی خۆی ئاماژەی پێبکەین.

## تێبینییەکی گرنگ:
## ئەرك و مافی (خەلیفە، حاکم، سوڵتان) لە ئیسلامدا

زۆرجـار کتێـب و فەتـواو ئیجتهـادی فیقهـی، گـرنگە لەچـوار چێـوە زەمەنیـیەکەی خـۆی بخوێنـدرێتەوە، سـەرەڕای ئەو گەنـدەڵیەی خەلـیفە عەبباسـییەکان تێـی کەوتبـون، کە ئەوان یەکێـك بـوون لەهۆکـاری ئەو کارەساتەی بەسەر جیهانی ئیسلامی هات، سەرەڕای ئەو دونیا ویستییەی لەدڵی ئەوان بوو، کەچی هەم خەڵکەکە و هەم خودی سەرکردە سەربازی و زانـاو پیـاوە ئازاکـان، دەگەڕان بەدوای کەسێك لەبنەمـاڵەی عەبباسییەکان، نەوەی خەلـیفە بێ و بەیعەتـی پێبـدەن و بـیکەنە خەلـیفەو خزمەتـی بـکەن، سەیرە ئەوە چ فقهێك بووە ئەو عەقڵیەتەی لای ئەو خەڵکە دروست کردوە، باشە ئەگەر بنچینەو بنەمای ئەو هەڵوێستەیان ئەو فەرمودەی پیغەمبەری خۆشەویست بێ (صلی الله علیه وسلم) کە دەفەرمێ: الائمه من قریش. گومـان

لەڕاستی ئەو فەرمودەیە نییە هەتا ئیمامی ابن حجر العسقلانی، کتێبێکی نوسیوە بەناوی(لذة العیش في طرق حدیث الائمة من قریش) ڕێگاکانی ئەو فەرمودەیەی کۆکردۆتەوە، گومان لەڕاستی ئەو فەرمودەیە نییە، بەڵام هەموو ئەو زانایانەی کتێبیان لەبواری السیاسە الشرعیە داناوە وەکو ئیمام (ماوەردی و جوەینی و ئەبو یەعلا) هەموو ئەوانە جگە لەوەی باسی قوڕەشی بونی خەلیفەیان کردوە، چەند مەرجێکی تریشیان داناوە کە دەبێ ئیمامی گەورە خەلیفە ئەو مەرجانەی لێبێتە دی، هەموو ئەو زانا گەورانە باسی زانستی شەرعی خەلیفە ئیمامی گەورەیان کردوە، هەتا هەندێکیان دەڵێن مەرجی قازی بوون چەندە گرنگە لەزانستی شەرعی دەبێ خەلیفەش لەڕووی زانستی شەرعییەوە بەقەد قازیەك ئاگاداربێ، مەرجەکانی موجتەهید و موفتی لێبێتە دی، ئینجا دەبێ دەست پاك و داوێن پاك بێ، خەلیفە چۆن مەرجی قوەڕەشیان بۆ داناوە مەرجەکانی تریشیان بۆ داناوە وەکو باسمان کرد زانستی شەرعی و داوێن پاکی و لەخوا ترسان و ئازاو بەجەرگ و لێهاتوو، چەند خاڵێکی تر، بۆیەئەوەی سەیرە کەمێژوو دەخوێنتەوە ئەو خەڵکە لەکاتی جێبەجێکردنی ئەو مەرجانەی لەو کتێبانە هاتوە، تەنها مەرجی قوڕەشی بوونیان بەنەزەری ئیعتبارەوە وەرگرتوەو ئەوەی تریان واز لێهێناوە، باشە ئەگەر کەسێکی قوڕەشی ئەو مەرجانەی لێنەهاتبیتە دی و کەسێکی ئەعجەمی هەر عەرەب نەبێ، یان عەرەبە و

قوڕەشی نییە، بەڵام ئازاو بەجەرگ و خاوەن زانستی شەرعی ولەخەمی ئوممەت دابێ دەبێ واز لەوە بێنین و تەنها قوڕەشیەکە بکرێتە خەلیفە؟

بێگومان نەخێر وەئەوە فیقهی ئەو فەرمودەیەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نییە، بەڵکو دەبێ جگە لەقوڕەشی بوونی باقی مەرجەکانی تریشی لێبێتە دی، دەزانین ئەو کات هەستیان بەگرنگی خودی بونی خەلیفە کردوەو پێیان وابووە کە سیستەمی خەلیفە واجیبێکی شەرعییە، ئەوەش لەکتێبی فیقهییەکان هاتوە و زانایان باسی ئەوەیان کردوە کە ئوممەی ئیسلامی ناکرێ بێ خەلیفە بێت، لەبەرئەوەی نەبونی خەلیفە یانی (فەوزا)سەروەربێ.

بۆیە دەبێت خەڵکی لەدەوری کەسێك كۆ ببنەوە بۆ جێبەجێکردنی شەرعی خوای گەورە ئیمام الماوردي دەفەرمێ: الامامة موضوعة لخلافة النبوة في حراسة الدين وسياسة الدنيا وعقدها لمن يقوم بها في الامة واجب بالاجماع[1] ئیمامەت لە خیلافەتی نبووەت دانراوە واتە لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خۆشەویستمان(صلی الله علیه وسلم) دوا پێغەمبەرەو(صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری بەدوا نایەت تا خۆی مابوو سیاسەتی ئەو خەڵکەی دەکرد لەدوای ئەو(صلی الله علیه وسلم) ئیمام بەو کارە هەڵدەستێ.

کەوا بوو دیاری کردنی کەسێك بۆ سەرپەرشتی و هەڵسوڕانی کاڕوباری خەڵکی و پابەند کردنیان بەشەرعی خوای گەورە واجیبەو کۆڕای لەسەرە.

(١) الأحكام السلطانية للماوردي، لاپەڕە ١٥.

هەر بۆیە (ابن حزم) دەفەرموێ: (اتّفق جَمِيع أهل السّنة وَجَمِيع المرجئة وَجَمِيع الشِّيعَة وَجَمِيع الْخَوَارِج على وجوب الْإِمَامَة وَأَن الْأمة وَاجِب عَلَيْهَا الانقياد لإِمَام عَادل يُقيم فيهم أَحْكَام الله ويسوسهم بِأَحْكَام الشَّرِيعَة الَّتِي أَتَى بهَا رَسُول الله صلى الله عَلَيْهِ وَسلم حاشا النجدات من الْخَوَارِج فَإِنَّهُم قَالُوا لَا يلْزم النَّاس فرض الْإِمَامَة وَإِنَّمَا عَلَيْهِم أَن يشاطوا الْحق بَينهم). [(١)]

واتە ئەهلی سونەت و جەماعەت کۆڕان هەروەکو هەموو مورجیئەو شیعەو خەواریج لەسەر بوونی ئیمام مەگەر چەند کەسێکی کەم نەبن لەگەڵ ئەو کۆڕابوونە نینە وەکو هەندێك لەخەواریج و موعتەزیلە. هەرلەو بوارەوە ئیمام نەوەوی دەفەرموێ: لابد للامة من امام يقيم الدين وينصر السنة وينتصف للمظلومين ويستوفي الحقوق ويضعها مواضعها. [(٢)]

لێرە ناچارین و داوا لەخوینەر دەکەین لەگەڵمان بەسەبربێت، لەبەر ئەوەی گرنگە باسی ئەرك و مافەکانی خەلیفە بکەین، کەبەداخەوە ئەو کات هیچ لەو ئەرك و مافانە نەهاتبونە دی لەخەلیفەکان، بۆ ئەوەی خوێنەر بەرچاوی ڕوون بێت و بزانێ لەکتێبە شەرعییەکان چۆن باسی ئەرك ومافەکانی خەلیفە کراوەو تا چەند لە واقیع ڕەنگی داوەتەوە.

(١) الفصل في الملل والأهواء والنحل ٤/ ٧٢.

(٢) روضة الطالبين وعمدة المفتين ١٠/ ٤٢.

## ئاماژە بەچەند خاڵێکی گرنگ

یەکەم: مانای ئیمامەت و خیلافەت.

ئیمامەت واتە پێشەوایەتی کردن، جا بۆ هیدایەت بێت یا بۆ گومڕایی، ئیمامیش ئەو کەسەیە کەپێشەوایی دەکات: (والإمـامُ: كُـلُّ مَـنِ ائـتَمَّ بِـهِ قـومٌ كَانُوا عَلَى الصِّرَاطِ الْمُسْتَقِيمِ أَو كَـانُوا ضـالِّين)[١] ئیمام نەوەوەی دەفەرموێ: (يَجُـوزُ أَنْ يُقَـالَ لِلْإِمَـامِ: الْخَلِيفَـةُ وَالْإِمَـامُ وَأَمِـيرُ الْمُـؤْمِنِين).[٢] واتـە: دەکرێ بـوترێ خەلیفە یـا ئیمـام یـا ئـەمیری بـڕواداران کـەوابوو مانـای خەلیفـەو مانای ئیمام لەبەرامبەر یەکتر هاتوون.

چەمکی ئیمام لەقورئانی پیرۆز هاتوەو ئاماژەی وەزیفەی پێکراوە زیـاتر نـەوەك کەسـێکی تایبـەتی پێمەبەسـت بێـت، واتـە هـەیە ئیمـام و پێشـەوان لەهیدایەت و سەر خستنی ئەو دینە، وە هەشە ئیمامەو پێشەوایە لەدژایەتی دینی خوای پەروەردگار، کۆی ئیمام واتـە (أَئِمَّـةً) لـەقورئانی پیـرۆز بـۆ هەردوو جۆر بەکار هاتوە مەبەست ئەهلی هیدایەت و ئەهلی گومڕایی.

خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێ: ﴿وَجَعَلْنَـاهُمْ أَئِمَّـةً يَهْـدُونَ بِأَمْرِنَـا وَأَوْحَيْنَا إِلَيْهِمْ فِعْلَ الْخَيْرَاتِ وَإِقَـامَ الصَّـلَاةِ وَإِيتَـاءَ الـزَّكَاةِ وَكَانُـوا لَنَـا عَابِدِين﴾.[٣]

---

(١) لسان العرب ١٢/ ٢٤.

(٢) روضة الطالبين وعمدة المفتين ١٠/٤٩.

(٣) الأنبياء: ٧٣.

هەروەها دەفەرموێ: {وَنُرِيدُ أَنْ نَمُنَّ عَلَى الَّذِينَ اسْتُضْعِفُوا فِي الْأَرْضِ وَنَجْعَلَهُمْ أَئِمَّةً وَنَجْعَلَهُمُ الْوَارِثِينَ}.[١]

{وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ}[٢] ئەوانەی لەو ئایەتانە ئاماژەیان پێکراوە پێشەوای خەیرو هیدایەت و ئیسلامەتین.

ئاواش خەڵکێك هەن ئیمامەتی ئەهلی کوفر دەکەن ئیمامن لە دژایەتی ئەو ئیسلامەو بڵاو کردنەوەی فەساد .

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: {وَإِنْ نَكَثُوا أَيْمَانَهُمْ مِنْ بَعْدِ عَهْدِهِمْ وَطَعَنُوا فِي دِينِكُمْ فَقَاتِلُوا أَئِمَّةَ الْكُفْرِ إِنَّهُمْ لَا أَيْمَانَ لَهُمْ لَعَلَّهُمْ يَنْتَهُونَ}[٣] هەروەهادەفەرموێ: {فَأَخَذْنَاهُ وَجُنُودَهُ فَنَبَذْنَاهُمْ فِي الْيَمِّ فَانْظُرْ كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الظَّالِمِينَ * وَجَعَلْنَاهُمْ أَئِمَّةً يَدْعُونَ إِلَى النَّارِ وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ لَا يُنْصَرُونَ}[٤] بەڵام گەر هاتوو لەقورئانی پیرۆز ناوی ئیمام بەتاك هات ئەوا مەبەست لێی پێشەوایی کردنە بۆ هیدایەت .

---

(١) القصص: ٥.

(٢) السجدة: ٢٤.

(٣) التوبة: ١٢.

(٤) القصص: ٤٠ – ٤١

{وَإِذِ ابْتَلَى إِبْرَاهِيمَ رَبُّهُ بِكَلِمَاتٍ فَأَتَمَّهُنَّ قَالَ إِنِّي جَاعِلُكَ لِلنَّاسِ إِمَامًا قَالَ وَمِنْ ذُرِّيَّتِي قَالَ لَا يَنَالُ عَهْدِي الظَّالِمِينَ}[1]

هەروەها دەفەرموێ: {وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا}.[2]

هەر لەو بوارەوە لەقەبی ئەمیری بڕوادارانیش بۆ خەلیفە یاخود ئیمامی گەورە بەکار هاتووە لەدوای وەفاتی ئەبو بەکر ڕەزای خوای گەورەی لەسەر بێ کە بەخەلیفەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) ناو دەبردرا صەحابەی کیرام لەقەبی ئەمیری بڕوادارانیان دا بە ئیمامی عومەر ڕەزای خوای لەسەر بێ. (واتّفق أن دعا بعض الصّحابة عمر (رضي الله عنه) يا أمير المؤمنين فاستحسنه النّاس واستصوبوه ودعوه به) .[3]

(١) البقرة: ١٢٤.

(٢) الفرقان: ٧٤.

(٣) تاريخ ابن خلدون بەرگی ١\ ٢٨٣.

## تێبینی یەکی گرنگ

لەدوای وەفاتی پێغەمبەر(صلى الله عليه وسلم) ئیمام و خەلیفە ماناکەیان بەرامبەر یەك بوون، واتە خەلیفە هەر خۆشی ئیمام بووەو خەڵکی لای فەتواکانی ئەوان وەستاون ئەو دوو لەقەبە لە یەك کەس بەتەواوی کۆبۆتەوە، هەر بۆ نمونە چاکترین و زاناترین کەس لەدوای پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) ئیمامی ئەبو بەکری صەدیق بوە ڕەزای خوای لەسەر بێ دواتر ئیمامی عومەرو دواتر ئیمامی عوسمان و دواتر ئیمامی عەلی ڕەزای خوایان لەسەر بێت، لەکەسایەتی ئەوانە هەست بەهیچ جودابونەوەیەك نەکراوە لە ئیمامەت و خەلیفایەتی، بەڵام دواتر ئەو دوو مانایە لەیەك جودادەکرێتەوە لەقەبی ئیمام زیاتر دەدرێتە ئەو کەسانەی کە شارەزایەکی زۆریان لەدین هەبوەو خەلیفە زیاتر ئیدارەی وڵاتی بەدەستەوە بوەو وردە وردە ئەو دوو صیفەتە لەیەك جودا دەکرێتەوە واتە ئیمامەتی دین و ئیمامەتی دونیا، مێژوو ئەوەی بەخۆوە بینیوە خەڵکانێك کراون بەخەلیفە زۆر بێئاگا بووینە لە شەریعەت ئیمامەتی ئەوان بەمانای ئیمامەت و خیلافەتی ئیداری و سیاسی هاتوە بۆیە گرنگە بچینە خزمەت ئەو فەرمودەیە .

"عَن النُّعْمَان بن بشير عَنْ حُذَيْفَةَ قَالَ: قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: تَكُونُ النُّبُوَّةُ فِيكُمْ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ النُّبُوَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ

ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا عَاضًّا فَتَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ تَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ مُلْكًا جَبْرِيَّةً فَيَكُونُ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكُونَ ثُمَّ يَرْفَعُهَا اللَّهُ تَعَالَى ثُمَّ تَكُونُ خِلَافَةً عَلَى مِنْهَاجِ نُبُوَّةٍ". (١)

واتە: ژیانی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم) لەنێوان صەحابەی کیرام مانەوەی نبوەت بووە تا وەفات کردنی بە وەفاتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، پێغەمبەرایەتی هەڵگیرا، ئینجا خیلافەت لەسەر ڕێگای پێغەمبەرایەتی ئەوەش ئاماژەیە بۆ خیلافەتی ڕاشیدە، دواتر ئەو خیلافەتە هەڵدەگیرێ و موڵکێکی پڕ لە نارەحەتی شوێنی دەگرێتەوەو دواتر ئەوەش هەڵدەگیرێ و موڵکێکی بە زۆر شوێنی دەگرێتەوە، واتە بەمیراتگرتنی دەسەڵات لەدوای ئەوەش خیلافەت لەسەر مەنهەجی پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) خۆشەویست دەگەڕێتەوە.

کەوا بوو مانای خەلیفەو ئیمام وردە وردە لەیەك جودا دەبێتەوە تا دەگاتە ئەو ئاستەی سەرۆك و حاكم دەكەونە ئاقارێك و شەرعی خوای پەروەردگاریش دەكەوێتە ئاقارێكی تر كە بێگومان موسڵمان دەبێت لەگەڵ شەرعی خوا بێت، لەو شوێنەی كە شەرعی لێیەو لەگەڵ ئەو كەسەی كە لەسەر شەرعە.

(١) مشكاة المصابيح ٣، ١٤٧٨.

سیستەمی مەلیکایەتی یا بەمیراتگرتنی دەسەڵات شتێکە لەگەڵ ئیسلام تێك نا کاتەوە و لەو سیستەمە ویستوو شەهوەتی مەلیك یا بنەماڵە یا قەبیلە زاڵە بەسەر بەرژەوەندی ئوممەت، هەنگاوەکان بەرەو ئەو ئاراستەیە دەڕوات کە ئەو کەسە مەیلی بۆ دەکا، یا ئەوسیستەمانەی دوور لەشەرعی خواو هەڵقولاوی عەقلی بەشەرن بەپێی عەقڵی خۆیان بەرژەوەندی خەڵکیان دیاری کردوەو دووا ڕۆژ پیشتگوێ خراوە، بەڵام تەنها خیلافەی پێغەمبەرایەتی یە بەرژەوەندی دونیاو دوارۆژی خەڵکی تێدا ڕەچاو کراوە .

ئیمام (ابن خلدون) لەو بوارەوە دەفەرموێ: (ومقصود الشّارع بالنّاس صلاح آخرتهم فوجب بمقتضى الشّرائع حمل الكافّة على الأحكام الشّرعيّة في أحوال دنياهم وآخرتهم وكان هذا الحكم لأهل الشّريعة وهم الأنبياء ومن قام فيه مقامهم وهم الخلفاء فقد تبيّن لك من ذلك معنى الخلافة وأنّ الملك الطّبيعيّ هو حمل الكافّة على مقتضى الغرض والشّهوة والسّياسيّ هو حمل الكافّة على مقتضى النّظر العقليّ في جلب المصالح الدّنيويّة ودفع المضارّ والخلافة هي حمل الكافّة على مقتضى النّظر الشّرعي في مصالحهم الأخرويّة والدّنيويّة الرّاجعة إليها إذ أحوال الدّنيا ترجع كلّها عند الشّارع إلى اعتبارها بمصالح الآخرة فهي في الحقيقة خلافة عن صاحب الشّرع في حراسة الدّين وسياسة الدّنيا به). [1]

---

(١) تاريخ ابن خلدون ١\ ٢٣٩.

دووەم: گرنگە لێرە ئاماژە بەوە بکەین کە گوتەی پەنا دەگرین بەخوا لە شەیتان و سیاسەت، لەتەرازوی شەرعدا هیچ سەنگێکی نییە، بەڵکو ئەوە پێچەوانەی شەرعەو موسڵمان نابێت ئەوەی قبوڵ بێت، ئەو مەفهومە دەبێت تەفصیلی پێبدرێ واتە دەبێت بڵێین پەنا بەخوا دەگرین لەشەیتان وسیاسەتێکی نائیسلامی. وە ئەو گوتەیە واتە (اعوذ بالله من الشيطان والسياسة) پێچەوانەی مەنهەجی پێغەمبەرانە کە خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) فەرمویەتی: (كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ تَسُوسُهُمُ الأَنْبِيَاءُ) [(١)]. شەرعی خوا سیاسەتە بەمانای بەڕێوە بردنی کارو باری خەڵکی و ئیدارەی وڵات، ئەو گوتەیە ئەگەر لەشوێنی خۆی بەکار نەهێنرێت زۆر خراپ دەقۆزرێتەوەو بۆدابڕینی سیاسەت لە شەرع بەکار دەهێنرێت.

(١) رواه البخاري

# ئەرك و مافی
# خەلیفە، ئیمام، سوڵتان، حاكم، لەئیسلام

گرنگی وەزیفەی ئیمام لەئیسلام لە خودی وەزیفەو مەقامەكە دایە نەوەك لە خودی كەسەكە واتە گرنگ نیە كێ دەكرێتە یا دەبێتە حاكم گرنگ ئەوەیە ئەو كەسە ئەركەكانی ڕاپەڕێنێ و هەدەفەكانی بپێكێ، تاوەكو مافەكانی بپارێزرێ، حاكم نەهاتۆتە سەر كورسی حوكم بۆ پاراستنی خودی خۆی و كەس وكارو بنەماڵەو قەبیلەی، بەڵكو حاكم لەئیسلام بۆ پاراستنی چەند خاڵێك حاكمە شەرعییەتی بەمانەوەی ئەو خاڵانەیەو شەرعییەت لێسەندنەوەشی بەنەمانی ئەو خاڵانەیە.

زانایانی ئیسلام باسی مافی گەلیان كردووە لەسەر "ئیمام" یا "خەلیفە" یا "حاكم" واتە لەبەر بوونی ئەو خاڵانە شەرعییەتی گوێڕایەڵی پێدراوە بەنەمانی ئەو خاڵانە شەرعی یەتی گوێڕایەڵی لێ دەسەنرێتەوەو (توانای گۆڕینی) بەنەزەری ئیعتبارەوە وەردەگیرێ. لەبەر ئەوەی لەئیسلامدا هیچ فەرمانێك بەدەرنییە لەتوانای مرۆڤ، لەسەر بنچینەو بنەمای لاتكلیف الا بمقدور.

ئیمام (أبو عبد الله بدر الدين ابن جماعة) لەکتێبی (تحرير الأحكام في تدبير أهل الإسلام) دوای ئەوەی باسی مافی ئیمام لەسەر خەڵکی دەکات ئینجا باسی ئەو (١٠) مافەی خەڵکی دەکات لەسەر سولتان:

یەکەمیان: پاراستنی ئیسلام و بەرگری کردن لێی، واتە خاڵی یەکەمی خەلیفە یاسوڵتان پاراستنی ئەو دینەیە گەر خەلیفە بوو دەبێت دین لە ژێر دروشمی خیلافەت بپارێزێ، گەر حاکمی وڵاتێکیش بوو دەبێت ئیسلام لەو وڵاتە بپارێزێ کە پێی ڕاسپێردراوە، جیهادی موشریکەکان بکات و خەڵك و وڵات لە ڕێگرو ئاژاوەگێڕان بپارێزێ و سەرباز و لەشکر ئامادەبکات و خۆی بۆ ئەو مەبەستە لەهەموو ڕوویەك قایم بکات. واتە پاراستن و پارێزگاری لەو ئیسلامە دەبێ خەمی یەکەمی حاکم بێت.

مافی دووەمی خەڵکی لەسەر حاکم : پاراستنی ئەو دینەیە لەسەر بنچینەو بنەما ئەسلییەکانی خۆی دوور لە هەموو تەحریفێك، واتە حاکم نەك دەبێت ڕێ لەو کەسانە بگرێت کە دژایەتی ئیسلام دەکەن، بەڵکو دەبێت ئەهلی عیلم لەخۆ نزیك بکاتەوە، تاوەکو بتوانێ لەڕێی ئەوانەوە ئەو ئیسلامە وەك خۆی بپارێزێت، حاکم مافی گوێڕایەڵی لەدەست دەدات، گەر هات و هەوڵی شێواندن و ناشرین کردنی ئیسلامی دا، پاراستنی ئەو ئیسلامە لەسەر بنچینە و بنەما سەرەکییە کانی خۆی و پوچەڵکردنی هەموو هەوڵێك بۆ لادانی ئەو ئیسلامە لەواقیع، ئەرکی حاکمەو زانایانی ئومەت لەسەری کۆڕان.

ئەركی سێیەمی حاكم: جێبەجێ كردنی شەعائیری ئەو ئیسلامە وەكو كردنی نوێژە فەڕزەكان و جومعەو جەماعەت و بانگدان و قامەت كردن و وتاری هەینی و پێش نوێژی و ڕۆژو و جەژنەكان و حەج و عومرەو گرنگی دان بە جەژنەكان و ڕێگا خۆشكردن و ئاسانكاری بۆ حەج كردن هەموو ئەو كارانە ئەركی حاكمە دەبێت مشوری بخوات خەڵكی شیاو ڕاسپارێ بۆ ئەنجامدانی ئەو كارانە و، توانای دەوڵەت بۆ ئەو كارانە بەكاربێنێ.

مافی چوارەم: لەسەر حاكمە كەسی شیاو و خاوەن دین و ئەمانەت دیاری بكا، بۆ یەكلاكردنەوەی كێشەكان و بەرگرتن لەزوڵمی ستەمكار، سەرەڕای ئەوەش حاكم دەبێ خۆی لێیان بپێچێتەوە ئاگاداری ئەو كەسانە بێت كە كاریانی پێ ڕاسپاردوە.

مافی پێنجەم: حاكم لەئیسلامدا دەبێت خۆی مشوری جیهاد بخوات هەر بۆ ئەو مەبەستە سوپا و لەشكر ئامادە كات، لای كەمی ساڵێ یەك جار بەو فەڕزە هەڵسێت، بێگومان گەر بارودۆخی موسڵمانان لەباربوو و بانگەوازی ئیسلامی كۆسپی لەپێش دانەنرابوو، هەروەها دەبێت حاكم لەخەمی موسڵمانان بێت و گەر موسڵمانان لەدیل دابوون دەبێ هەوڵی كڕینەوەیان یا گۆڕینەوەیان بدات و ئازادیان بكات.

مافی شەشەم: ئەركی حاكمە كە شەرعی خوا بەسەر ئەو خەڵكە بسەپێنێ، بۆ پاراستنی سنورەكانی خوای پەروەردگار و پاراستنی مافی

خەڵكی، لەبەر ئەوەی حیكمەت لەو حدودانەی لەئیسلامدا هاتوە هێنانە دی ئەو دوو خاڵەیە پاراستنی سنوری شەرع و پاراستنی مافی خەڵكی، ئەو حدودانەش لەئیسلامدا هەموو كەس لەبەرامبەری لەیەك ئاستن و چۆن بەسەر هەژارێك دەسەپێنرێ ئاواش بەسەر پادشاو سوڵتان دەسەپێنرێ.

مافی حەوتەم: كۆكردنەوەی زەكات و جیزیە لەخاوەنەكانی و خەرج كردنی لەشوێنی گونجاوی خۆی بەپێی شەرع، هەروەها دانانی كەسی شیاو بۆ سەرپەرشتی ئەو كارانە .

مافی هەشتەم: دانانی كەسی شیاو بۆ سەر پەرشتی ئەو موڵكانەی وەقف كراون و خەرج كردنی داهاتەكان لەڕێی شیاو و ئاوەدان كردنەوەی وڵات پێی.

مافی نۆهەم: دابەش كردنی غەنیمە بەو شێوەی شەرع دایناوە.

مافی دەیەم: دادوەری لەحوكم گێڕی و ڕەخساندنی زەمینەیەكی لەبار بۆ عەدالەت لەهەموو بوارەكان.

ئەوە بەكورتی ئەو دە خاڵەیە كەمافی خەڵكین بەسەر حاكم و سوڵتان، وە دەبێت خاوەن دەسەڵات بەو ئەركانە هەڵسێت. ئەوخاڵانەی ئیمام (ابن جماعة) ئاماژەی پێفەرمووە لەزۆربەی كتێبەكانی بواری سیاسەی شەرعی دووبارە بۆتەوەو هەر بۆ نمونە سەیری كتێبی (الأحكام السلطانية، الماوردي) و (الأحكام السلطانية، القاضي أبو يعلى) بكە.

ئەگەر بێت و سەیری ئەو خاڵانە بکەین کە زانایان باسیان کردوە لەئەرکەکانی خەلیفە و سەیری واقیعی خەلیفەکان بکەین، هیچ گومانمان نامێنێ لەوەی ئەو خاڵانە تەنها چەند خاڵێکی نەزەری بوینەو لەواقیع بەرجەستە نەکراوە، بۆیە ئەو کارەساتانەی مەغۆل بەسەر ئەو ئوممەتەیان هێنا باجی ئەو جۆرە هەڵە گەورەیە بووە، کاتێك ئیسلام تەنها لەهەناوی کتێبەکان دەمێنێتەوەو واقیعی سیاسی شتێکە پێچەوانەی ئەوەت پێدەڵێ، بەداخەوە تەقدیس کردنی خەلیفە شتێکی باو بوە لای عەوام زاناو سەرکردە سەربازییەکانی ئەو سەردەم، ئەو بابەتانە زۆر گرنگە، بەڵام با ئەوە ندە بەس بێ ئەگەر نا زۆر لەوە زیاتری هەڵدەگرێ.

# کێشەی نێو خۆیی مەغۆل و دەرکەوتنی (هۆزی ئاڵتونی، القبیلة الذهبیة)

(جەنگیزخـان) بەر لەوەی بمـریّ، مەمـلەکەتەکەی دابەشـکرد لەنێـوان کوڕەکـانی، بەپێـی یاسـاکانیان دەبـوایە، کـوڕی گەورەی دورترینـی مەمـلەکەتەکەی بەرکەویّ، ئینجـا کـوڕی لەو بچـوك تـر شـوێنەنزیکەکان تادەگـاتە بچـوکترین کـوڕی، کەدەبـوایە شـوێنی بـاوکی بەرکەویّ واتە قەراقورم و دەورو بەری.

جەنگیزخان چوار کوڕی هەبون:

کوڕی یەکەمی: ناوی (جوجی) بوو لەساڵی (٦٢٥) دەمریّ ئەو کات جەنگیزخان هێشتا لەسەر ژیان بوو، لەهەندێك سەرچاوەکان هاتوە، کە ئەو کـوڕەی نـاکۆك بـوو لەگەڵ (جەنگیزخـان) پێـی وابـوو بـاوکی خـوێنێکی زۆری ڕشـتوە، بـۆیە جەنگیزخـان دەسـتی هەبـوو لەژەهرخـوارد کردنـی ئەو کـوڕەی و کوشـتنی، بەشـی ئەو کـوڕەی لەمەمـلەکەتەی جەنگیزخـان نـاوچەی قەبقـاج بـوو کە دەکـاتە بـاکوری تورکسـتانی ئێسـتا و تەواوی دەوڵەتـی کازاخسـتان تـاوەکو دەریـای (قەزویـن) لەوێشـەوە تـاوەکو حەوزی ڕوبـاری (ڤۆلگـا) تـا دەگـاتە پۆڵەنداو ئەوڕوپـای خۆرهەڵاتی ئێسـتا، ئەو

کــوڕەی موســڵمانەکانی خــۆش دەویســت و لەگەڵ ئەو کاولکــاریە نەبــوو کەباوکی دەیکرد.

کوڕی دووەمی: ناوی (جغتای) بوو لەساڵی (٦٣٩) دەمرێ، لەهەمـوو کوڕەکانی جەنگیزخان، ستەم کارتر بوو، تـاڕادەیەکی یەکجار زۆر پابەنـدی یاســاکانی جەنگیزخـــان بـــوو، ئەو بەشـــەی بەری کەوت لەمەملەکەتـــی جەنگیزخان، ئێران و خوراسـان و ئەفغانسـتان و بەشێکی زۆری ترکسـتان و ئەو ناوچــانەی دەکەوێــتە نێــوان هەردوو ڕوبــاری (جیحون، ئامـوداریــا) و (سەیحۆن، سەرداریا) زۆربەی زۆری سەرکردەکانی (جغتـای) لەو بوزییـانە بـوون کە ڕقێکـی زۆریـان لە موسـڵمانان دەبـویەوە، لەزەمەنی (جغتـای) بـۆ هیچ موسڵمانێك نەبوو ئاژەڵ سەر ببڕی، زۆربەی موسـڵمانان ئاژەڵەکانیـان بەمردووی یـان بەخنکانـدن و ورگ دڕیـن دەخوارد کە ئەوەش لەشـەریعەتی ئیسـلام حەرامەو ڕێپێـنەدراوە، ب ەڵام بـۆ ئەو خەڵـکەی لەژێـر دەسـەڵاتی ئەوکاتی مەغۆل بون ڕوخسەتێك بووە.

کــوڕی ســێیەمی: ناوی (ئۆکتــای، اوکتــای)بوو، لەهەمــوو کوڕەکــانی جەنگیزخان عـاقڵ و حەکیم تر بوو، بۆیە باوکی وەسیەت دەکا کە ئەو ببێـتە (خـانی گەورە) هەوڵـی ئۆکتـای زیـاتر بـۆڕاگرتنی جەمسـەرەکانی هێـزی بنەمـاڵەکەی بـوو، ئەوەشـی لێدەگێردرێتەوە کە دەیگـوت، باوکمـان بەمانـدوو بـونێکی زۆر مەمملەکەتێکی گەورەی دامەزرانـد، ئێسـتا کـاتی ئەوە هـاتوە ئاسـایش و سـەقامگیری و خۆشـی بـۆ ئەو خەڵـکە دابـین بکەیـن، لەسـاڵی

(٦٢٦) تاوەکو ساڵی (٦٣٩) لەسەر تەختی (خانی گەورە)مایەوە، لەساڵی (٦٣٩) دەمرێ، لەسنوری دەسەڵاتی (ئۆکتای) موسڵمانەکان حاڵیان باشتر بوو، یەکێك لەوەزیرەکانی ناوی (محمود یلواج) بوو، کە ڕۆڵێکی زۆر سەرەکی بینی لەپاراستنی موسڵمانان لەستەمی ئەو بوزییانەی سەرکردەی گەورە بوون لەسوپاکەی مەغۆل، لەسوپاکەی (ئۆکتای) ئەو وەزیرە توانی زۆربەی شارەکاولبووکانی موسڵمانان ئاوەدان بکاتەوە، وەکو: بوخاراو، خەواریزم و، سەمەرقەند و، ... زۆر لەشارەکانی نێوان هەردوو ڕووبار، لەهەمووش گرنگتر توانیبوی متمانەی خانی گەورە بەدەست بێنێ، بۆیە کەس نەیدەتوانی قسەکانی ڕەدکاتەوە.

تێبینی: دواتری لەژێر ناونیشانی بابەتێکی گرنگ بەدرێژی باسی ڕۆڵی گرنگی (محمود یلواج الخوارزمی) دەکەین ان شاء الله .

کوڕی چوارەمی: ناوی (تولی)بوو، ئەو کوڕەی زۆر سەرکەوتوو بوو لەبواری سەربازی، زۆربەی جەنگەکانی لە باشوری چین بوو، هەر ئەویش بوو توانی ناوچەکانی باشوری چین بهێنێتە ژێر ڕکێفی مەغۆل، خێزانی تولی دەکەوێتە ژێر کاریگەری نەسڕانییەکان و تاڕادەیەکی زۆر یارمەتێکی زۆری نەسڕانییەکانی دا.

ئەوانە کوڕەکانی (جەنگیزخان) بوون و ئەوانەش دەبنە میرات گری گەورەترین ئیمپراتۆریەت کە ڕوی زەوی بەخۆوەی بینیەوە، لەدوای مردنی کوڕەکانی جەنگیزخان، نەوەی جەنگیزخان کوڕی کوڕەکانی، دەچنە

سەرکورسی حوکم هەر کەسەو لەسنوری دەسەڵاتی خۆی، بەڵام هەر جارەو کەسێك دەکرایە خانی گەورە، بڕیاری هەڵبژاردنی خانی گەورەش لەو مەجلیسە یان دەتوانین بڵێین لەو ئەنجومەنە دەدرا کەناونرابوو مەجلیسی (قۆریلتای)، جەنگیزخان وەسیەت دەکات دوای خۆی (ئۆکتای) کوڕی ببێ بەخانی گەورە.

دوای مردنی (ئۆکتای) لەساڵی (**٦٣٩**) کۆچی کێشەیەکی زۆر ڕوو لەدەسەڵاتی مەغۆلەکان کرد، ئەو کات بە شێوەیەکی کاتی گەورە سەرکردەکانی مەغۆل لە (قەراقورم) بڕیار دەدەن خێزانی (ئۆکتای)کەناوی (تۆراکینا) بوو ئەو مەمەلەکەت بەڕێوە ببات، تاوەکو ئەنجومەنی (قۆریلتای) کۆدەبێتەوەو بڕیار لەسەر دیارکردنی خانی گەورە دەدەن، لەو ماوەیە برایەکی (جەنگیزخان) بەناوی (اوجکین) هەوڵی ئەوە دەدا کەخۆی دەسەڵات بگرێتە دەست، بەڵام هەوڵەکەی سەرناکەوێ و لەقەراقورم لەسێدارە دەدرێ، دواتر ئەنجومەنی قۆریلتای بڕیار دەدەن (کیوك)ی کوڕی ئۆکتای بکرێتە خانی گەورە.

(کیوك) خاون پەیوەندێکی یەکجار باش دەبێ لەگەڵ نەسڕانییەکان، بۆیە نەسڕانییەکان زۆریان هەوڵدا هێزەکانی مەغۆل بقوزنەوە بۆ لێدانی جیهانی ئیسلامی، (کیوك) نزیکەی سێ ساڵ لەسەر حوکم مایەوە دواتر دەمرێ، دیسان کێشەیەکی زۆر ڕوو لە قەراقورم دەکا، ئەو جارەی ئەنجومەنی قوریلتای کۆدبێتەوە بڕیار دەدەن کە (مونکۆی کوڕی تۆلی

٦٤٨-٦٥٥) کۆچی بکرێتە خانی گەورە، هۆلاکۆ برا بچوکی مونکۆیە، باتۆی کوڕی جوجی ڕۆڵێکی سەرەکی بینی لەدانانی (مۆنکۆ) وەکو خانی گەورە، باتۆ لەبنەماڵەی جەنگیزخان ڕێزێکی زۆری هەبوو، لەبەر ئەوەی ئەو بەفاتحی ناوچەکانی قۆقازو ڕوسیا هەژمار دەکرا، هێرشی مەغۆل بۆسەر بەغدا و کەوتنی خیلافەتی عەبباسی لەسەر دەستی هۆلاکۆ هەموی بەفەرمانی (مەنکۆ) بوو، بەمردنی (مۆنکۆ) ئەو جارەی کێشەیەکی گەورە کەوتە نێو خودی کوڕەکانی تۆلۆی و هەندێك لەسەرکردەکان پێیان باش بوو (قوبیلای) بکرێتە خانی گەورە هەندێکیش لەسەرکردەکان پێیان باش بوو (اریغ بوکا) ببیتە خانی گەورە، هۆلاکۆ یەکێك بوو لەوانەی پێی باش بوو (قوبیلای) برای ببێتە خانی گەورە بۆیە بەهێزێکی یەکجار زۆرەوە لەعێراق کشایەوە بۆ ئەوەی بگاتە قراقورم و پاڵپشتی (قوبیلای)بکات.

# (هۆزی ئاڵتونی، القبيلة الذهبية)و دەوڵەتی (قەفجاق)

ئەو هـۆزەی مەغـۆل بەنـاوی هـۆزی ئـاڵتونی ناسـرابوون لەبەر ئەوەی ڕەنگی ڕەشـماڵەکانیان زەردبوو، ئەو دەوڵەتەی ئەوانیش دایـدەمەزرێنن پێی دەگـوترێ دەوڵەتـی (قەفجـاق) قەفـجەق لەبنەڕەتـدا، بەپیتـی (بێـیە) نەك (فاء) واتە قەبـجەق، بەڵام دوای ئەوەی ئەو ناوە بەعەرەبی دەکرێ دەبێتە (قەفجــاق) ئەو نــاوە بەو شــێوەیە لەکتێبەکــانی مێــژووی ئیســلامی داهـاتووە.[1] ئەو هـۆزە نیشـتەجێی ئەو نـاوچەیە بـوون کەدەکەوێـتە نێـوان هەردوو ڕووباری (ڤۆلگـا و دون) کەدوو ڕوبـارن دەکەونە ڕوسیا، ڤۆڵگـا بە درێژترین ڕووباری ئەوڕوپا هەژمار دەکرێ، لەباشوری لینگرادەوە بەچەند شارێك تێدەپەڕێ، تاوەکو دەڕژێتە دەریـای (قەزویـن) ڕووبـاری (دون) یـش دەکەوێتە، باشوری خۆرئـاوای ڕوسیا، ئەو ناوچانەی نێوان ئەو دوو ڕوبـارە ئێستا ناسـراوە بەباشـوری ڕوسـیاو خۆرئـاوای ئۆکرانیـا، بەدەوڵەتـی قەفجاق (اولوس جوجی) یش ناو دەبردرێ واتە: (بەشی جوجی) کەمەبەست جوجی کــــوڕە گەورەی جەنگیزخـــانە، ئەو دەوڵەتە لەمێـــژووی بیانییەکـــان

(١) تلفيق الاخبار وتلقيح الاثار فى وقائع قزان وبلغار وملوك التتار.

بەنـاوی Great Horde) ناسـراوە، هەروەهـا بەنـاوی دەوڵەتـی مەغـۆلی باکوریش ناسراوە، لەبەر ئەوەی دەکەوتە باکوری تورکستان وڵاتەکانی نێو هەردوو ڕوبار کەمەبەست هەردوو ڕوباری جەیحون و سەیحۆنە.

## سنوری دەوڵەتی(قەفجاق)

جوجی کوڕی جەنگیزخان یەکەم کەس بوو، کە گەیشتە ئەو ناوچەیە و زۆری پێسەرسام دەبێ، بۆیە بڕیار دەدا لەو ناوچەیە بژی، لەدوای مردنی (جوجی) کوڕەکەی کەناوی (باتۆ)یە، ناوچەکانی (جەرکەس) کەهۆزە تورکەکان بوون لەناوچەی باکوری (قۆقاز) دەژیان ئەوانەو (بولغار) کە ئەو هۆزانە بوون، لەدەوروبەری ڕوباری ڤۆلگای ڕوسیا دەژیان کەدواتر دەبن بەدوو بەش، بەشێکیان پێیان دەگوترێ (بولغاری ڤۆڵگا) وبەشێکی تریان دەچنە ناوچەی (بەلقان) کەدواتر دەوڵەتێکیان دامەزراند بەناوی (بولگاریا).

هەموو ئەو شوێنانە دەکەوێتە ژێر دەسەڵاتی(باتۆ) دواتر کە (بەرەکەخان) دەچێتە سەرتەختی دەسەڵات سنوری وڵاتەکەی هەندە فراوان دەبێ، کەلە خۆرهەڵات لەڕوباری (ارتیش) دەستپێدەکات ئەو ڕووبارەی دەکەوێتە سنوری چین و ڕوسیا لەوێوە تاوەکو ڕووباری ڤۆڵگا لە خۆرئاوا، وەسنوری دەوڵەتەکەی لەباکور لەڕوسیاوە دەستی پێدەکرد، تاوەکو دەگەیشتە دەوڵەتی ئێلیخانییەکان لە باشور کە ئێران و ئاسیای ناوەڕاستی دەگرتەوە، بەوەش دەتوانین بڵێین ئەو دەوڵەتە لە نەخشەی جوگرافی ئەوڕۆ (ڕوسیاو،

ئۆكرانیاو، سیبریاو، بەشێكی ئێران و، اوزباكستان و، تركمانستانی) دەگرتەوە ئینجا (بەرەكەخان) شارێكی گەورەش دروست دەكات بەناوی (سرای، سەرای) كەدەبێتە پایتەختی هۆزی ئاڵتونی.

(بەرەكەخان) دەیان زانای گەورە لەو شارە كۆدەكاتەوە بۆئەوەی مەغۆلەكان فێری شەریعەتی ئیسلام بكەن، جگە لەو سنورە دەوروبەری ڕووبارە سەرەكییەكانیشی دەگرتەوە لەباكور تاوەكو فنلەندا لەخۆرئاواش پۆلەندا، ئەو دەوڵەتە توانی هەموو ئەو ناوچانە حوكم بكات لەساڵی (٦٣٦) تاوەكو ساڵی (٨٨٦)ی كۆچی.

## ئیسلام چۆن گەیشتە ناوچەی بولغار؟

ئیسلام لەسەردەمی خەلیفە (المقتدر بالله ٢٩٥-٣٢٠) كۆچی دەگاتە ناوچەی بولغار زۆر جار بەناوچەی سەقالیبەش ناودەبردێن، هۆكاری موسڵمان بوونی ئەو ناوچەیە دیار نییە، بەڵام لەسەردەمی، خەلیفە (المقتدر بالله) پادشای سەقالیبەكان واتە بولغارەكان كەناوی (المس بن سلكی بلكوار یان، بلطوار)بوە.

ئەو پادشایە وەفدێك دەنێرێتە بەغداو داوا لەخەلیفە دەكات، خەڵكانێك بنێرێتە مەملەكەتەكەی بۆئەوەی فێری ئیسلامیان بكات، ئەوەبوو خەلیفە بەدەم بانگەوازەكەیان دەڕوات و وەفدێك دەنێرن، ئەو وەفدە چەندین زانای ئاینی و بیناسازی تێدایە بۆئەوەی خەڵكی ئەو ناوچەیە فێری دین بكەن و لەهەمان كاتدا، مزگەوتیان بۆ دروستبكەن، وەفدەكە كەسێكیان لەگەڵ بووە

بەناوی (احمد کوڕی فەزڵان کوڕی عەبباس کوڕی ڕاشید) خەلیفە داوای لێدەکات هەر لەکاتی دەرچونیان لەبەغداوە تاوەکو دەگاتە مەملەکەتی سەقالیبە، هەر هەمووی بۆ تۆمار بکات (احمد بن فضلان) باسی گەشتەکە دەکا لە دەرچونیان لەبەغداوە کە لەمانگی سەفەری ساڵی (٣٠٩) کۆچی بەغدا جێدەهێڵن و لە ١٢ مانگی محرمی ساڵی (٣١٠) کۆچی دەگەنە مەملەکەتی بولغارەکان ئەو مێژووە تاوەکو ئێستا لە ویلایەتی تەتارستانی سەربەڕوسیا کراوەتە پشوی فەرمی و وەکو ڕۆژیکی موبارەك سەیر دەکرێ.

ئەو گەشتە ئێستا چاپکراوە بەناوی (رسالة ابن فضلان) یان دەتوانین بڵێین گەشتەکەی (ئیبن فەزڵان) ئەوەی جێی ئاماژەیە دوای موسڵمان بوونی مەلیکی بولغار ناوی خۆی دەگۆڕێ بۆناوی (جعفر کوڕی عبداللە) بەناوی خەلیفە المقتدر باللە، کەوابوو ئیسلام زۆر پێش مەغۆلەکان گەیشتۆتە ئەو ناوچەیە.

## بەرەکە خان کێ بوو؟

(بەرەکە خان کوڕی جوجی کوڕی جەنگیزخان) لەساڵی (٦٠٣) کۆچی لەدایك بووە و لەساڵی (٦٦٥) کۆچی وەفاتی کردوە لەساڵی (٦٥٢) کۆچی دەبێتە سوڵتانی ناوچەکە، (بەرەکەخان) بەر لەوەی ببێتە سوڵتان لەساڵی (٦٤٨) بۆتە موسڵمان هەندێکیش لەسەرچاوەکان دەڵێن هەر لەمناڵییەوە موسڵمان بووە لەبەرئەوەی دایکی کەناوی (ریسالە، رسالە) بوو

کچی سوڵتان محمد خەواریزم شاه بوه کاتی خۆی بەدیل دەگیرێ و دەدرێتە (جوجی) ئینجا خاتوو ریساله کەبەرەکە خانی له جوجی دەبێ، هەر لەسەرەتاوە لەسەر خۆشەویستی خواو پێغەمبەرو ئیسلام گەورەی کردبوو، واتە ئەو ئافرەتە (ریساله خان) سەرەڕای ئەوەی بەکەنیزەك دەگیرێ و دەدرێتە کوڕی کافرێکی وەکو (جەنگیزخان) کە بکوژی بنەماڵەکەی بووە، بەڕۆڵی خۆی هەڵساوەو توانیویەتی لەسێبەری ئەو بنەماڵە کافرە مناڵەکانی فێری ئیسلام بکات، دوای ئەوەی دەبێتە سوڵتان نازناوی (ابوالمعالی ناصرالدین) هەڵدەگرێ.[1] بەرەکەخان برایەکی تری هەبوو بەناوی (باتۆ) باتۆش کوڕێکی هەبوو بەناوی (سرتاق) سورتاق دەبێتە نەسڕانی و زۆر جار دەکەوتە گفتوگۆ لەگەڵ (بەرەکەخانی) مامی و پێی دەگوت تۆ موسڵمانی و منیش نەسڕانیمە، موسڵمان بوونی بەرەکەخان کاریگەرێکی یەکجار زۆری لەسەر ناوچەکە هەبوو لەهەمان کاتدا خوای گەورە کردیە هۆکارێك کە موسڵمانانی ئەو ناوچە فراوانە لەژێر دەسەڵاتی ئەو پیاوە بحەسێنەوە و مەغۆلەکان چیتر نەیان توانی مزگەوتەکان بڕوخێنن و قورئان بسوتێنن و موسڵمانان بکوژن، بۆیە موسڵمان بوونی ئەو پیاوە ڕەحمەتێکی گەورە بوو بۆ ئەو ئوممەتە.

هەندێکی تریش لەسەرچاوەکان موسڵمان بونی (بەرەکەخان) دەگێڕنەوە بۆ شێخێکی صۆفی بەناوی (سیف الدین باخرزی، سەیفەددین باخەرزێ) ئەو

---

(١) احمد حطیط حروب المغول، لاپەڕە ٦٧.

پیاوە لە ناوچەی بوخارا بووە ناوی (سعیدی کوڕی المطهر کوڕی سەعید)ە نازناوی (ابوالمعالی)یە، گۆڕەکەی لە دێی (فتح ئاباد)ی سەربەشاری (بوخارا)یە، دوای ئەوەی (بەرەکەخان) سەردانی قەراقورم دەکات، لەکاتی گەڕانەوەی ناوی شیخ سەیفەددین دەبیستێ و سەردانی دەکات، خوای گەورە لەسەردەستی ئەو شێخە هیدایەتی بەرەکەخان دەدات.[1] لەدوای ئەوە زانایەکی تر بەناوی (نجم الدين أبو الرجاء مختار بن محمود بن محمد الزميني الخوارزمي) کەلەساڵی (٦٥٨) کۆچی وەفاتی کردوە، ئەو زانایە حەنەفی مەزهەب بووە، کتێبێك دەنوسێ بۆ (بەرەکەخان) بەناوی (الرسالة الناصرية) تێیدا باسی عەقیدەی ئیسلامی دەکاو وەڵامی گومانی نەسرانی و یەهودییەکان دەڕەوێنیتەوە بەشی سەرەکی کتێبەکەی بەڵگە هێنانەوەیە لەسەر ڕاستی پێغەمبەرایەتی پێغەمبەری خۆشەویستمان (صلى الله عليه وسلم)، ئەو کتێبە شوێنی خۆی بەتەواوی دەگرێ و (بەرەکەخان) ڕایدەگەیەنێ کە ئەو پاسەوانی پەیامەکەی پێغەمبەری خوایە (صلى الله عليه وسلم)، بەوەش قۆناغێکی تازەی ئاوەدانی کۆمەڵگای موسڵمانان دەستپێدەکاتەوە دوای ئەو کاولکارییەی مەغۆلەکان بەسەر ئەو ئوممەتەیان هێنا.

ئینجا شێخ باخەرزێ داوا لە(بەرەکەخان)دەکات کەبەیعەت بەخەلیفەی موسڵمانان بدات (بەرەکەخان) نامە بۆ خەلیفە موستەعصیم دەنێرێ و

---

(١)کتێبی(تلفيق الاخبار وتلقيح الاثار في وقائع قزان وبلغار)، بەرگی یەکەم لاپەڕە ٤٠٢.

بەیعەتـی پێـدەدا، ئەوە بەر لەکەوتنـی بەغـدایە، هەر لەبەر ئەوەش بـوو ئەو کاتەی هۆلاکۆ بەڕێکەوت بۆ گرتنی (بەغدا) بەرەکەخان زۆری پێناخۆش بوو، بەڵام هۆلاکۆ توانیبوی پشتگیری خانی گەورە بەدەست بێنێ بۆ ئەو مەبەسـتە، ئینجـا یەکێـك لەکێشـە هەرەگەورەکـانی نێـوان (هۆلاکـۆ) و (بەرەکەخـان) ڕووخانـدنی خیلافەتـی ئیسـلامی بـوو، بەرەکەخـان بڕیـای جەنـگ لەسـەر هۆلاکـۆ دەدات لەبەر ئەو تاوانـانەی دژ بەو ئـوممەتە ئەنجامی داوە (بەرکەخان) بەچەند کارێکی زۆرگرنگ و گەورەش هەستا وەکو دانانی وەزیرێك بەناوی (شرف الدین) کە وەزیرێکی موسڵمان بوو، پیـاوێکی داناولێهـاتوو بـوو، چەنـد زمـانێکی زانیـوەو زۆر پەرۆش بـوو بـۆ کارەکانی و دەیان مامۆستای ئاینی هێنا بۆ ناوچەکە، کە ئەوەش یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکییەکان کە مەغۆلی ناوچەکە زوو موسڵمان بن، ئینجا دەرگاشـی کـردوە بەڕووی ئەوانەی لەسـتەمی هۆلاکـۆ ڕادەکەن، ئەوەش دیسان خاڵێکی تری گرنگ بوو لەبەر ئەوەی زۆر لەزاناو مامۆستایانی ئایـانی خۆیـان ڕزگـار کـرد لەسـتەمی هۆلاکـو و گەیشـتنە مەملەکەتەکەی (بەرەکەخان).

## خاڵێکی گرنگ پێم خۆشە سەرنجی خوێنەری بۆ ڕاکێشم

سـەرچاوە مێژووییەکـانی شـیعە کەباسـی کێشـەی نێـوان بەرەکەخـان و هۆلاکۆ دەکەن، دەڵێن هۆکارەکەی لەسەر غەنیمەوداهاتی ئەو وڵاتانە بووە، نەوەك لەسـەر ئیسـلام و موسـڵمانان بیـت، بـۆیە ئەوان زۆر بەخـراپ باسـی خـودی بەرەکەخـان دەکەن، هۆکـاری ئیسـلام بـوونی مەغـۆلیش دەگێـڕنەوە

بۆ (نوسەیرەدینی توسی و ئیبن موتەهەری حللی) کە ئەوان کاریگەری زۆر ئەرێنیان هەبووە لەسەر مەغۆل، بەهیچ جۆرێکیش باسی هۆزی ئاڵتونی و تەتارستان ناکەن، ئێمە لەباسی گرتنی بەغدا بە بەڵگەوە ئاماژەمان بەوەکرد، کەسەرانی شیعە ئەو کاتیش خیانەتی زۆر گەورەیان کرد، ئەو شوێنانەی لەعێراقی ئێستا کاوڵ بوو بەدەستی مەغۆل تەنها ناوچە سوننییەکان بوو وەکو هەولێرو ئەنبارو بەغداو بەسرە، سەرانی شیعە هەر زوو پێشوازیان لەهێزەکانی مەغۆل کرد، بۆیە بەرەکەخانیش بێ بەش نەبووە لەدرۆو بوهتانەکانی شیعە، ئێستاش کەمێژوو دەخوێننەوە زۆریان پێناخۆش بوو بەرەکەخان گەورەترین هاوپەیمانی لەگەڵ دەوڵەتی مەمالیك بەست، ئەوان پێیان خۆش بوو بەرەکە خان لەسەر دینی مەغۆلەکان بمابایەوە باشتر بوو نەك ببێتە موسڵمانێکی سوننی مەزهەب.

## شەڕی نێوان (بەرەکەخان) و (هۆلاکۆ)

بەرەکەخان تاوانەکانی هۆلاکۆی زۆر بەگەورە دەزانێ و پێی وابو دەبێ سنورێك بۆ دەسەڵاتی هۆلاکۆ دابنرێ، بۆیە لەساڵی (٦٦٠) هێزێك دەنێرێتە دەربەندی شێروان کەئێستا دەکەوێتە خۆرهەڵاتی قۆقاز، لە وڵاتی ئازەربایجان لەنزیك (باکۆ)ی پایتەخت، سوپاکەی بەرەکەخان بەسەرکردایەتی کەسێك بوو بەناوی (نوغای) کەیەکێك بوو لەسەرکردە سەربازیەگەورەکانی بەرەکەخان، لەگەڵ بەرەکەخانیش موسڵمان ببوو، هۆلاکۆش سوپایەك دەنێرێ بەسەرکردایەتی (شیرامون نویان) ئەو دوو سوپایە دەگەنە یەك، سوپاکەی بەرەکەخان سەرکەوتنێکی گەورە بەدەست دێنێ و دەتوانن زۆربەی سوپاکەی هۆلاکۆ لەناو ببەن، لەدوای ئەوە هۆلاکۆ هێزێکی زۆر گەورەتر ڕەوانەی ناوچەکە دەکا بەسەرکردایەتی (تابای نویان) ئەو جارەیان سوپاکەی (بەرەکەخان) دەشکێ، کەهۆلاکۆ بەوە دەزانێ هەوڵدەدا ئەو سەرکەوتنە بقۆزێتەوە، بۆیە لەساڵی (٦٦١) خۆشی بەسوپایەکی گەورە دەچێتە ناوچەکەو بەو ئومێدەی تەواوی ناوچەکە لەدەسەڵاتی (بەرەکەخان)دەربێنن، بەرەکەخان کەبەوە دەزانێ فەرمان دەدا کە پێش هێزەکانی هۆلاکۆ چۆڵ بکەن، هۆلاکۆ دەگاتە سنوری دەسەڵاتی (بەرەکەخان) و دەبینێ هیچ هێزێکی لەپێش نییە ئافرەت و مناڵ بەجێماون، بۆیە دەست دەکەن بەکوشتنی ژن و منال و تالان کردن، لەو کاتەی تەواوی سوپای (هۆلاکۆ) بەو تاوانانە خەریکن، بەرەکەخان

بەهێزێکی گەورە گەمارۆی هێزەکەی هۆلاکۆ دەدات، ئەو کات شەڕێکی یەکجار گەورە دەکەوێتە نێوان هەردوو سوپا، هەر لەبەیانییەوەتاوەکو ئێوارە بەردەوام دەبێ، لەدوای ئەوە سوپاکەی هۆلاکۆ دەشکێن و خەڵکێکی یەکجار زۆریان لێ دەکوژرێ هەندێکیان هەوڵی کشانەوە دەدەن، دەکەونە بۆسەی سوپاکەی (بەرەکەخان) ئەوانەی کەڕاشیان کردبوو لە ڕووباری (ترك) دەخنکێن، ئەو کات دونیا ئەوەندە سارد بوو ئەو ڕووبارە بەستابوی، لەکاتی پەڕینەوەی سوپاکەی هۆلاکۆ، شەختەی ڕووبارەکە دەشکێی و ئەوەی لە شکەستەکە ڕزگاری بوو لەو ڕووبارە خنکا، ئەو شەڕە یەکێکە لەگەورەترین شەڕی نێوان هۆلاکۆ و بەرەکە و گەورەترین شکەستە کەبەسەر سوپاکەی هۆلاکۆ هات، هۆلاکۆ لەعنەتی خوای لێبێ خۆیی و دەورو بەرەکەی ڕزگاریان دەبێت، ئینجا کە (بەڕەکەخان) دەگاتە ناوچەکە سەیری ئەو هەموو کوشتارە دەکات، دەڵێ لەعنەتی خوا لەهۆلاکۆ خۆ ئەوە خوێنی مەغۆل بەدەستی مەغۆل دەڕژێ. ئەگەر ئێمە یەك دەنگ بواین تەواوی جیهانمان دەگرت، شوێنی ڕووبەڕووبونەوەی سوپای بەرەکەخان و هۆلاکۆ ئەو شوێنانە بوو کەئێستا دەکەوێتە نێوان داغستان و جۆرجیا، بەتایبەتی نێوان هەردوو ڕووباری (الکر، کور) کە لەباشوری داغستانی ئێستایە، ڕووباری (ترك، تیرك) کە لە شاخەکانی قۆقازەوە هەڵدەقوڵێ و دڕژێتە دەریای (قەزوین، خەزەر) ئەو شوێنانە سنوری دەسەڵاتی هۆلاکۆ و بەرەکە خان بوە.

## هەوڵێکی تری (بەرەکەخان) بۆ لێدانی(هۆلاکۆ)

بەرەکەخـان وەکـو دوژمنێکـی سەرسـەختی هۆلاکـۆ زۆر حەکیمـانە شـەڕەکانی دەکـات، ئەو کـاتەی هۆلاکـۆ بـۆ گرتنـی بەغـدا کەوتە ڕێ بەفەرمـانی خـانی گەورە، دەبـوایە هەمـوو بنەماڵەکـان پشـتگیری سـوپاکە بکەن، بۆیە بەشێك لەسوپاکەی (بەرەکەخان) هـۆزی ئـاڵتونی بەشداری ئەو سوپایەیان کردوو لەژێر فەرمـانی هۆلاکۆ بـوون، لەسـاڵی (٦٦٠) کە شـەڕ دەکەوێتە نێوان (بەرەکەخان و هۆلاکۆ) و سوپای هۆلاکۆ دەشکێ، هۆلاکۆ زۆر بێتـاقەت دەبـێ و لەبەر ئەوەی لەمـاوەی دوو سـاڵ دووشکەسـتی زۆر گەورە بەسـەر سـوپاکەی داهـاتووە، بەدەسـتی زاهیـر بێبـرس لە باشـور و بەرکەخان لە باکور.

هۆلاکـۆ هەوڵـدەدات هەر چۆنێك بێت، سـوپاکەی ڕێـك بخـاتەوەو تـۆڵە لە(بێبرس و بەرەکەخـان) بکـاتەوە، لەو مـاوەیە بەرەکەخـان هەواڵ دەنێرێ بۆ ئەو بەشـە سـوپایەی لەعێـراق و شـام کە لەژێـر فەرمـانی هۆلاکـۆ دان هەرچۆنێك بێت خۆیـان ڕزگـار بـکەن ئەگەر نەیـانتوانی بـگەنەوە شـوێنی خۆیان، باهەوڵبدەن بچنەمیسرو خۆیان بگەیەننە سوپاکەی زاهیر بێبرس.

هەوڵێکی تری زۆر گرنگـی (بەرەکەخـان) ئەوەبـوو کەبەنهێنـی پەیوەنـدی دەکـا بەسـەرکردەیەك بەنـاوی (جـلال الـدین بـان الـدوادار) لەسـەر ئەوە ڕێـك دەکەون کە (جلال الدین) بچێتە لای هۆلاکۆ و پێشنیاری ئەوە بکا، کە ئەو واتە (جــلال الــدین) هەڵدەســتێ بەکــۆکردنەوەی ســەربازەکانی نــاوچەی

(قەفجاق) ئەوانەی لەشام و عێراقن ئینجا سوپایەك لەوانە پێك بهێنن بۆشەڕی (بەرەکەخان) دوای وەرگرتنی یارمەتێکی زۆر لەهۆلاکۆ سوپایەکی گەورە پێك بێنن و ئەو سوپایە بەرەو شام بەڕێ بکەوێ، لەوەێوە خۆیان بەدەست میسرییەکان بدەن، پلانەکەیان ئاوابوو.

ئەوەبوو (جلال الدین) دەچێتە لای هۆلاکۆ و پێشنیاری ئەوەی بۆ دەکا کە سوپایەك لەخەڵکی ناوچەکە پێکبهێنێ و بچن بۆ شەڕی (بەرەکەخان) هۆلاکۆ ئەو پێشنیارەی زۆر پێچاك دەبێ و فەرمان دەکاتە پادشاو مەلیکەکانی ناوچەی جەزیزە و عێراق کە یارمەتی (جلال الدین) بدەن، بۆ ئامادەکردنی ئەو سوپایە، جەلالەدین پارەیەکی یەکجار زۆری بۆ کۆدەبێتەوە لەگەڵ سوپایەکی گەورە، ئینجا جەلالەدین بەسوپاکەی دەڵێ: بەر لەوەی عێراق جێبهێڵین دەبێ سەردانی گۆڕی ئیمام حوسەین بکەین ڕەزاو ڕەحمەتی خوای لەسەربێ، دوای سەردانەکەی گۆڕی ئیمام حوسیەن، سوپایەکەی جەلالەدین لە ڕوباری دیجلە دەپەڕنەوەو دەکەونەڕێ بۆ ناوچەی (عانە) ئەو کات جەلالەدین بە سوپاکەی ڕادەگەیەنێ ئێوە خەڵکی (قەفجاقن) حەز ناکەم بەکوشتان بدەم لەپێناو (هۆلاکۆ) یەکی کافر و ستەمکار، بۆیە من بڕیارم داوە بچمە شام لەوێوەش دەچم بۆ میسر، ئەوەی حەزی لێیە بالەگەڵمان بێت ئەوەی حەزناکات بابگەڕێتەوە، زۆرینەی سوپاکە بەگەڵ (جلال الدین) کەوتن، چون بۆ شام و لەوێوەش چون بۆمیسرو لەلایەن سوڵتان بێبرس بەگەرمی پێشوازیان لێکرا، هۆلاکۆ

کە بەوەی زانــی خەمێکــی یەکجــار گەورەی پێخــوارد، بەردەوام بیــری لەو شکەستانە دەکرد کەیەك بەدوای یەك بەسـەری دادێ، هەربۆیە یەکێك لەو هۆکارانەی توشی نەخۆشی دەکات خەمی ئەو شکەستە گەورانەیە.

مەغۆلەکـان کەدەزانـن بەگەرمـی پێشـوازیان لێدەکرێ لەمیسڕ نـاوە نـاوە هەندێکیان ڕیـزی سـوپای هۆلاکۆیـان جێدەهێشت و دەچـونە میسـڕو دەبـونە موسـڵمان، سـوڵتان زاهیـر بێبـرس زۆر حەکیمـانە مـامەڵەی لەگەڵ ئەو مەلەفەکـرد و دەرگـایەکی گەورەی بەڕووی مەغۆلەکـان کـردەوە کەئەوەش شکستێکی تری گەورە بوو بۆ هۆلاکۆ.

## مردنی (هۆلاکۆ) لەساڵی (٦٦٣)کۆچی

دوای ئەو شکەسـتە یەك بەدوای یەکەی بەسـەر هۆلاکـۆ دێ، لەلایەك بەرەکەخان و لەلایەکی تر زاهیر بێبرس، هۆلاکۆ دەگەڕێتەوە شاری تەبرێز، بەو ئومێدەی بتوانێ جارێکی تر سوپاکەی ڕێکبخاتەوەو هێرش بکـاتە سەر میسڕو دەوڵەتەکەی بەرەکەخان، بەڵام هۆلاکۆ لەو بەینە نەخۆش دەکەوێ و مەملەکەتەکەی دابەش دەکات.

(عێـراق و خوراسـان و مازەنـدەران) دەداتە کـوڕەگەورەکەی (ئەبەقاخـان و ئـاران و ئازەربایجـان) دەداتە (یەشـموت)ی کـوڕی، مەملەکەتـی (ڕۆمـیش کەمەبەسـت تورکیـای ئێسـتایە) دەیـداتە(موعینەددین پەروانە) کە پێشـتر وەزیری سەلجوقییەکان بوو، دواتر دەچێتە ڕیزی مەغۆلەکان و دڵسۆز دەبێ بۆ هۆلاکۆ.

ورده ورده نەخۆشیەکەی هۆلاکۆ توندتر دەبێ تاوەکو لەساڵی (٦٦٣) کۆچی لەنزیك دەریاچەی (ئورومییە) لەتەمەنی (٤٨) ساڵی دەمرێ نەفرەتی خوای لەسەربێ.

لەدوای مردنی هۆلاکۆ (دوقوزخاتون)ی خێزانی، بەڕاوێژکاری لەگەڵ (ڤارتان) کە قەشەیەکی گەورەی نەسرانی بوو، لەگەڵ گەورە سەرکردە سەربازییەکان کۆدەبێتەوە و بڕیار دەدەن (ئەبەقای) کوڕی هۆلاکۆ بچێتە شوێنی باوکی و دەبێتە سوڵتانی دەوڵەتی ئێلیخانییەکان.

وەلەبەرئەوەی (دوقوزخاتون) ببوە نەسرانی، قەشەو گەورە پیاوانی نەسرانی لەسەردەمی هۆلاکۆ دەسەڵاتێکی زۆریان هەبوو، بەتایبەت نەسرانییەکانی ئەرمینیا و ئازەربایجان، ئەوانە توانیبویان کڵێسەیەکی زۆر دروست بکەن و هەندێك لەمزگەوتەکانیشیان کردبوە کڵێسە، دەسەڵاتی هۆلاکۆیان تەواو قۆزتبوەوە بۆدژایەتی کردنی موسڵمانان، نەسرانییەکان وەکو فریادرەسێك سەیری هۆلاکۆیان دەکرد، ئەبەقای کوڕی هۆلاکۆش گەرچی نەبوبوە نەسرانی، بەڵام لەژێر کاریگەری دایکی، سۆزو بەزەییەکی زۆری بەرامبەر بە نەسرانییەکان هەبوو.

## وەفاتی (بەرەکەخان) لەساڵی (٦٦٥) کۆچی

دوای تەمەنێکی زۆر لە جیهادکردن دژ بەهۆلاکۆ لەمانگی ڕەبیعی دووەم ساڵی (٦٦٥) کۆچی بەرەکەخان وەفات دەکا ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ، لەدوای بەرەکەخان برازاکەی بەناوی (منگوتمر) دەچێتە سەر کورسی حوکم، بەرەکەخان ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ زۆر بەکەڵکی موسڵمانان هات و لێك حاڵی بونێکی زۆری هەبوو لەگەڵ زاهیر بێبرس، هەردووکیان پێکەوە توانیان تاڕادەیەکی زۆر لەدەسەڵاتی هۆلاکۆ کەم بکەنەوە.

## ئەبەقاخان(٦٦٣ – ٦٨٠)کۆچی.

دوای ئەوەی ئەبەقاخانی کوڕی هۆلاکۆ دەبێتە سوڵتان، یەشموتی برای دەکاتە حاکمی دەربەند شروان و بیابانی مۆغان کەدەکەونە (ئازەربایجان)ی ئێستا، وە مەملەکەتی ڕۆم کە مەبەست ترکیای ئێستایە تاوەکو سنوری شام تەسلیم بە دوو سەرکردەی مەغۆل دەکات، عێراق وئیقلیمی فارسیش تەسلیم بە (سنجاق نویان) دەکات، ئەبەقاخان مەیلێکی یەکجار زۆری هەبوو بۆ نەسڕانییەت، هۆلاکۆش بەر لەمردنی داوای کچی ئیمپراتۆری ڕۆمی خۆرهەڵاتی کردبو ئیمپراتۆر میخایل بالیولوجوس (٦٥٨-٦٨١) کۆچی ڕازی دەبێ و (مەریەمە)ی کچی خۆی بۆ هۆلاکۆ دەنێرێ، مەوکیبی کچی ئیمپراتۆر لەقوستەنتینییەوە بۆ ئێران بەڕێدەکەوێ، ئەو

کاتەی کاروانەکە دەگاتە ئەنادۆڵ هەواڵی مردنی هۆلاکۆیان پێدەگات، بەڵام لەبەر سەختی ناوچەکە ناگەڕێنەوەو دەچن بۆ ئێران، ئەوە بوو ئەبەقای کوڕی هۆلاکۆ ئەو کچە دەخوازێ، بەوەش نەسرانییەکان لەسەرچاوەی دەسەڵات و سەنتەری بڕیار زۆر نزیك دەکەونەوە، بۆیە بەهەموو جۆرێك هەوڵدەدەن هێزی مەغۆلەکان بقۆزنەوە بۆ لێدانی موسڵمانان و قودس و دەورو بەری داگیر بکەن، لەهەمان کاتدا ئەبەقا بونی نەسرانییەکان لەدەوروبەری شام بەهەلێکی گەورە دەزانێ و ئەویش پلانڕێژی دەکات بۆ لێدانی مەمالیکەکانی میسر، پەیوەندێکی زۆر چاك دروست دەبێ لەنێوان (ئەبەقا)و خاچپەرستەکان، هەر بۆزانیاری خوێنەر گرنگە بەکورتی باسی ئیمارەتی ئەرمینیای بچوك (ارمينيا الصغرى) بکەین لەبەر ئەوەی ئەو ئیمارەتە نەسرانییە هەردەم هەڕەشەیەکی گەورە بوە بۆ سەر جیهانی ئیسلامی.

# کورتەیەك دەرباری ئیماڕەتی (ئەرمینیای بچوك، أرمينيا الصغرى)

سەرەتا ئەرمینیای گەورە بوونی هەبوو، لە (وان) و (بەدلیسەوە) تاوەکو بەحری قەزوین و جۆرجیاو دەوروو بەری هەر هەموی پێی گوتراوە (ئەرمینیا) خەڵکی ئەو ناوچەیە زۆربەیان نەسڕانی بووینە، دواتر ئەو ناوچانە ئیسلامی پێدەگاو موسڵمانان ئەو ناوچە فراوانە لەدەست فارس و بێزەنتییەکان دەردێنن لەسەر دەستی (عیازی کوڕی غەنەم) لەساڵی (١٩)کۆچی بۆیە (عیاز) وەکو یەکەم سەرکردەی ئیسلامی و فاتحێکی گەورە گەیشتە ئەرمینیا، لەسەردەمی ئەمەوییەکان و عەبباسییەکان، ئەرمینیا و ئازەربایجان و ناوچەی جەزیرەو موصل هەر هەمووی وەکو یەك ویلایەت سەیر دەکرا.

بەڵام دەبێ ئەوە بزانین کە ناوچەی ئەرمینیا و جۆرجیا ببوەشوێنی ململانێی موسڵمانان و بێزەنتییەکان، واتە ئەو ناوچانە سەقام گیری بەخۆوە نەبینی نە لەژێر سێبەری بێزەنتەکان وە نەموسڵمانانیش توانیان بەتەواوی ناوچەکە کۆنترۆل بکەن، دوای ئەوەی دەوڵەتی عەبباسی لاواز دەبێ و خەلیفە دەکەوێتە ژێر کۆنتڕۆڵی بوەیهییەکان، بێزەنتییەکان دەتوانن زۆرێك لەو ناوچانە بگێڕنەوە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، تاوەکو سەدەی پینجی کۆچی

واتە یـانزەی زاینـی ئەو کـات سـەلجوقییەکان وەکـو هێزێکـی گەورە دێـنە مەیدان و لە ناوچەکە دەردەکەون، ئینجا سەر لەنوو ئیعلانی جیهاد دەکەن دژ بەبێزەنتیەکـان و گێـڕانەوە ئەرمینیـا بـۆ ژێـر دەسـەڵاتی خۆیـان، سـەلجوقییەکان لەزۆربەی جەنگەکانیـان دژ بەبێزەنتییەکـان سـەردەکەون دەتوانن بەشێکی زۆری ئەرمینیا کۆنترۆڵ بکەنەوە، بەتایبەت دوای ئەوەی پایتەختی خۆیان لە (نەیسابوور) دەگوازنەوە بۆ (ئەلرەی) کەهەردوو شار دەکەونە ئێرانی ئێستا.

# جەنگی مەلازگرد لەکوردستانی باکور نزیك دەریاچەی (وان) لەساڵی(٤٦٣) کۆچی

دوای ئەوەی سەلجوقییەکان توانیان چەند ناوچەیەکی ئەرمینیا ئازاد بکەن کە بووە نیگەرانی ئیمپراتۆریەتی بیزەنتی، بۆیە ئیمپراتۆر (ڕۆمانوسی چوارەم) بڕیار دەدا کەسنورێك بۆ دەسەڵاتی سەلجوقییەکان دابنێ و سوێند دەخوا کە دەبێ هێرشێکی گەورە بکاتە سەر سەلجوقییەکان تا دەگاتە شاری ئەلرەی، پایتەختی سەلجوقییەکان، ئیمپراتۆر دەتوانێ سوپایەکی ئەوەندە گەورە ئامادە بکا سەرچاوە مێژووییەکان دەڵێن ژمارەی سوپاکەی لە (٢٠٠) هەزار تاوەکو (٣٠٠) هەزار کەس دەبوو، سوپاکەی پێکهاتبوون لە ڕوس و جۆرجی وئەرمەن و بولغارەکان، ئەو سوپاگەورەیە لە (قوستەنتینییە) بەڕێ کەوت بۆگێرانەوەی ئەو شوینانەی سەلجوقییەکان ئازادیان کردبوو لەهەمان کاتدا بەپێی ئەو نەخشەیەی ئەوان کێشابویان دەچن بۆ داگیرکردنی پایتەختی سەلجوقییەکان کەدەکاتە شاری (ئەلرەی).

ئەو کاتە سوڵتان(ئەلب ئەرسەلان، الب ارسلان) تازە لەحەلەب گەڕابویەوە بۆ ئازەربایجان، لەنەخشەشی دانەبوو سوپایەکی گەورە بەوشێوەیە بەسەرپەرشتی خودی ئیمپراتۆر هێرش بکاتە سەر وڵاتەکەی، بۆیە زۆر

بەپەلە ئەوەی بۆی کۆدەکرێتەوە نزیکەی پازدە هەزار کەس دەبێ، سەرەتا سوڵتان ئەلب ئەرسەلان ویستی لەڕێی دانوساندن ئەگەری ڕوو بەڕوو بونەوە دوا بخا، بۆیە وەفدێکی نارد بۆ لای ئیمپراتۆر، بەڵام وەڵامی ئیمپراتۆر ئەوە بوو هیچ ئاگر بەستێك لەئارادانییە تاوەکو دەگەینە (ئەلرِرەی)واتە پایتەختی سەلجوقییەکان، سوڵتان ئەلب ئەرسەلان بەو هەڵوێستە زۆر نیگەران بوو، شێخەکی هەبوو بەناوی (أبو نصر محمد کوڕی عبدالملکی بوخاری حەنەفی) سوڵتان دەچێتە لای و مەشورەتی پێدەکا، ئەویش پێی دەڵێ: تۆ دەجەنگی لەپێناو دینی خوا، خوای گەورەش بەڵێنی پاراستنی ئاینەکەی داوە، ئومێد دەکەم ئەو ڕووبەڕوو بوونەوەیە ببێتە سەرکەوتنێکی گەورە بۆموسڵمانان و لەسەر دەستی تۆ تۆماربکرێ، واچاکە ڕۆژی هەینی ئەو کاتەی خەڵکی لەوتاری هەینین، ئەو کات ڕووبەڕووی سوپای بێزەنتییەکان ببیتەوە، ئەوکات تەواوی موسڵمانان لەدواعا دان بۆتۆ و سوپاکەت، دوعا ئەو کاتیش قەبوڵە وهەموو موسڵمانان لەخوای گەورە دەپاڕێنەوە کەسەرکەوتن بکاتە بەشتان و تەنها ئەویش پشت و پەناتان بێت.

سوڵتان دڵی زۆر خۆش دەبێ بەئامۆژگاری شێخەکەی ئەوە تەنها مەشورەت نییە، بەڵکو وەعزێکی زۆر گەورەشە بۆیە ناخی سوڵتان دەهەژێنێ و دەستدەکاتە گریان و ڕووی لەخوای گەورە کرد و زۆر لەخوای گەورە پاڕایەوە.

سوڵتان بەرگێکی سپی کردە بەرو خۆی بۆن خۆشکرد و گوتی ئەگەر کوژرام ئەوە کفنم بێت و زۆربەی سوپاکەی بەو شێوەیە خۆیان ئامادەکرد و بەڕێ کەوتن بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بێزەنتییەکان.

سوڵتان هەر لەسەرتای خۆ ئامادەکردنی تیرو کەوانەکەی فڕەدەدا و تەنها شمشێر و ڕمەکەی دەهێڵێتەوە، کە نیشانەی خۆڕاگرتن و شەڕکردنە تامردن، بۆیە زۆربەی سوپاکە چاو لە سوڵتان دەکەنە و تەنها شمشێر و ڕمەکانیان دێڵنەوە.

هەردوو سوپا لە ناوچەی (مەلازگرد) دەگەنە یەك، سوڵتان کەچاوی بەسوپای دوژمن دەکەوێ لەسەر ئەسپەکەی دادەبەزێ و سوژدە بۆ خوا دەباو ئنجا ڕووی خۆی تۆزاوی دەکاو سواری ئەسپەکەی دەبێتەوە.

موسڵمانان سەرەتا لە پێشەکی سوپاکەی ئیمپراتۆر دەدەن و بەماوەیەکی کەم پێشەکی سوپاکە ئیمپراتۆر دەشێکنن، سەرکردەسەربازییەکان دەشڵەژێن و سەربازانی بێزەنتی لەکۆنترۆل دەردەچن و موسڵمانانیش لەهێرشەکەیان بەردەوام دەبن تادەگەنە ناوەڕاستی سوپاکە.

ناوەڕاستی سوپای بێزەنتی دەکەوێ و وەکو تەسبیحێکی داوپساو هەر کەسەو بەلایەك دا ڕادەکەن و ئەو سوپایە گەورەیە بەماوەیەکی زۆر کەم دەشکێ، خودی ئیمپراتۆریش بەدەستی گەنجێك بەدیل دەگیرێ، ئەو گەنجە نازانێ ئەوە ئیمپراتۆرەو بەدیلی گرتوە، تایەکێك لەبێزەنتییەکان پێی دەڵێ: وریابە دیلێکی زۆر بەنرخت لەبەر دەستە ئەوە ئیمپراتۆرە.

یەکێك لەهۆکارەکانی شکستی ئەو سوپا گەورەیە بەماوەیەکی زۆرکەم هێرشەکەی خودی ئەلب ئەرسەلان بوو بۆ سەرکردایەتی سوپاکە، واتە موسڵمانان هێرشیان کردە سەر قەلبی سوپاکە سەنتەری بڕیار، بەتێك شکاندنی سەنتەری سوپاکە تەواوی سوپاکە لەبال یەك هەڵوەشایەوە، بۆیە بەماوەیەکی زۆرکەم موسڵمانان تەواوی گۆڕەپانی جەنگیان کۆنترۆڵکرد و بێزەنتییەکان ئەوەی کوژرا کوژرا ئەوەی تر ڕایانکرد و ئازا ئەو کەسە بوو کە خۆی ڕزگار بکا.

ئینجا هەواڵ دەگاتە سوڵتان ئەلب ئەرسەلان کەئەوە خودی ئیمپراتۆر (ڕۆمانۆس) دیلکراوە سوڵتانیش فەرمان دەکات کە (ڕۆمانۆس)ی بۆ بێنن.

سوڵتان پێی دەڵێ:

ئەی بە دوام نەناردی داوای ئاگربەستم لێکردی؟

ڕۆمانۆس دەڵێ: واز لەگلەیی بێنەو ئێستا ئەوەی دەیکەی بیکە.

سوڵتان پێی دەڵێ: ئەگەر من دیل کرابام لای تۆ چیت بەسەر دەهێنام؟

ڕۆمانۆس دەڵێ: ئەوەی خراپ بایە ئەوم بەسەر دەهێنای.

سوڵتان پێی دەڵێ: ئەی ئێستا چاوەڕوانی چی دەکەی لەمن؟

ڕۆمانۆس دەڵێ: یان دمکوژی، یان لەشاران دەمگێری ئەوەی تریش زۆر دوورە. کەمەبەستی ئازاد کردنە بەپارەیەکی زۆر.

سوڵتان لەوەلامی دا دەڵێ: نیەتم وایە ئازادد کەم بەپارەیەکی زۆر.

ئینجا لەسەرچاوەکان هاتوە کە سوڵتان داوای: یەك ملیۆن و نیو دیناری ئاڵتونی لێدەکات، بەو مەرجانە ئیمپراتۆڕ ئازاد دەکا:

یەکەم: یەك ملیۆن و پێنج سەد هەزار دینار.

دووەم: هەرچی موسڵمانەو دیلکراوە لەلای ڕۆمییەکان دەبێ بێبەرامبەر ئازاد بکرێ.

سێیەم: ئیمراتۆر دەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی و نابێ لەفەرمانی سوڵتان دەربچێ، هەرکاتێك سوڵتان فەرمانی پێکرد دەبێ ئامادەی جێبەجێکردنی فەرمانەکانی سوڵتان بێ.

لەسەر ئەو خاڵانە پێکهاتن، ئینجا سوڵتان ئیمپراتۆری ئازاد کرد، ئیمپراتۆر گوتی شوێنی خەلیفە دەکەوێتە کام ڕوو ئەوانیش ئاڕاستەی بەغدایان بۆ دیاری کرد، ئیمپراتۆڕ ڕووی لەبەغدا کردو سەری بۆنزمکرد.[(١)] وەکو حوڕمەتێك بۆ خەلیفەی موسڵمانان.

ئەو خاڵانەی لەسەری پێکهاتبوون بۆ ماوەی (٥٠)ساڵ بوو، دوای ئەوەی ئیمپراتۆر دەگەڕێتەوە وڵاتی خۆی (٢٠٠)هەزار دیناری بۆ کۆدەکرێتەوەو سنییەکیشی بۆ دەنێرێ ئەویش پڕ بوو لە دڕو مەرجان کە بە نۆوەد هەزار دینار خەملێندرا، ئینجا ئەرمانۆس سوێندی بۆ سوڵتان خوارد کەلەوەزیاتری بۆ کۆناکرێتەوە سوڵتانیش ئەوەی لێ قبوڵکرد.

---

(١) الكامل في التاريخ (٨/ ٢٢٥).

بەهەر حاڵ باسکردنی ئەو جەنگە گەورەیە زۆر لەوە زیاتر هەڵدەگرێ، لەبەر ئەوەی هەندێك لەمێژوونوسان دەڵێن شکەستێکی زۆر گەورەی نەسرانییەت بوو بەرامبەر بەئیسلام، لەدوای ئەو شکەستە گەورەیە هیچ لە ئیمپراتۆرە نەسرانییەکان نەیانتوانی ئەو شکەستە گەورەیە پڕ بکەنەوە، سەرکەوتنی موسڵمانانیش بووە مایەی ئەوەی ئیسلام بگاتە زۆربەی ئەو شوێنانەی ئەرمەنییەکانی تێدا بوو، ئەرمەنییەکان زانیان ئێستا هێزی بێزەنتییەکان ناتوانێ هیچ بۆ نەسرانیەت و بۆ پارستی ئەوان بکات، بۆیە بەناچاری هەندێکیان شوێنی خۆیان جێهێشت و کۆچیان کرد بۆ ئەو ناوچەیەی کەناو نراوە (قلیقیا، Cilicia) کە ئێستا دەکەوێتە باکوری خۆرئاوای کەنداوی ئەسکەندەرونە لە باشوری تورکیا، لەزەمەنی عوسمانییەکان ناونرا ویلایەتی ئەدەنە، ئەو ئەرمەنیانە دەتوانن لەو ناوچەیە جێگیر بن شوینێکی قایم و عاسێ بووە، شاخی (تۆرۆس)یان لێنزیك بووەو شاری (سیس) دەکەنە پایتەختی خۆیان لەئەدەنەو تەرسوس و ئەو شارانە کۆدەبنەوە، ئەوە لەکاتێك ئیمارەتێکی تری نەسرانی لەناوچەکە بوونی هەبوو کەئیمارەتی (ئەنتاکیە) بوو.

ئەو ئیمارەتە کێشەیەکی زۆری بۆموسڵمانان نابووەوە، هەرکاتێك هەڵمەتی خاچپەرستەکان ڕووی لەجیهانی ئیسلامی کردبا سەرەتا دەچونە ئەرمینیای بچوك لەوێوەو پشویان دەداو هێزەکانیان ڕێکدەخستەوە ئینجا

دەستیان دەکرد بەهێرش کردن بۆ وڵاتی شام و قودس، بەکورتی باسی ئەو مێژووەمان کرد بۆ ئەوەی خوێنەر وێنەکەی لەبەرچاو ڕوونبێ.

ئەوەی جێی سەرنجە ڕوسیا هەردەم پشتگیری لە ئەرمینیا کردوە لەبەر ئەوەی ئەرمەنەکان و ڕووس خۆیان بەخاوەنی کڵێسەی خۆرهەڵات دەزانن قوستەنتینییەش بەبەشێکی موقەدەس لەمێژووی خۆیان دەزانن، دەتوانین لێرەوەش وەڵامی ئەو پرسیارە بدەینەوە لەبەر چی ڕووسەکان لەوسەدەیە کەسەدەی (٢١) پشتگیری لەڕژێمی سوریا دەکەن و ئەو ناوچەیە چۆڵ ناکەن؟

لەبەر ئەوەی ڕوسیا ئەو ناوچەیە بەموڵکی کڵێسەی خۆرهەڵات دەزانێ و خۆشی پێ پاسەوانی ئەو کڵێسەیە یە، ڕاستە بەشێوەو شکڵ ئیمارەتی ئەنتاکیای نەسرانی و قلیقیا نەماون، بەڵام ئەو هێزانەی پشتیوانی هەڵمەتەکانی خاچپەرستەکانیان دەکرد ئێستاش لەناوچەکە وەکو هێزێکی کاریگەر هەر ماون، دوریش نییە لەئاییندە هەوڵی زیندوو کردنەوەی ئیمارەتی (قلیقیا) و (ئەنتاکیا)ی نەسرانی بدەن.

## زاهیر بێبرس و گرتنی ئەرمینیای بچوك

باسمان کرد ئیمارەتی ئەرمینا پەیوەندێکی زۆر باشیان لەگەڵ مەغۆلەکان هەبوو، ئەو ئیمارەتە لەوەتەی هەبوو کێشەیەکی گەورە بوون بۆ جیهانی ئیسلامی، زۆربەی هێرشی خاچپەرستەکان سەرەتا دەچونە ئەرمینیای بچوك و لەوێ پشویان دەداو ئینجا بەرەو گرتنی قودس

دەکەوتنە ڕێ، زاهیر بیبەرس ڕەحمەتی خوای لێبێ هەر لەسەرەتای دەسەڵاتی دەستبەکار بوو لەدوو بواران.

یەکەم: ڕێکخستنەوەی ماڵ و نەهێشتنی کێشە نێوخۆییەکان.

دووەم: دەرکردنی سەڵیبییەکان لە ناوچەی شام.

بێبرس دوای ئەوەی کێشەی نێوخۆیی نەهێشت، توانی میسرو شام لەژێر یەك دەسەڵات کۆبکاتەوە، لەدوای ئەوە دەستی بەتاڵ بوو بۆ خاچپەرستەکان و نەهێشتنی ئەو هەڕەشە گەورەیە لەسەر وڵاتی شام کە بریتی بوون لەهەردوو ئیمارەتی نەسرانی (عەککەو ئەرمینیای بچوك) لەساڵی (٦٦٤) هێرشێکی گەورەی کردە سەر شاری (قەیسارییە و یافاو ئەرسوف) هەموو ئەو شارانە لەژێر دەسەڵاتی زایۆنییەکانە کە ئێستا ناو نراوە دەوڵەتی (ئیسرائیل) بەماوەیەکی کەم ئەو شارانەی لەچنگی سەڵیبییەکان ڕزگار کردو خاچپەرستەکانی لەو ناوچانە دەرکرد، ئینجا بەرەو باکور هەڵکشا ناوچەی (صەفەد)ی ئازاد کرد ئەوشارەش دەکەوێتە (ئیسرائیل)ی ئێستا، دواتر ڕووی کردە شاری (تبنین)کە کەدەوێتە لوبنانی ئێستا ئەویشی ڕزگارکرد، ئینجا هێزەکانی زاهیر بێبرس دەبنە هەڕەشەیەکی ڕاستەو خۆ لەسەر هەردوو شاری (طرابلس و ئەنتاکیە) کە بەدوو بنکەی گەورەی هێزە سەڵیبییەکان هەژمار دەکرا.

(هیثوم) پادشای ئەرمینیای بچوك فشارێکی زۆر گەورەی خستبوە سەر میسر توانیبوی تا ڕادەیەکی زۆر ڕێ لە کەشیتە بازرگانییەکان

بگرێ کە لەئاسیای بچوك واتە تورکیای ئێستا لەڕێی دەریای ناوەڕاستەوە بەرەو میسرڕدەچون، ئەو فشارە ئابووریەش زیانێکی زۆری بە میسرڕییەکان گەیاندبوو، بۆیە ئەو کاتەی هێزەکانی بێبرس نزیك دەبنەوە لەناوچەکە (هیثوم)ی پادشای ئەرمینیا هەوڵدەدا لەڕێی گفتوگۆوە ڕێ لەهێزی مەمالیکەکان بگرێ، سەرەتا وەفدێك دەنێرێتە لای زاهیر بێبرس و ئامادەیی خۆی دەردەبڕێ کە ئەو فشارە ئابووریە لەسەر میسرڕییەکان هەڵگرێ، بەڵام زاهیر بێبرس ئەوەی قبوڵ نییەو چەند مەرجێك دەخاتە سەر(هیثوم) لەو مەرجانە :

یەکەم: داوا دەکات (هیثوم) وەکو پادشای ئەرمینیای بچوك لەفەرمانی زاهیر بێبرس دەرنەچێ.

دووەم: دەبێ دەوڵەتی ئەرمینیای بچوك (جزییە) بەدەوڵەتی مەمالیك بدات.

سێیەم: نابێ بەهیچ جۆرێك ڕێگری لەو بازرگانانە بگرن کە گەنم لە ئەرمینیای بچوك دەکڕن و بۆ شامی دەهێنن.

چوارەم: دەرگای ئەرمینیا بچوك بەڕووی هێزی مەمالیك واڵا بکات، بۆ هێرش کردنە سەر ئەو مەغۆلانەی لە ئاسیای بچوکن واتە تورکیای ئێستا.

پێنجەم: هەرچی قەڵاو زەوی هەیە کە ئەرمینیا بەیارمەتی مەغۆلەکان لەموسڵمانانی داگیر کردوە دەبێ هەمووی بۆموسڵمانان بگێڕیتەوە.

هەر لەو مەرجانە دیارە (زاهیر بێبرس) مەبەستی نەبووە هیچ پەیمانێك واژۆ بکرێ، لەبەر ئەوەی دەیزانی تا ئەو قەوارەیە مابێ ئەو ناوچەیە ئارامی بەخۆوە نابینێ، بۆیە (هیثوم) ڕوودەکاتە شاری (تەبرێز) و لەوێوە داوای یارمەتی سەربازی لە مەغۆل دەکات بۆئەوەی سوپایەکی سەربازی گەورە بنێرن و بتوانن سنورێك بۆ هەڕەشەکانی زاهیر بێبرس دابنێین.

لەو کاتە مەغۆلەکان لەژێر فشارێکی زۆربوون، لەلایەك کێشەی نێو خۆیی بنەماڵەی حاکم لەلایەکی تر هەڕەشەکانی هۆزی ئاڵتونی بۆ سەر ئێلخیانییەکانی ئێران، بۆیە نەیانتوانی بەهیچ جۆرێك یارمەتی (هیثوم) بدەن، مەمالیکەکان کەبەوە دەزانن نەسڕانییەکان چونەتە تەبریز بۆ یارمەتی سەربازی لە مەغۆلەکان، دەم ودەست هێزێکی گەورە ئامادە دەکەن بەسەر پەرشتی مەلیك مەنصور و سەیفەددین قەلاون و ئەمیر عیزەددینی یوغانی تورکی کەناسراو بوو بە (سم الموت) ئەو هێزە بەرەو ئەرمینیای بچوك بەڕێ دەکەوێ، لەنزیك ناوچەی (دربساك) ڕوو بە ڕوو بونەوە لەگەڵ هێزێکی گەورەی ئەرمەنییەکان کەبەسەرکردایەتی هەردوو کوڕی (هیثوم)ی پادشای ئەرمینا بوو، جەنگێکی زۆر گەورە کەوتە نیوان ئەو دوو سوپایە، لەکۆتایدا سوپای موسڵمانان سەرکەوتن و کوڕێکی (هیثوم) لەو جەنگە دەکوژرێ بەناوی (ثوروس) کوڕەکەی تری بەدیل دەکەوێتە دەست موسڵمانان بەناوی (لیون) ئەوە بوو ئەو سوپایە نەگەڕایەوە تاوەکو گەیشتنە شاری (سیس)کە ئێستادەکەوێتە وڵاتی تورکیاو نزیك شاری

ئەدەنە، ئەو کات(سیس) پایتەختی ئەرمینیای بچوك بوو، ئینجا هێزی مەمالیکەکان دەگەنە ئەو شارانە (سیس و ئەدەنە و تەرسوس) هەرچی هێزی سەربازی لەو شارانە هەبوو تێکیان شکاندو دواتر گەڕانەوە، شاری حەلەب.

ئەو جەنگە گورزێکی کەمەر شکێن بوو بە مەملەکەتی ئەرمینیا کەوت، سوپای موسڵمانان نزیکەی بیست ڕۆژ لە ئەرمینیا دەمێننەوە دواتر دەگەڕێنەوە لە کاتی گەڕانەوەی بەشێك لەسوپای موسڵمانان بەسەرکردایەتی (مۆغان) یەکێك لەگرنگترین قەڵاکانیان ئازادکرد کەناوی قەڵای (عامودین) بوو ئەو قەڵایە لەلایەن خۆبەخشەکانی نەسرانی دەپارێزرا گروپێکیان دروستکردبوو بەناوی (داویە) ئەوانە بە(فرسان المعبد) ناسراوبوون، ئەرکی (فرسان المعبد) پاراستنی ڕێگای نێوان (یافا) و (قودس)بوو، بۆ ئەوەی ئەو نەسرانیانەی بەمەبەستی (حەجکردن) دێن بۆ قودس بەسەلامەتی بەگەنە قودس.(١)

(هیثوم) بە سوپایەکی بچوکی مەغۆلەکان دەگەڕێتەوە (ئەرمینیا)ی بچوك کەسەیری کرد وڵاتەکەی بەتەواوی کاوڵکرایەو کوڕێکی کوژراوەو کوڕەکەی تریشی لای موسڵمانان بەدیل گیراوە، دەستدەکاتە گریان و زۆر پەشیمان دەبێتەوە لەو سیاسەتە هەڵەیەی کە بەرامبەر بەموسڵمانان گرتبویە بەر، بەتەواوی بۆی ڕووندەبێتەوە کە مەغۆلەکان جێی متمانە نین، بۆیە

---

(١) قصة الحضارة (١٥/ ٥٩).

ئەو جارەی مەلیك (هیثوم) وەفدێك دەنێرێ بۆ ئەوروپییەکان و داوا لەپاپا (کلیمنتی چوار)دەکات بەهانایەوە بیت، بەڵام پاپا پشتگیریەکەی تەنها مەعنەوی دەبێت و ئومێدی سەرکەوتنی بۆدەخوازێ و لەوە زیاتر هیچی بۆناکات.

ئینجا مەلیك (هیثوم) وەفدێك دەنێرێ بۆ لای سوڵتان (زاهیر بیبرس) و زۆری لێدەپاڕیتەوە (لیون)ی کوڕی ئازادبکات، سوڵتان بێبرس بەوەفدەکەی (هیثوم) دەڵێ: ئێمە سەرکردەیەکی سەربازیمان بەناوی(شمس الدين سنقر الاشقر السمرقندى) بەدیل گیراوە لای مەغۆلەکان ئێمە ئامادەین کوڕەکەت بەو سەرکردە سەربازیە بگۆڕینەوە.

(هیثوم) دەچێتە لای (ئەبەقا) و دەستدەکاتە گریان و زۆری لێدەپاڕێتەوە، ئەبەقاش بەڵێنی پێدەدا کە ئەو کەسە ئازاد بکات کە سوڵتان بێبرس داوای کردوە بۆئەوەی ئەویش (لیۆن) ئازاد بکات.

ئینجا لەساڵی (٦٦٩) مەغۆلەکان ئەو کەسە ئازاد دەکەن کە سوڵتان بێبرس داوای کردبوو سوڵتان بێبریش (لیۆن)ی کوڕی (هیثوم) ئازاد دەکا، لەنێوان ساڵی (٦٦٦) تاوەکو ساڵی (٦٧١) سوڵتان زاهیر بێبرس دەتوانێ زیانێکی یەکجار زۆر بە سەڵیبییەکان بگەیەنێ.

## نامەی (ئەبەقا) بۆ سوڵتان (زاهیر بێبرس) لەساڵی (٦٦٧)

لەساڵی (٦٦٧) (ئەبەقا) دوو نوێنەری خۆی دەنێرێتە شام بەناوی (بیك توت و ابوالغریب بالاولاغ) نامەیەکی هەڕەشە ئامێزیان پێیە لە (ئەبەقا)وە بۆ سوڵتان زاهیر بێبرس، لەنامەکە دا هاتووە کە ئێمەی مەغۆل خاوەنی دونیاین، هیچ هێزێك نییە ڕوو بە ڕوومان بێتەوە، ئەگەر ترسی ئەوەشتان هەبێ کە کاتی خۆی نوێنەری ئێمەتان کوشتوە لەسەر ئێوە حیسابی ناکەین، بەڵکو ئەوە تاوانی سەیفەدین قوتز بووە، [1] بۆیە لەنامەکە بەزاهیر بێبرس دەڵێ:

ئێمە خاوەن یاسایەکین کوڕ بەتاوانی باوك و برا بچوك بەتاوانی برا گەورە سزا نادەین، تا زووەو بیر لەبەرژەوەندی خۆت بکەیتەوە، ئەگەر نا لەئاسمان بی، یان لەهەرکوێی دونیابی دەستی ئێمەت پێدەگا.

ئەبەقا ئەوەی لە زاهیر بێبرس داوا دەکات، خۆی بەوان بفرۆشێ تاوەکو بتوانێ لەسەرحوکم بمێنتەوە زاهیر بێبرس بەنامەیەك وەڵامێکی توندی دەداتەوەو لەنامەکەی داهاتووە:

ئەگەر ئێوە خاوەن یاسق و یاسای جەنگیزخان بن ئەوە ئێمە سوپاس بۆ خوای گەورە خاوەن بەرنامەی خوای گەورەین کە قورئانی پیرۆزە، لەوەش دڵنیابە نوێنەرەکانت بەسەلامەتی بۆ دەگێرینەوە، دەرباری هەرەشەکانیشت

(١) مەبەستی ئەو نوێنەرانەبوو کە بەر لەجەنگی عین جالوت هاتنە میسرو سەیفەدین قوتز کوشتیانی.

ئومێد دەکەین کوشتنی (کەتبغا نوین)نت لەبیر نەچێ (مەبەستی عین جالوته) ئینجا لەوەش دڵنیا بە ئێمە وازتان لێنایەنین تاوەکو تەواوی خاکی موسڵمانان نەگێرینەوە.[١]

## ئازاد کردنی شاری (صور)

سوڵتان زاهیر بیبرس یەکێك بو لەو سوڵتانانەی زۆربەی تەمەنی لەسەر پشتی ئەسپ بەڕێکردوە، لەنێوان میسرو شام و وڵاتی جەزیرە، لەیەکێك لەسەفەرەکانی کە لەدیمەشق دەگەڕایەوە بۆمیسرلەڕێگادا، ئافرەتێك دێتە ڕێگای و دەست دەکاتە گیریان و پێی دەڵێ: کوڕەکەم بازرگان بوو دەچێتە شاری (صور)[٢] لەو شارە کوڕەکەم دەکوژن و پارەکەشی دەبەن، سوڵتان زاهیر بیبرس سوپا ئامادە دەکات و هێرش دەکاتە سەر شاری (صور) و شارەکە دەگرێ و تۆڵەی کوڕی ئەو ئافرەتە دەکاتەوەو غەنیمەیەکی زۆریش لەگەڵ خۆی دێنیتەوە، بەڵام دیارە لەو شارانە نەیتوانیوە بمێنێتەوە، لەبەر ئەوەی سوپاکەی ئەوەندە نەبووە بتوانن لەو شوێنە سنوریانە بمێننەوە.

هەر لەو ساڵە واتە (٦٦٧) خەڵکێکی زۆر شاری (حەڕان) جێدەهێڵن دێنە شام، لەوانەی کەشارەکەیان بەجێهێشت باوکی شێخی ئیسلام ئیبن

---

(١) دەقی نامەکە لەکتێبی(عقد الجمان فی تاریخ اهل الزمان)، بەرگی ٦ لاپەڕە ٤٣.
(٢) دەکەوێتە لوبنانی ئێستا ئەو کات لەژێر دەستی خاچپەرستەکان بوو .

تیمیە بوو ڕەحمەتی خوای لێبێ کە ئەو کات شیخی ئیسلام تەمەنی شەش ساڵ بوو، شێخی ئیسلام لەساڵی (٦٦١) لەدایك بووە لەساڵی ٧٢٨ وەفات دەکا.[1]

## ئازاد کردنی قەڵای ئیسماعیلییەکان لەساڵی (٦٦٨) کۆچی.

ئیسماعیلییەکان هێزێکی گەورەی خیانەت کار بوون لە لوبنان، خاوەن پەیوەندێکی زۆر چاکیش بوون لەگەڵ خاچپەرستەکان، سوڵتان زاهیر بێبرس بڕیار دەدا ئەو پێگەی خیانەتە لە ناوچەکە نەهێڵێ، هێرشێکی گەورەی کردە سەر قەڵاکانیان و شوێنەکەی پاککردەوە لەدەسەڵاتی ئیسماعیلییەکان، لێدانی ئیسماعیلییەکان لێدانێکی گەورەی نەسرانییەکان بوو لەبەرئەوەی دەستێکی گەورەی سیخوری بڕی لەهەمان کاتدا پێگەیەکی گەورەی خاچپەرستەکانی لە ناوچەکە نەهێشت.

(١) عقد الجمان فی تاریخ اهل الزمان، بەرگی ٦ لاپەڕە ٥١.

# هەوڵێکی تری ئەوڕوپا بۆ داگیرکردنی (قودس) ساڵی (٦٦٩) کۆچی

هەواڵ گەیشتە سوڵتان زاهیر بێبرس کە پادشکانی ئەوڕوپا (البرالطویل) واتە ئەوڕوپا بۆنمونە کەباسی ئەندەلوسیان کردوە گوتویانە ئەو مەملەکەتە تێکەڵە بە (البرالطویل) ئەویش سنوری تێکەڵە لەگەڵ قوستەنتینییە، کەبێگومان مەبەستیان ئەو ڕووبەرە فراوانە بووە کەئێستا پێی دەگوترێ ئەوڕوپا.[1] هەموی کۆبونەتەوەو نیازیان وایە هێرش بکەنە سەر شام بۆ داگیرکردنی قودس، پاپاش دوعای بۆ کردوون و بەجەنگێکی پیرۆزی لەقەڵەم داوە، بێبرس زانی ئەگەر بێت و ئەوڕوپییەکان لە دەریاوە ڕوو لەمیسڕبکەن و مەغۆلەکانیش لەشامەوە هێرش بکەنە سەر دەوڵەتی مەمالیك ئەوا ترسناکیەکی زۆر ڕوو لەجیهانی ئیسلامی دەکات، بۆیە وەفدێکی نارد بۆلای مەلیکی (ئینگلتەڕا) کە لەکتێبە مێژووییەکان پێی گوتراوە (الانکتارە) وەفدەکە بەسەر پەرشتی کەسێك بوو بەناوی (الصارم المسعودی) کەوالی شاری قاهیرە بووە، دیارێکی یەکجار زۆریان لەگەڵ خۆیان برد بۆ مەلیکی بەریتانیا لەو دیاریانە فیلێکی گەورە و زەرافەیەك بوو، ئینجا زاهیر بێبرس بە (الصارم مەسعودی) گوت کە گەیشتیە لای

---

(١) حاشیة الصبان علی متن الاشمونی، بەرگی لاپەڕە ١٢.

مەلیك سڵاوی منی پێبگەیەنە دیارییەکانی پێببەخشە، ئەگەر پرسیاری کرد داواکارییەکانی سوڵتان بێبرس چییە؟ پێی بڵێ تەنها خۆشی جەنابت و ویستمان پەیوەندێکی چاکمان لەگەڵ یەك هەبێ.

ئەوە بوو مەلیکی ئینگلتەڕا زۆر سەرسام بوو بەو هەموو دیاریەو گوتی سوڵتان داوای چی دەکا؟ مەسعودی گوتی: قوربان ئەو دیاریانە تەنها بۆ خۆش کردنی پەیوەندی نێوان ئێمەو ئێوەیەو هیچی تر نا.

مەلیکی ئینگلتەڕا زۆر دڵی پێخۆش بوو، ڕێزێکی زۆری لەوەفدەکەی سوڵتان بێبرس گرت و ئینجا ئەویش بەدیاریەکی زۆرەوە بەڕێی کردنەوە بۆ میسر، دوای ئەوەی پادشا ئەوڕوپییەکان خۆیان ئامادە دەکەن و دەچنە لای پاپا، پاپاش نوێنەرێك دەنێرێ بۆ لای مەلیکی ئینگلتەڕا، پێی دەڵێ کە سوپای خۆی بنیرێ و بەشداری پادشاکانی تری ئەوڕوپی بکات، مەلیکی ئینگلتەڕا بە نوێنەرەکەی پاپا دەڵێ سوپا بۆچی ئامادە دەکەن ؟ ئەویش دەڵێ بۆ گرتنی عەککا و دواتر شاری قودس، مەلیکی ئینگلتەڕا دەڵێ ئەو شوێنانە لەسنوردی دەسەڵاتی سوڵتان زاهیر بێبرسەو من پەیوەندێکی چاکم لەگەڵی هەیە و بەشداری ئەو جەنگە ناکەم و ئەوانەی بەگوێشم دەکەن لەپادشاکانی تر نایەڵم ئەوانیش بەشداری ئەو جەنگە بکەن، ئەوە بوو پلانی هێرشکردنە سەر قودس هەڵوەشایەوە. (١)

(١) ئەو ڕیوایەتە تەنها لە کتێبی تاریخ مجموع النوادر مما جرى للاوائل والاواخر داهاتوە، لاپەڕە ٢٤٤.

## گفتوگۆی ناڕاستەوخۆی نێوان (ئەبەقا) وسوڵتان (زاهیر بێبرس)

لەساڵی (٦٧٠) وەفدێکی تەتارەکان دەگەنە لای سوڵتان زاهیر بێبرس، سوڵتان پێشوازێکی گەرم لەو وەفدە دەکات، بەڵام گفتوگۆکان هیچ دەرەنجامێکی نابێ، بۆیە ئەو جارەی سوڵتان (زاهیر بێبرس) وەفدێك دەنێرێ بۆلای (ئەبەقا) وەفدەکەی سوڵتان بەشاری (قونیە) تێدپەڕن و ڕۆژی هەینییە، ئەو کاتەی دەچن بۆ نوێژی هەینی خەڵکی شارەکە هەموی دوعا بۆ (سوڵتان بێبرس) دەکەن، ئەوەش بێگومان ئاماژەیەکی زۆر گرنگە لەسەر ئەوەی کە ئەو خەڵکە چاوەڕوانی سەرکردەیەکی ئازاو بەجەرگ دەکەن بتوانێ هێزوو تواناکان کۆبکاتەوەو بەڕووی مەغۆلەکان ڕاپەڕێ، وەفدی سوڵتان زاهیر بێبرس زۆر جیاوازە لەگەڵ باقی وەفدەکانی تر، لەڕابردوو وەفدی پادشا موسڵمانانەکان دەهاتن گوێڕایەڵی خۆیان بۆ مەغۆل ڕادەگەیاندو ئامادەیی خۆیان دەردەبڕی بۆ تەسلیم کردنی قەڵاو شارەکان، بەڵام ئەوجارەی وەفدی موسڵمانان هاتوون داوای خاکی مسوڵمانان دەکەنەوە کە مەغۆلەکان داگیریان کردووەو باسیان لەهیچ خاڵێکی تر نەکرد تەنها داوای ئەو شوێنانەیان کردەوە کە مەغۆلەکان داگیریان کردوە، ئەو داواکاریەیش زۆر قورس بوو لەسەر دڵی (ئەبەقا) بۆیە بەتوندی وەڵامی وەفدەکە دەداتەوەو ئینجا پێیان دەڵێ: چاکترین چارە ئەوەیە کە هەر کەسەو خاوەنی ئەوخاکە بێ کە لەژێر دەسەڵاتی دایە،

وەفدەکەی سولْتان (زاهیر بێبرس) بەبێ ئەنجام دەگەڕێنەوە، بەڵام ئەوەی گرنگ بوو بەمەغۆلەکانیان ڕاگەیاند کە ئێستا و دوێنێ زۆر لەیەك جیاوازن، ئەو زیللەتەی پادشاکانی پێشتر قبوڵیان دەکرد زاهیر بێبرس ئامادە نییە قبوڵی بکات.

## شکستێکی تری مەغۆلەکان لەنزیك قەڵای (ئەلبیرە، البیرە)لەساڵی (٦٧١)

هەواڵ گەیشتە سولْتان (زاهیر بێبرس) کە هێزێکی مەغۆلەکان گەیشتونەتە باکوری فوڕات و گەمارۆی قەڵای (ئەلبیرە) یان داوەو چەند مەنجەنیقێکیان پێیەو قەڵاکە بەرد باران دەکەن موسڵمانان لەسەر قەڵاکەوە مەنجەنیقێکیان لابوو، بەڵام ئەو بەردانەی دەیانهاوێشت نەیدەپێکا، یەکێك لەو موسڵمانانەی لەگەڵ سوپاکەی مەغۆل بوو، خۆی دەگەیەنێتە نزیك قەڵاکە و ڕەسەدێکی تەواو دەداتە مەنجەنیقەکەو پێی دەڵێ: بەردەکانت سەر دەکا باڵی مەنجەنیقەکە باڵێك کورت کەوە، ئەوە بوو ئەو کەسەی مەنجەنەیقەکەی بەکار دەهێنا باڵێکی کورت کردەوە و ئینجا ئەو بەردانەی کە دەیوەشاند بەتەواوی دەیپێکا[١]، ئەو حاڵەتەش دیسان ئەوەی لێدەخوێندرێتەوە کە بەڵێ کەسی دڵسۆز و خەمخۆر هەبووینە ئەگەرچی لەڕیزی مەغۆلەکان بووینە، بەڵام ناڕاستەوخۆ هەوڵیان داوە موسڵمانانان

(١) تاریخ مجموع النوادر مما جرى للاوائل والاواخر، لاپەڕە ٢٤٦.

لەدەست مەغۆلەکان ڕزگار بکەن، [١] سولْتان زاهیر بیبرس هێزێك ئامادە دەکاو دەچێتە شاری (حمص) لەشاری حمصەوە دەچنە شاری (مەنبەج) مەغۆلەکان کەدەبیستن سوپای موسڵمانان بەڕێکەوتوە بۆ ناوچەکە زوو پردەکە دەڕوخێنن و بۆئەوەی سوپاکەی زاهیر بیبرس نەتوانێ لە فوڕات بپەڕیتەوە، سەرەتا سولْتان بیبرس بیری کردەوە بەپەلە پردێك دروست بکەن ولە فوڕات بپەڕنەوە، بەڵام دروستکردنی ئەوپردە کاتێکی زۆری دەویست سولْتان بڕیار دەدا سوپاکە لەئاوی فوڕات بدەن، کەئەوەش لەنەخشەی مەغۆلەکان نەبوو و چاوەڕوانی ئەوەیان نەدەکرد سوپای موسڵمانان لە ڕووباری فوڕات بدەن.

(سەیفەددین قەلاوون) یەکێکە لەسەرکردە سەربازیە گەورەکانی (زاهیر بیبرس) دەڵێ: مەغۆلەکان زۆر لەوە کەمترن ئێمە بەرامبەریان دەستەوەستان بوەستین بۆیە لەئاوەکە دەدات، دواتر خودی سولْتان لەئاوەکە دەدا، ئینجا تەواوی سوپاکە، ئەوەی جێی ئاماژەیە ئەسپ مەلەوانێکی زۆر چاکە، بەماوەیەکی کەم تەواوی سوپاکە لەفوڕات دەپەڕنەوە، سەرنجی ئازایەتی سولْتان بیبرس بدەن چۆن چۆتە ئەو بەری ڕووبار لەکاتێکدا هیچ پردێك لەسەر ڕووبارەکە نییە پێیدا بگەڕێنەوە ئەگەر لەو جەنگە بشکێن.

(١) قەڵای ئەلبیرە لەسەر فوڕاتە کەدەکەوێتە شاری (ئورفە)لەنزیك شاری (سمیساط)ی تورکی.

(سوڵتان سەیفەددین قوتز و زاهیر بیبرس) ئەو ترسەیان لەدڵی موسڵمانان دەرهێنا، بەکردەوە بەو خەڵکەیان ڕاگەیاند ئێمە نابێ چاوەڕوان بکەین تاوەکو مەغۆلەکان هێرش دەکەنە سەرمان، بەڵکو دەبێ ئێمە مەیدانیان لێبگرین و هێرش بکەینە سەر مەغۆلەکان، مەغۆلەکان لەوبەری فوراتەوە بێئاگابوون، لەپڕ کەوتنە بەر ڕم و شمشێری موسڵمانان ئەو ڕۆژە ڕێك ئەو ڕۆژەبوو کەخوای گەورە دەفەرمێ: {قَاتِلُوهُمْ يُعَذِّبْهُمُ اللَّهُ بِأَيْدِيكُمْ وَيُخْزِهِمْ وَيَنْصُرْكُمْ عَلَيْهِمْ وَيَشْفِ صُدُورَ قَوْمٍ مُؤْمِنِينَ (١٤) وَيُذْهِبْ غَيْظَ قُلُوبِهِمْ وَيَتُوبُ اللَّهُ عَلَى مَنْ يَشَاءُ وَاللَّهُ عَلِيمٌ حَكِيمٌ (١٥)}[1]

خوای گەورە موسڵمانانی سەرخست و لەسوپاکەی مەغۆل چەند کەسێك توانیان ڕابکەن ئەوەی تر هەموی کوژران، موسڵمانان جگە لەسەرکەوتن کەشیفای دڵە، غەنیمەیەکی زۆریشیان کەوتە دەست وسوژدەی شوکریان ئەنجامدا و سەربەرزانە گەڕانەوە دیمەشق بەشێکیش لەو سوپایە ڕوویان کردە ئەرمینیای بچوك و توانیان شاری سیس بگرن و دیسان زیانێکی زۆریان بە ئەرمەنییەکان گەیاند.[2]

---

(١) التوبة: ١٤، ١٥.

(٢) تاريخ الملك الظاهر عزالدين محمد بن علي بن ابراهيم بن شداد . عقد الجمان فى تاريخ اهل الزمان، بەرگی ٦ لاپەڕە ١٠١.

## هێرشێکی تری مەغۆل بۆ سەر (قەڵای ئەلبیرە) لەساڵی (٦٧٤)

مەغۆلەکان بەهێزیکی گەورە کەژمارەیان (٣٠) هەزار کەس بوو (١٥) هەزاریان مەغۆل بوون (١٥) هەزاریش خەڵکی ناوچەکە بوون کە چوبونەتە پاڵ هێزی مەغۆل، دیسان گەمارۆی قەڵای ئەلبیرەیان دا و (٢٣) دانە مەنجەنیقیان پێبوو، قەڵاکەیان بەرد باران دەکرد، شەو خەڵکەکە لەقەڵاکە دەرچون و هێرشێکی زۆر توندیان کردە سەر مەغۆلەکان و بەفەزڵی خوای گەورە توانیان، مەنجەنیقەکان بشکێنن و مەغۆلێکی زۆریش بکوژن.

مەغۆلەکان دیسان شکستێکی زۆر گەورەیان بەرکەوت و ڕایانکرد، کە سوڵتان زاهیر بێبرس بەوەی زانی بەڕێ کەوت بۆ حەلەب دواتر هەواڵی پێگەیشت کە مەغۆلەکان گەڕاونەتەوە، بۆیە بێبرس گەڕایەوە شام و پارەیەکی زۆری بۆ خەڵکی (ئەلبیرە) نارد، ئەگەر سەرنجی ئەو چەند ساڵە بدەی بێبرس توانیویەتی مەشخەڵی جیهاد و بەرەنگاربوونەوە هەڵبکاو هیمەتی ئەو خەڵکەی بەگڕ خستەوە، لەبری تەسلیم بوون کە فەوتانی خۆیان و وڵاتیانی تێدا بوو ڕوویان کردە جیهاد کە ژیانی خۆیان و ئاوەدانی مەملەکەتەکەیانی تێدابوو.[١]

(١) عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، بەرگی ٦ لاپەڕە ١٣٩.

## جەنگی بێستان کەناسراوە بەجەنگی (الابلستین) لەساڵی (٦٧٥) کۆچی، عەین جالوتی دووەم[١]

ئەو جەنگە لەشاری (ئەبلەستین) ڕویدا کەدەکەوێتە باشوری ئەنادۆڵ، دواتر ناوی ئەو شارە دەبێتە (بێستان) سەرکەوتنەکانی یەك بەدوای یەکی زاهیر بیبرس ببوە هۆی ئەوەی خەڵکێکی زۆر متمانەی پێبکەن، بەتایبەت لەناوچەی ئەنادۆڵەوە زۆر لەو خەڵکە هیجرەتیان کرد بۆ میسرو شام و هەوڵی بەهێزکردنی سوپاکەی زاهیر بیبرسیان دا، لەهەمان کاتدا جۆرەك لەپەیوەندیش دروست بوو نێوان (موعینەدین پەروانە) کە بەنوێنەرایەتی (ئەبەقا) حوکمی ناوچەی ئەنادۆڵی دەکرد، پەروانە کێشەیەکی بۆ دروست ببو لەگەڵ برای (ئەبەقا) و بنەماڵەی حاکم، بۆیە ویستی پەیوەندێکی نهێنی لەگەڵ بێبرس بمێنێ و ئەگەر بێئومێد ببێ لە مەغۆلەکان ئەوە بتوانێ بچیتە شام، ئەو کاتەی هێزەکانی زاهیر بێبرس بەڕێ کەوتن بۆ ناوچەکە، مەلیکی ئەرمینیا(لیۆن) هەواڵی ئەو لەشکر کێشیەی گەیاندە (موعینەددین پەروانە)، بەڵام پەروانە هەواڵەکەی پشتگوێخست، ئەوە بوو کاتێك مەغۆلەکان بەخۆ کەوتن سوپای موسوڵمانان توانیبویان خۆیان لەو شوێنە قایم کەن، مەغۆلەکان کەبە هاتنی سوپای موسڵمانەکانیان زانی،

---

(١)الأبلستين: بالفتح ثم الضم ولام مضمومة أيضا والسين المهملة ساكنة وتاء فوقها نقطتان مفتوحة وياء ساكنة ونون. وهي مدينة مشهورة ببلاد الروم. (معجم البلدان ١/ ٧٥).

سوپایەکی گەورەیان ئامادە کرد و کردیان بەیانزە کەتیبە هەر کەتیبەیەکیش پێکهـاتبوو لە هەزار کەس، ئینجـا مەغۆلەکـان کەتیـبەی تورکمـانە سەلجوقییەکان یان لەخۆ جودا کردبووەوە، ترسی ئەویان هەبوو نەبادا ژێر بەژێری پەیوەندیان بە سوڵتان زاهیر بێبرس کردبێ، مەغۆلەکان هێرشێکی زۆر گەورەیان کردە سەر لای ڕاست و مەرکەزی سوپای موسڵمانان زاهیر بێبرس ڕایەتێکی گەورەی سوڵتانی هەڵدابوو لەناوەڕاستی سوپاکە خۆشی لەشـوینێکی تروەسـتابوو، مەغۆلەکـان کەوتـنە بۆسـەکەو وایـان زانـی هێرشەکەیان بۆ سەر خودی سوڵتانە کەچی سوڵتان زاهیر بێبرس لەگەڵ چەند کەتیبەیەکی تر توانیان پشت لە هێرش بەرەکان بگرنەوەو سەرەتا شکسـتێیکی زۆر گەورەیـان بە هێرشـبەرە مەغۆلەکـان گەیانـد، ئینجـا سەرکردایەتی مەغۆل کەزانیان شکەستیان هێنا، بوون بەدوو بەش بەشێکیان لەئەسپەکەیان دابەزین و بونە پیادە ئەوەش مانای شەڕکردنە تاوەکو مردن، بەشێکی تریان ڕایان کردە سەر شاخێك کە نزیکی گۆرەپانی جەنگەکە بوو.

موسڵمانەکانیش لە ئەسپەکانیان دابەزین وهەڵمەتێکی شێرانەیان کردە سـەر مەغۆلەکـان بە فەزڵ و گەورەیـی خـوای گەورە ئەو مەغـۆلانەی پیـادەبوون و لەئەسـپەکانیان دابەزیبـون زۆربەیـان کـوژران، ئەوانەی بەرەو شـاخەکە ڕایـان کردبـوو ئەوانـیش گەمـارۆدران و ئەوانـیش هەرهەمویـان کـوژران، زیـانێکی ئەو تـۆ بە سـوپای مەغـۆل کەوت یەکێـك ویسـتی کوشتاری مەغۆلەکان بژمێرێ کە لە حەفت هەزار تێپەڕی کرد تاقەتی

ژمـــاردنی نەمـــاو وازی هێنـــا، موســـڵمانان دیلێکـــی زۆری مەغۆلیـــان دەســـتکەوت لەگەردەنـــی دیلەکانیـــان دا، ئینجـــا غەنیمەیەکـــی زۆریشـــیان دەستکەوت، دوو سـەرکردەی زۆر گەورەی مەغـۆلیش لەو جەنـگە کـوژران (تۆغۆن و تۆدۆن). [1]

(١) عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، لاپەڕە ١٦٠ بەرگی ٦.

# ئازادکردنی شاری قەیصەریە[١]

دوای ئەو سـەرکەوتنە گەورەیەی موسـڵمانان بەدەسـتیان هێنـا، بەڕێ کەوتـن بـۆ ئـازاد کردنـی شـاری قەیصـەریە، دەسـەڵاتدارانی ئەو شـارە کەلەلایەن مەغـۆلەوە دانرابـون شـارەکەیان چۆڵکردبـوو، خەڵکـی شـارەکەش چونە پێشوازی سوڵتان (زاهیر بێبرس) و دڵیان زۆر خۆش بوو بە هاتنی سوڵتان.

زاهیر بێبرس نوێژی هەینی لەو شارە کردو چەند ڕۆژێك لەوێ مایەوە، ئینجـا خۆیـان ئامـادەکەن بـۆ گەڕانەوە بەرەو دیمەشـق، لەکـاتی گەڕانەوە بێبرس هێزێکی تر دەنێرێتە سەر (سیواس) لەوێوە هێرشێکی تـر دەکەنە سەر هێزێکی ئەرمەنییەکان کە داڵدەی هێزە شکاوەکەی مەغۆلیان دابوو.

ئەوەی جێـی سـەرنجە (زاهیـر بێبـرس) ئەرمەنییەکـانی بە دوژمنێکـی گەورە زانیوە بۆیە ڕێی پێنەداون ڕیزەکـانی خۆیـان ڕێکبخەنەوە، نـاوە نـاوە هێرشـی کـردونەتە سـەرو پـێش خۆڕێکخسـتنەوەی لێگرتـوون، مـانەوەی سوپاکەی (زاهیر بێبرس) لەناوچەکە نزیکەی یەك مـانگی خایەند، دوای ئەو ماوەیە بەغەنیمەیەکی زۆر گەڕانەوە وڵاتی شام.

---

(١) دەکەوێتە ناوەڕاستی تورکیای ئێستا.

## تاوانەکانی ئەبەقا لەتۆڵەی کوژراوەکانی مەغۆڵ

دوای ئەو شکەستە گەورەیەی بەسەر مەغۆڵەکان هات، لە (ئەبلوستین) و کەوتنی شاری (قەیسارییە)، ئەبەقا خۆی سەرپەرشتی هێزێکی گەورە دەکاو دێتە ناوچەکە، سەیر دەکا کوشتاری مەغۆڵەکان یەکجار زۆربووەو چەند سەرکردەیەکی نزیکی خۆی لەو جەنگە کوژراون بۆیە بڕیاری تۆڵە سەندنەوە لەخەڵکی ناوچەکە دەدا، سەرەتا (ئەبەقا) دەستی سەربازەکانی والا دەکاو، هەموو شارەکانی ئەو ناوچەیە دەکەونە ژێر قەتلوعامی مەغۆل، هەندێك لەسەرچاوەکان باس لەوەدەکەن هەر لە شاری (وان) و (ئەرزەن ڕۆم) تاوەکو (ئەبلوستین) نزیکەی (٢٠٠) هەزار کەسی بێتاوان دەکوژن، ئەبەقا تەواوی خەڵکی ئەنادۆڵی تاوان بارکرد بەیارمەتی سوپای زاهیر بێبرس، دوای کوشتارێکی زۆری خەڵکی بێتاوان ئینجا دەست لەکوشتنی ئەو خەڵکە هەڵدەگرێ، کەس و کاری مەغۆلە کوژراوەکان (موعینەدین پەروانە) تاوانبار دەکەن بەوەی ژێر بەژێری پەیوەندی هەبووە لەگەڵ سوپاکەی (زاهیر بێبرس) لەو کاتەش کەسێك بەناوی (ئەیبەکی شێخ) لەزاهیر بێبرس تووڕەدەبێ و ڕیزی موسڵمانان جێدەهێڵێ و دەچێتە لای (ئەبەقا)و پێی ڕادەگەیەنێ کە (پەروانە) پەیوەندی هەبووە لەگەڵ زاهیر بێبرس و نامەی بۆ دەنارد کەهێرش بکاتە سەر ناوچەکە[1]، بۆیە(موعینەدین پەروانە) زۆر دڕندانە دەکوژن دوای ئەوەی پارچە

(١) عقد الجمان في تاريخ أهل الزمان، لاپەڕە ١٦٣ بەرگی ٦.

پارچەی دەکەن و پارچەکانی دەخەنە مەنجەڵێك و دەیکوڵێنن و دیخۆن بۆ ئەوەی تورەبوون و هەستی تۆڵەیان دابمرکێ، کەس و کاری مەغۆلەکوژراوەکان لاشەکەی (موعینەدین پەروانە)یان خوارد و خودی ئەبەقاش پارچەیەکی لەگۆشتەکەی خوارد.

مرۆڤ خواردن لای مەغۆلەکان شتێکی ئاسایی بوو، لەکاتی جەنگ ئەگەر خواردنیان نەمابا نەفەرێکی خۆیان دەکوشت و گۆشتەکەیان دەخوارد.[1]

(١) کتێبی المغول فی التاریخ، لاپەڕە ٣٣٣ لاپەڕە ٢٣٠، تاریخ المغول منذ حملة جنکیز خان حتی قیام الدولة التیموریة.تاریخ الملك الظاهر . عزالدین محمد بن علي بن ابراهیم بن شداد. لاپەڕە ١٨٤.

# وەفاتی سوڵتان (زاهیر بێبرس) لەساڵی (٦٧٦) کۆچی

لە (٢٧) مانگی موحەڕڕەمی ساڵی (٦٧٦) سوڵتان (زاهیر بێبرس) لەدیمەشق بەنەخۆشی وەفات دەکا، ڕەحمەتی خوای لێبێ دوای ئەوەی نزیکەی (١٨)ساڵ سوڵتان بوو لەساڵی (٦٥٨) بەیعەتی پێدرا وەکو سوڵتان و لەساڵی (٦٧٦) وەفاتی کرد[١]، توانی خیلافەتی ئیسلامی بگێریتەوە و گەورەترین شکەستی بەسەر مەغۆل و ئەرمەنییەکان هێنا، پیاوێکی دینداربوو لەهەندێك سەرچاوە هاتووە زاهیر بێبرس بەر لەوەی ببێتە سوڵتان پێغەمبەری خوای (صلی الله علیه وسلم) لەخەو بینیوە و شمشێرێکی پێبەخشیوە نیشانەی حوکم ودەسەڵاتەکە بووە، بەڵام بەر لەوەی بمرێ بەچەند ڕۆژێك جارێکی تر خەو بەپێغەمبەری خۆشەویستمان (صلی الله علیه وسلم) دەبینێ پێی دەفەرمێ: شمشێرەکەتم بدەوە کە بەئەمانەت لات بوو.

بێبرس هەمان شمشێری دا بە (قلاوون)و دەزانێ ئەوە نیشانەی مردنە (قلاوون) بانگ دەکاو پێی دەڵێ: ئەگەر دوای من حوکمت کەوتە دەست باشبە لەگەڵ مناڵەکانم[٢]، لەدوای وەفاتی بەیعەت بەکوڕەکەی دەدرێ

(١) عقد الجمان بەرگی٦ لاپەڕە ١٨٢

(٢) لاپەڕە ٢٧٦ کتێبی الحوادث الجامعة والتجارب النافعة فی المائة السابعة ابن الفوطی.

کەناوی (الملك سعيد بەرەکەخان)بوو، بەڵام کوڕەکەی (زاهیر بیبەرس) وەکو باوکی بەغیرەت نەبوو بۆئەو ئیسلامە، زیاتر دونیا ویست بوو بۆیە کێشە دەکەوێتە نێوانی لەگەڵ زۆربەی سەرکردە سەربازییەکان، لەساڵی (٦٧٨) کۆچی لەدەسەڵات لایدەدەن و بەیعەت دەدەن بەبراکەی کەتەمەنی حەوت ساڵ بوو بەناوی (بدرالدين سلامش) و دەیکەن بەسوڵتانی مەمالیك نازناوی (مەلیك عادیل)ی پێدەبەخشن و (سەیفەددین قەلاوون) وەکو سەرکردەیەکی سەربازی سەرپەرشتی ئەو منداڵە دەکات کە کراوەتە سوڵتان، لەو بەینە (سەیفەددین قەلاوون) ڕێگا خۆش دەکات بۆئەوەی خۆی ببێتە سوڵتان، لە (٢٠) مانگی ڕەجەبی ساڵی (٦٧٨) قەلاون ئەو منداڵە لەسەر حوکم لادەدات و خۆی دەچێتە سەرکورسی سوڵتان و نازناوی (مەلیك مەنصور) هەڵدەگرێ و زۆربەی سەرکردەو زاناکانی دەوروبەری بەیعەتی پێدەدەن.

سوڵتان زاهیر بیبەرس کەسێکی باڵا بەرزی ئەسمەر بوو[1]، چاوی ڕەنگی شینی دەدا، پیاوێکی دەنگ گەورەی ئازاو بەجەرگ بوو، زۆربەی تەمەنی لەسەر پشتی ئەسپ و لەنێو گۆڕەپانی جەنگ بەسەربرد، دوژمنێکی سەرسەخت و گەورەی مەغۆل و ئەرمەنییەکان بو، زاهیر بیبەرس ڕەحمەتی خوای لێبێ توانی ترسی مەغۆلەکان لەدڵی موسڵمانان دەربێنێ و بەکردەوە بەو خەڵکەی ڕاگەیاند کەبەڵێ دەتوانین

---

(١) السلوك لمعرفة دول الملوك ٢، ٩٨.

شکەست بە مەغۆل بێنین، لەبەر ئەوەی لای خەڵکی واباو بوو هەرکەسێك گوتی مەغۆلەکان شکاون ئەوا ڕاست ناکات مەغۆل ناشکێن، ئەو شوێنانەی زاهیر بێبرس ئازادی کرد: (قەیساریە)[١] ئەو شارە لەژێر حوکمی خاچپەرستەکان بوو سوڵتان ئازادی کرد. (ئەرەسوف)[٢]، شاری (یافا) و شاری (ئەنتاکیە) و (بغراس) و(تەبەرییە) و (قوسەیر) و قەڵای (عوکار)و (قورەین) و (صافینا) و چەند قەڵایەکی تر.

هەمووی لەژێر حوکمی سەڵیبییەکان بوو، لەباشوری میسریش زۆربەی ئەو شوێنانەی ئازادکرد کەئێستا دەکەوێتە وڵاتی سودان، ئینجا تەواوی شامی لەدەست مەغۆلەکان دەرهێنا، دەیان قەڵا سنورییەکانی ئاوەدان کردوە دەیان پردی لەسەر ڕووبارەکان دروستکرد، دەیان قوتابخانەو نەخۆشخانەی لە شام ومیسر دامەزراند و سەدان ئاشی دروستکرد و دەیان جۆگەی لەڕووبارەکانەوە بۆ جوتیارەکان هەڵکەند بۆ گەشەپێدانی کەرتی کشتوکاڵ،[٣] بێبرس سەرەڕای ئەوەی دوژمنێکی سەرسەختی ئەرمەنی و مەغۆلەکان بوو، بەڵام بەشایەدی مێژوونوسە ئەوروپییەکان لەگەڵ خەڵکی سبیلی ئەرمەنەکان و نەسرانییەکان زۆر بەسۆزوبەزەیی بووە.[٤]

---

(١) ئەو شارە ئێستا دەکەوێتە ئیسرائیل و لە قەراغ دەریای ناوەڕاستە.
(٢) شارێکە لە فەلەستینە ئیسرائیل داگیری کردوە.
(٣) الوافي بالوفيات (١٠/ ٢١٢).
(٤) قصة الحضارة (١٣/ ٣٢٤).

تێبینییەکی گرنگ: لەو کاتەی خەریکی خویندنەوەی سەرچاوەکان و ئەو کتێبانە بووم کە لەو بوارەوە نوسراوە هەندێ هەڵەی زۆر گەورەم کەوتە بەرچاو لای خۆم تۆمارم کردوە و نەم ویستوە لێرە خوێنەری پێ سەرقاڵ بکەم، بۆنمونە لەکتێبی (تاريخ المغول منذحملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية) نوسەرەکەی (عەبباس ئیقباله)مێژوو نوسێکی فارسە و کتێبەکە دکتۆر (عبدالوهاب علوب) وەریگێراوەتە سەر زمانی عەرەبی سەرەڕای ئەوەی ئەو کتێبە کتێبێکی بەسودە، بەڵام چەند هەڵەیەکی تێدایە بۆنمونە کە باسی وەفاتی (زاهیر بیبرس) دەکات دەڵێ: دوای (٢٧) ساڵ لەحوکم وەفاتی کرد و جەنازەکەشی بردایەوە بۆمیسر[١]، بەڵام زاهیر بیبرس نزیکەی ١٨ ساڵی حوکمی کردوە و لە دیمەشقیق بەخاکسپێردراوە، ئەو جۆرە هەڵەیە ئەگەر وریای نەبی لەو کتێبە دەگوازرێتەوە بۆ کتێبێکی تر، ئەگەر خوای گەورە پشت و پەنابێ لەکۆتایی ئەو زەنجیرە کتێبە مێژووییە هەڵسەنگاندێك دەکەین بۆ ئەو کتێبانەی لەو بوارەوە نوسراوەتەوە بەتایبەتی دیراسە ئەکادیمییەکان مەبستم ماستەر نامەو دکتۆرا نامەکانە.

گرنگە بەکورتی و بەچەند خاڵێك باس لە ڕۆڵی زاهیر بیبرس بکەین لە دامەزراندن و قایم کردنی دەوڵەتی مەمالیك.

زاهیر بیبرس ڕۆڵێکی زۆر سەرەکی بینی لە شکەستی مەغۆل وخاچپەرەستەکان، بۆشاییەکی زۆر گەورەی بۆ ئەو ئوممەتە پڕ کردەوە

(١) لاپەڕە ٢٣٠.

لەزەمەنێك کەپڕ بوو لەمەینەتی و کاولکاری و بەکۆیلەکردنی ژن و منالی موسلمانان، لێکۆلینەوە لەو جۆرە کەسایەتییە دەتوانین بلێین واجیبە لەکاتێکی وەکو ئەمڕۆدا کە دور نییە بلێین هەمان سەردەمی مەغۆلە و ئوممەت پێویستی بە بێبرسێك هەیە دەستی بگرێ و لەو میحنەت و ناخۆشیانە ڕزگاری بکات بۆیە گرنگە بەکورتی و بەچەند خالێك باسی کارە گەورەکانی ئەو پیاوە بکەین.

یەکەم: نەهێشتنی کێشە ناوخۆییەکان وەکو کوژاندنەوەی شۆرشەکەی (علم الدین سنجری حەلەبی) لەسالی (٦٥٨)کۆچی، کاتی خۆی سەیفەددین قوتوز کردبوی بە خاوەنی حەلەب، دوای کوشتنی قوتوز (حەلەبی) بڕیاری دا بەڕووی (بێبرس) ڕاپەڕێ و داوای خوێنی قوتوز بکاتەوەو داوای یارمەتی کرد لە لەپادشاکانی حیمص و حەما، بەلام کەس بەهانایەوە نەهات و بێبرس توانی شۆڕشەکە بکوژێنێتەوە.

دووەم: کوژاندنەوەی شۆرشەکەی قاهیرە بەسەرپەرشتی پیاوێکی شیعی بەناوی (کۆرانی) کە داوای گێرانەوەی حوکمی ئالوبەیتی دەکرد، کە مەبەستی فاتیمییەکان بوو (بێبرس) توانی ئەو پیاوە لەگەل دەورو بەرەکەی دەستگیر بکات و دواتر لەگەردەنیان بدا، بەکوشتنی ئەوانەش فیتنەی ڕافیزە لە قاهیرە بەیك جاری کوژایەوە.

سێیەم: لەناو بردنی دوژمنەکانی لەبنەمالەی ئەییوبییەکان، (مەلیك موغیسی کوڕی مەلیك عادیلی کوڕی مەلیك کامیل) خاوەنی قەلای

(کەرِك) پێی وابوو کەئەو خاوەنی کورسی سوڵتانە نەوەك مەمامليکەکان، بێبرس سوپايەکی گەورەی ناردە سەری مەليك موغيس پەشيمانی خۆی دەربڕی دواتر هەواڵ بڵاو بويەوە کەژێر بەژێری خەريکی پەيوەنديية لەگەڵ هۆلاکۆ، ئەوە بوو بێبرس دەستگيری دەکات و دەيهێنێتە قاهيرە و لەوێ دەيکوژن و بەکوشتنی ئەو کێشەی بنەماڵەی ئەييوبييەکانيش کۆتايی پێدێ.

چوارەم: واژۆکردنی چەند پەيمانێکی گرنگ لەگەڵ پادشای بێزەنتييەکان .

لەساڵی (٦٦٠) وەفدێك دەنێرێتە لای ئيمپراتۆڕی بێزەنتەکان ميخائيلی هەشت باليولج، وەفدەکەی بێبرس بەسەرپەرشتی ئەمير فارس الدين اقوش المسعودی بوو توانی ئەگەر بۆشێوەيەکی کاتيش بێ ئەو پەيمانانە بقۆزێتەوە بۆ ڕێکخستنەوەی سوپاو سەقامگير کردنی بارودۆخی مەملەکەتەکەی.

پێنجەم: دروستکردنی پەيوەنديێکی زۆر چاك لەگەڵ سوڵتان (بەرەکەخان).

زاهير بێبرس گرنگێکی يەکجار زۆری بە پەيوەندييەکانی دا لەگەڵ سوڵتان (بەرەکەخان) زۆر جار دياری زۆر بەنرخی بۆ دەناردو کچەکەی (بەرەکە خان) دەخوازێ و فەرمان دەکا لەسنوری مەملەکەتەکەی ڕۆژانی

هەینی دوعا بۆ (بەرەکە خان) بکرێ، ئەوەش ببوە مایەی دڵخۆشی (بەرەکەخان) کەتوانیان پێکەوە زیانی زۆر گەورە بە هۆلاکۆ بگەیەنن.

شەشەم: قایم کردنی سنورەکان: ئەوەشیان هەنگاوێکی زۆرگرنگی سوڵتان زاهیر بوو، بۆ قایم کردنی سنورەکانیش دووهەنگاوی نا.

یەکەم: یارمەتی دانی ئەو عەشیرەت و هۆزانەی ناوچەسنورییەکان، ئەو پێداویستیانەی بۆ دابین کردن کە بتوانن لەو ناوچانە بمێننەوە.

دووەم: دیوارو قەڵای ناوچە سنورییەکانی دووبارە دروستکردەوەو قایمی کردن و پڕچەکی کردن بۆ ئەوەی ببنەکۆسپێك لەبەردەم هێرشی مەغۆلەکان لەهەمان کات وەکو خاڵی چاودێرش مامەڵەی لەگەڵ کردن.

حەوتەم: دامەزراندنی تۆڕێکی زۆر بەهێز بۆ گۆڕینەوەی نامەکان واتە(بەرید) دوو ڕێگاشی بۆ ئەو مەبستە گرتە بەر یەکێیان لەڕێی ئەسپی خێرا کە سوار چاکەکە دەیتوانی لەقاهیرەوە بگاتە دیمەشق بەسێ ڕۆژ، ئەوەی تر لەڕێی ئەو جۆرە کۆترانەی پێی دەگوترێ (زاجل) بنکەی سەرەکی گەیشتن و دەرکردنی نامەکان لە قاهیرە بوو.

هەشتەم: دامەزراندنی چەند کارگەیەك بۆ دروستکردنی کەشتی، لەناوچەی دومیات و ئەسکەندەریە هەر بۆیە بڕیاری دا نابێ بەهیچ شێوەیەك دارو درەخت بفرۆشرێ بۆ دەرەوەی وڵات، بەڵکو دەوڵەت بەخۆی هەموی دەکڕیەوە بۆ دروستکردنی کەشتییەکان.

نـۆیەم: باوەشـی کـردەوە بـۆ کەسـی ئـازاو عەقڵـی سـەربازی گەورە و گرنگێکی زۆری پێدان کە بووە مایەی ئەوەی لەدەروەی وڵات بەتایبەت لەناوچەی ترکمانستانەوە گەنجێکی زۆر ڕوو لەمیسربکەن و سودێکی زۆر لەئازایەتی ئەوانە وەرگیرا.

دەیەم: لەهەموشی گرنگتر گرنگی دانێکی زۆر بە مەدرەسە دینییەکان کەلەوێـوە دروشـمی جیهـاد هەڵدەگیرسـا و هەزاران خـۆبەش بەنیەتـی جیهادکردن لەپێناو خوای گەورە ڕوویان کردە ئەو مەدرەسانە.

ئەو خـاڵانە بەکـورتی هەنـدێك بـوون لەهەنگـاوە گرنگەکـانی (زاهیـر بێبرس)، کە پڕن لەحیکمەت و هەنگاوی کەسێکی عاقڵی دڵسۆزە بۆ دین و خاك و ئایندەی ئەو خەڵکە، بۆیە (زاهیر بێبرس) بەیەکێك لەگەورەترین سەرکردەکانی ئەو ئوممەتە هەژمار دەکرێ ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ.

# بابەتێکی گرنگ

## (محمود یلواج) و وەزارەتەکەی چ ڕۆڵێکیان بینی لە کەم کردنەوەی ئازاری ئەو ئوممەتە؟

سەرەتا پێم خۆشە سەرنجی خوێنەر بۆخاڵێکی گرنگ ڕاکێشم، ئیمام (عزالدین عبدالعزیزی کوڕی عبدالسلام) کەلە ساڵی (٦٦٠) وەفاتی کردوە، لەکتێبی (قواعدالاحکام فی مصالح الانام) بەرگی یەکەم لاپەڕە٨٥ دەفەرمێ:

ولو استولی الکفار علی اقلیم عظیم فولوا القضاء لمن یقوم بمصالح المسلمین العامة، فالذي یظهر انفاذ ذلك کله جلبا للمصالح العامة ودفعا للمفاسد الشاملة).

واتە: ئەگەر کافرەکان ئیقلیمێکی گەورەی موسڵمانانیان داگیرکرد، کەسێکی موسڵمانیان دیاری کرد بۆ قەزاوەت، بۆ بەرژەوەندی گشتی موسڵمانان، وای بۆدەچم کە ئەمە هیچی تێدانەبێ.

ئیمام (عیزی کوڕی عەبدولسەلام) ڕەحمەتی خوای گەورەی لێبێ لەساڵی (٦٦٠) وەفاتی کردوە، وەکو بڵێی باس لە ئەزمونێك دەکات کەپێی گەیشتبێ، لەبەر ئەوەی (محمود یلواج)ی وەزیر لەساڵی (٦٥٨) وەفاتی کردووە واتە دوو ساڵ بەر لەئیمام عیزی کوڕی عبدالسلام، ئینجا نێوانی

مەمالیك و دەوڵەتی مەغۆلە موسڵمانەکان زۆر بەهێز بوو، هاوکاری یەکتر بوون لەدژایەتی دەوڵەتەکەی هۆلاکۆ، کەوابوو وەرگرتنی وەزارەت لە ژێر دەسەڵاتێکی موشریکی دڕندەی کاوڵکاری وەکو دەسەڵاتەکەی جەنگیزخان، ئەگەر بکرێ لەڕیی ئەو وەزارەتەوە ئازار کەم بکرێتەوە لەسەر موسڵمانان و موسڵمانان نەفەسێکی پاکی ئیمانی لەژینگەیەکی ئاواکوفری هەڵمژن لای ئیمام عیزی کوڕی عبدالسلام ڕێپێدراو بووە و ئەوەی بەهەنگاوێك زانیوە بۆپاراستنی مافی موسڵمانان و گێرانەوەی دادوەری.

ئەو بابەتە گرنگە ئەوەندە ڕوونە و مێژوو پێمان دەڵێ هەنگاوێکی گەورەو حەکیمانە بووە، خەڵکانێك بەو کارە هەڵساون خۆیان لەناو ناخۆشییەکان دابووینە، ئەو حاڵەتە زۆر جیاوازە لە حاڵەتی ئەو کەسەی قسە لەسەر ئەو بابەتە دەکا کەهیچ کاریگەری لەسەر واقیع نییەو بگرە گۆڕینی واقعیش خەمی ئەو نییە تەنها لە سوچێك بەدیار هەندێ کتێب دانیشتوەو فەتوا بەڕاست و چەپیەوە دەردەکات.

موسڵمانان وەزارەتەکەی (محمود یلواجی خەواریزمی)یان بەڕەحمەتێکی گەورە زانیوە، لەبەر ئەوەی چەتر و پەنایێکی گەورەبوو بۆیان خوای گەورە (محمود یلواج) و (مسعود)ی کوڕی کردە هۆکارێك دەیان مزگەوت و خوێندنگای شەرعی و شاری موسڵمانانیان پێئاوەدان کرایەوە، بۆیە لام گرنگ بوو ئاماژە بەژیانی ئەو پیاوە بکەین.

## محمود يلواج كێ بوو؟

ناوی (فخرالـدين ابـو القاسـم محمـودی کـوڕی محمد)چەنـد نازنـاوێکی هەبـــووە وەکـــو (محمـــودخەواریزمی)لەبەرئەوەی خەڵکـــی خەواریـــزم بووە(يلـواج)يش بەزمـانی تـورکی ئيگـوری يـانی (نـوێنەر) نـاونراوە نـوێنەر لەبەرئەوەی، بەنـوێنەرايەتی (جەنگيزخـان) چـۆتە زۆر شـوێنان، هەروەهـا بە(مەحمـودی وەزيـر)يش نـاوبراوە، محمـود يەڵـواج بازرگـانێکی سـەرکەوتوو بووە، چەند زمانێکی زانيوە، جگە لەعەرەبی و تورکی زمانی تەتـارو هينـد و فارسيشی زانيوە.

ســـەرەتا بەرلەوەی (جەنگيزخـــان) هێـــرش بکـــاتە ســـەر دەوڵەتـــی خەواريزميييەکـان، محمـــود يەڵـــواج نـــاوچەکە جێـــدەهێڵێ و دەچێـــتەلای جەنگيزخان.

جالێرە گرنگە ئاخۆ يەڵواج لەبەر چی ناوچەکە جێدەهێڵێ و پەيوەندی بەجەنگيزخان دەکا ؟

وەڵامـــی ئەو پرســـيارە لەســـەرچاوە مێژووييەکـــان ڕوون نيـــيە، بەڵام بەخوێنـدنەوەی سياسـەتە نـاحەکيمەکەی (خەواريـزم شـاە)و بنەمـاڵەکەی ئەو قەنـاعەتەت بـۆ دروست دەبێ کەپيـاوی عـاقـڵ و ژيـر و حەکـيم نەيتوانيـوە لەژێـر سـێبەری دەسـەڵاتە نـاحەکيم و پڕلەسـتەمەکەی خواريزماشـا ژيـان بەرنەسەر، دەيان کەسی بەتواناو عەقڵی گەورەی ئەو ئوممەتە يـان دەبوايە شـوينکەوتەی هەواو نەفـس و بڕيـارە ناشـەرعی و ناحەکيمەکـانی خەواريـزم

شاە بوایە یان دەبوایە ناوچەکە بەجێبهێڵێ ئەگەر نا نەدەبوو لەژیانی خۆی ئەمین بێت.

دور نییە ئەو هۆکارە بوبێ کە یەڵواج ڕێزی خەواریزم شاهی جێهێشت، بەپێی ئەو کردەوە چاکانەی یەڵواج کردی ناکرێ تۆمەتی سیخوری و هەڵگەڕانەوە لەدینی بدەینە پاڵی لەبەر ئەوەی کردەوەکانی پێمان دەڵێن کە کەسێکی ئیسلام دۆست بوەو حەزی بەکاولبونی مەملەکەتەکەی نەکردوە، بەهەر حاڵ دوای ئەوەی(محمود یلواج) خەواریزم جێدەهێڵێ جەنگیزخان بە عەقڵ و تواناو لێهاتووی ئەو پیاوە دەزانێ، بۆیە دەیکاتە نوێنەری خۆی و یەکەم وەفد کە لەجەنگیزخانەوە ڕەوانەی لای خەواریزم شاە دەکرێ بەسەرپەرشتی (محمود یلواج) بوو، یەڵواج سەرکەوتوانە دەتوانێ ڕێککەوتنێکی بازرگانی بەدەست بێنێ لەنێوان (جەنگیزخان) و (محمود خواریزم شاە) کەدواتر خەواریزم شاە ڕێککەوتنەکە دەشکێنێ، هەر وەکو لەهێرشی مەغۆل بۆ سەرجیهانی ئیسلامی باسمانکرد .

دوای ئەوەی جەنگیزخان دەمرێ و (ئۆکتای) دەچێتە شوێنی و دەبێتە خانی گەورەی مەغۆل، ڕیزو گەورەیی (یەڵواج) دەپارێزێ و بەڕێوبردنی تەواوی تورکستانی ئیستا تاوەکو ڕووباری (جیحون)ی پێدەسپێرێ، بەوەش دەبێتە حاکمی فیعلی ناوچەکە و بەناوی (ئۆکتای) حوکم دەکات، ئینجا (مسعودی کوڕی مەحمود یەڵواج) ئەویش ڕۆڵێکی سەرەکی دەبینێ لەگەڵ باوکی لەئیدارەی ئەو ناوچە فراوانە، ئۆکتای ئەوەندە متمانەی

بەدەستپاکی محمود یلواج هەبوو، گەنجینەیەکی هەبوو دڕو مەرجان و ئالْتون و بەردی گران بەهای زۆری تێدابوو ئەو گەنجنەیە لای محمود یلواج هەڵگیرابوو.

## شۆڕشەکەی (محمود تارابی) لەساڵی (٦٣٦) کۆچی و هەڵوێستەکانی (محمود یلواج)

لەساڵی (٦٣٦) کەسێك لەبوخارا سەری هەڵدا بەناوی (محمود تارابی) ئەو پیاوە بەناوی زیکرو خواپەرستی، باسی ئەوەی دەکرد کەدەتوانێ غەیب ئاشکرا بکات و دەزانێ لەئاینده چی ڕوودەدات، ئەو کاتیش خەڵکێکی زۆر لە بوخاراو تورکستان ڕوویان کردبوە ئەوەی ناونراوە (جیهانی ڕۆح) و قسەکردن لەغەیبیات، تاڕادەیەکی زۆر خوڕافە زاڵ ببوو بەسەریان، یەکێك لەوانەی کاریگەرێکی زۆری بەسەر ئەو خەڵکە هەبوو خوشکەکەی محمود تارابی بوو، توانیبوی خەڵکێکی زۆریش لەدەوری براکەی کۆبکاتەوە، مژدەیەکی زۆریشیان بەو خەڵکە دەدا کە ئەوان لەڕێی غەیبەوە زانیویانە محمود تارابی گۆڕانکارێکی گەورە بەسەر ناوچەکە دێنێ، هەر لەو کاتەش یەکێك لەزاناکانی ئاینی شاری بوخارا ئەوەی بڵاوکردەوە کە لەکتێبەکان هاتوەو ئەو خویندویەتیەوە: کە کەسێك لە (تاراب) دەردەکەوێ تەواوی جیهان ڕزگار دەکات، ئەو کەسەش زۆرپێدەچێ محمود تارابی بێت، بەمەش خەڵکی زیاتر لەدەوری کۆبونەوە.

لەزۆربەی ئەو کاتانەی موسڵمانان لەواقیع شکەست دێنن، ڕوودەکەنە ئەو جۆرە خورافەیەو ئومێدێکی گەورەی لەسەر هەڵدەچنن، بۆیە خەڵکێکی زۆری شارو دێهاتەکان ڕوودەکەنە بوخاراو لەدەوری (محمود تاراب) کۆدەبنەوە، کۆبونەوەکە شێوەی شۆڕشێك وەردەگرێ، کاربەدەستەکانی شاری بوخارا نەیانتوانی چۆن مامەڵە لەگەڵ حاڵەتەکە بکەن سەرەتا هەوڵیاندا ئەو خەڵکە پەرت بکەن، بەڵام سودی نەبوو، بۆیە ناردیان بەدوای (محمود یلواج) و داوای چارەسەی بارودۆخەکەیان لێکرد.

ئەوەی لێرە زۆر ترسناك بوو ئەوە بوو، ناوچەکە خەریك بوو تۆزە سەقامگیرێکی بەخۆوە دەبینێ و محمود یەڵواج وردە وردە ئەمان و ئاوەدانی بۆ ناوچەکە دەگێرایەوە، بونی ئەو جۆرە شۆرشە کە هیچ هەدەفێکی ڕوونی نەبوو تەنها بەڵێنی کەسێکە گوایە لەغەیب دەزانێ و هاتوە نەك هەر بوخارا، بەڵکو تەواوی جیهان لەدەست مەغۆل ڕزگار دەکات، ئەو جۆرە شۆڕشە بێگومان جۆرە تێکدانێکە بۆ پلانی ئاوەدانکردنەوەی ناوچەکە کە لەبەر دەستی محمود یەڵواج بوو، لەهەمان کاتدا دوژمنانی مەحمود یەڵواج چاویان بڕیبوە تەشەنەکردنی ئەو جۆرە کارانە بۆئەوەی بچنە لای خانی گەورەو ئەوەی بۆ بسەلمێنن کە یەڵواج شایستەی ئەو متمانە گەورەیە نییە کە پێت داوە، بەوشێوەیە پلانی ئاوەدان کردنەوەی ناوچەکە هەڵدەوەشێننەوە.

محمود یەڵواج کەبەوەزعەکە دەزانێ دەنێرێ بەدوای (محمودتاراب)وپێی

دەڵـێ: سـەردانمان کەن و گەورەمـان کەن بەو سـەردانە و لەهەمـان کاتـدا لەسەر هەندێ بابەت گفتوگۆ دەکەین.

یەڵواج مەبەستی وابوو (تاراب)لای خۆی بهێڵێتەوە تاوەکو خەڵکەکەی دەورو بەری پەرت دەبن، لەهەنـدێ سەرچاوەش هاتوە کە(محمـود یەڵـواج) بۆسەیەکی دانابوەوە بۆئەوەی (محمود تاراب) بکوژێ، ئەو کاتەی(تاراب) نزیك دەبێتەوە لەکۆشکی یەڵواج سەربازێکی زۆری مەغۆلەکان دەبینـێ و بەنیازیـان دەزانـێ، بـۆیە پێیـان دەڵـێ: ئەگەر ڕێگـام نەدەن ئێستا چاوتـان دەردەکەم، ئەوەش ترسێکی زۆری خستە دڵی سەربازە مەغۆلەکان یان بڵێین دڵی ئەوانەی بۆسەکەیان بۆ(تاراب) دانابوەوە.

هەندێك لەمەغۆلەکانیش باوەڕیان هەبوو کە ئەو پیاوە هێزێکی تایبەتی لەگەڵ لەجیهـانی ڕۆحەوە یـارمەتی دەدرێ، ڕیگاکەیـان بـۆ خۆشـکردوو (تاراب) گەیشتە لای کۆشکی (سنجر الملك).

خەڵکـی شـارەکە کەبەهـاتنی (تـاراب)یـان زانـی کۆبـونەوەو دەوری کۆشـکەکەیان دا بەمەبەسـتی تەبەڕوك وەرگـرتن لێـی، دەرگـای کۆشـکەکە داخرابوو، محمود تاراب چوە سەربانی کۆشکەکەو زاری پڕ دەکرد لەئاوو ئەو خەڵـکەی پێدەڕشـاند، ئەوەی ئـاوی زاری (تـاراب)ی بەرکەتبـا وەکـو بڵێی بەرەکەتێکی گەورەی بەرکەوتوە دەچوە دواوەو خەڵکی تر دەهاتنە پێش بۆ وەرگرتنـی ئەو بەرەکەتە، لەو کـاتە یەکێك لەپیاوە نزیکەکـانی (محمـود تاراب) ئەوەی پێڕادەگەیەنـێ کە تـازووە ئەو شـوێنە بەجێبهێڵە لەبەر ئەوەی

پیلانی کوشتنی تۆ لەئارادایە.

محمود تاراب شوێنەکە جێدەهێڵێ و بەیارمەتی هەندێك لەوانەی لەکۆشکەدا بوون و بەنهێنی دەردەچێ و دەچێتە دەرەوەی شار و لەسەر تەپۆڵکەیەك ڕادەوەستێ، مەغۆلەکان کەزانیان لە کۆشکەکە دەرچوەو چۆتە سەرتەپۆڵکەیەك لەدەرەوەی شار ئەو باوەڕەیان لادروستبوو کە (تارابی) فڕیوە ئەگەر نا چۆن وازوو لەکۆشکەکە ڕزگاری بوو و گەیشتە دەرەوەی شار، بۆیە لەدەرەوەی شاریش خەڵکی ڕوویان لەتارابی کردو دەورو بەری زۆر قەرەباڵغ بوو، لەو کاتە (تارابی) وتاری بۆ ئەو خەڵکە داو پێی گوتن کەسوپاکەی من دووبەشە بەشەکی ئەوە ئێوە دەیبینن بەشەکەی تری فریشتەکانی ئاسمانەو ئێوە نایانبینن، جگە لەوان لەکاتی پێویست جنۆکەکان لەژێر زەویش دەردەچن و پشتیوانی ئێوە دەکەن، خەڵکەکە باوەڕیان زیاتر بە(تاراب)بەهێزتر بوو تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی لەڕۆژی هەینی و لەسەر مینبەری مزگەوتەکان ناوی(محمود تاراب) هێنراو و دوعای بۆکرا وەکو خەلیفە.

لەدوای نوێژی هەینی خەڵکی هێرشیان کردە سەر دامودەزگا فەرمی و ماڵی بەرپرسەکان و ئەوانەیان هەموو تالآن کرد، دیسان جۆرەك لە گەرەلاوژەیەی ڕووی لەناوچەکە کردو خوشکەکەی (محمود تاراب) کەوتە گلەیی لەبراکەی و ڕایگەیاند کەبراکەی لەو ڕێگایە لای داوە کە بۆی نەخشێنرابوو، بۆیە هەندێك لە بزوتنەوەکەی (محمود تارابی) کشانەوە، لەو

کاتەش هێزێکی گەورەی مەغۆلەکان هاتن و ناوچەکەیان گەمارۆ داو دواتر سوپای مەغۆل و سوپاکەی (محمود تارابی) ڕوو بەڕووی یەکتر بوونەوە، لەیەکەم ڕوو بەڕوو بونەوە (محمود تارابی) ون دەبێ، لایەنگیرانی تارابی ئەو باوەڕەیان بۆ دروست دەبێ کە (تارابی) فڕیوە و بەشێوەیەکی کاتی ون بووە، بۆیە هەردوو برای بەناوی (محمد و علی) دەخەنە شوێنی تارابی، لەهەمان کاتدا سوپاکەی تارابی ئەو هەواڵەشیان بڵاو کردەوە کە ئەوان پێویست بەشمشێر ناکەن بۆ ڕوو بەڕوو بونەوەی مەغۆلەکان، بەڵکو دارو بەرد بەسە بۆ ئەم شەڕە لەبەرئەوەی خوای گەورە سەریان دەخات بەسەر سوپاکەی مەغۆل، سوپاکەی مەغۆل بەسەر پەرشتی (ئیلدز نەویان و جەکین قورچی) بوو ئەوان خەڵکێکی یەکجار زۆریان کوشت و بڕیاریشیان دابوو تەواوی ناوچەکە کاوڵ بکەن بەتایبەت شاری بوخارا.

لەو کاتە(محمود یەلواج) بەتوندی دێتە سەر خەت و دەسەڵاتی خۆی بەکار دەهێنێ و دەڵێ: ئێوە چۆن شارێك کاوڵ دەکەن کەمن ماوەیەکی زۆرە بەئاوەدان کردنەوەی خەریکم.

ئینجا مەحمود یەڵواج بەسوپاکەی مەغۆل دەڵێ: مافی ئەوەتان نییە تۆڵە لەخەڵکی شارەکە بکەنەوە بەبێ ڕەزامەندی خانی گەورە (ئۆکتای) و وەفدێك دەنێرێ بۆلای (ئۆکتای) و لێی دەپاڕێتەوە کەبڕیاری لێخۆشبوون بۆخەڵکی بوخارا دەربکا، (ئۆکتای) پێشنیارەکەی (محمود یەلواج) قبوڵ دەکات و بڕیاری لێخۆش بوون بۆ خەڵکی بوخارا دەردەکات و شاری بوخارا

لەکاولبوون ڕزگاری دەبێ، زۆربەی سەرکردەکانی دەورو بەری (تارابی) دەکوژرێن هەندێکیشیان ڕادەکەن و پەنا بۆ شیخ (سەیفەددین باخەرزێ) دەبەن کە پەنایان بدا لە سوپاکەی مەغۆل، لەهەندێ سەرچاوە هاتوە، مەغۆلەکان ڕاستە ئەوانە ناکوژن، بەڵام وەکو سزایەك ناو چەوانیان داغ دەکەن، هۆکاری دیار نەمانی مەحمود تارابیش ئەوە بووە، کە لەپەنایەك کوژراوەو کەس پێی نەزانیوە لەبەرئەوەی لەمەیدانەکە ڕای کردبوو.

یەکێك لەکارە هەرە گەورەکانی (محمود یەلواج) ڕزگارکردنی شاری بوخارا بوو لەو کاولکاریەی کەچاوەڕوانی دەکرد، ئەو جۆرە ڕووبەڕوو بونەوەیە کەبەرنامە ڕێژیەکی تەواوی بۆنەکراوە زۆربەی جارەکان نەك هەر سەرکەوتونابێ، بەڵکو دەبێتە هۆکاری کاولکردنی ئەو شوێنانەی کەئاوەدانن.

لەدوای مردنی (ئۆکتای) و هاتنی (کیوك) کەدەکاتە ساڵی (٦٤٤) تاوەکو ساڵی (٦٤٧) کۆچی محمود یەڵواج هەر لەدەسەڵاتی خۆی دەمێنێ و لەدوای (کیوك) لەساڵی (٦٤٩) تاوەکو ساڵی (٦٥٨) (مەنکۆخان) دەبێتە خانی گەورەی مەغۆل، (محمود یەڵواج) هەر هەمان دەسەڵاتی دەمێنێ.

لەبواری ئابوری چەند چاکسازیەك دەکاو دەتوانێ فشاری ئابوری لەسەر خەڵکی ناوچەکە کەم کاتەوە بەرلە محمود یەڵواج دەبوایە هەر کەسێکی ئاسایی ساڵانە یەك دینار باج بدات، دەوڵەمەندیش دەبوایە ساڵانە

پازدە دینار باج بدات، بەڵام محمود یەڵواج ئەو یاسایەی گۆڕی باجەکە بەپێی حاڵەتی کەسەکە وەردەگیرا، واتە مەرج نییە هەموو کەسێك بتوانن یەك دیناری سالانە بدەن و مەرجیش نییە هەموو دەوڵەمەندێك بتوانێ سالانە پازدە دینار بدات، بەوەش توانی تارادەیەکی زۆر ئەو فشارە ئابووریە لەسەر خەڵکی ناوچەکە کەم کاتەوە، ئینجا داهاتی سالانەی ئەو پارەیە، زۆربەی خەرج دەکرا بۆ خۆشکردنی ڕێگاوبانە گشتییەکان بۆئەوەی کاروانی بازرگانان وهێزە سەربازییەکان بەئاسانی ڕێ بکەن وبەبڕیاری خانی گەورە پلانەکەی محمود یەڵواج کاری لەتەواوی مەملەکەتی مەغۆل کاری پێدەکرێ، ئینجا فەرمان دەردەکرێ لەو بڕە پارەیە نابێ هیچ پارەی تر لەخەڵکی وەربگیرێ.

سەردەمی محمود یلواج و مەسعودی کوڕی بەسەردەمی ئاوەدانی ناوچە ئیسلامییەکان هەژمار دەکری، زۆربەی شارەکاوڵەکانیان ئاوەدان کردوە، مەداریسی ئاینی و مزگەوتەکانیان بەجوانترین شێوە بینا کردەوە، مەسعودی کوڕی محمود یەڵواج قوتابخانەیەکی دروستکرد بەناوی (المدرسة المسعودیه) زیاتر لە (١٠٠٠) قوتابی زانستی شەرعی تێیدا خەریکی وەرگرتنی زانست بوون، محمود یەڵواج و مەسعودی کوڕی دەتوانن تەواوی ناوچەی وڵاتی ئەودیوی ڕووبار ئاوەدان بکەنەوە، ئاسایشی ناوچەکە بگێڕنەوەو موسڵمانان بپارێزن لەستەمی مەغۆلەکان، تا ساڵی (٦٥٢) محمود یەڵواج لە شاری (خان بالق) کەدەکاتە (پکین)ی ئیستا

وەفــات دەكــا و هەر لەوێــش دەنێــژرێ دواتــر كــوڕو نەوەكــانی حــوكمی ناوچەكەدەكەن.

بــۆیە دەڵێــین، فیقهــی سیاســەت كــردن كەســێك دەیزانــێ كە سیاســەت دەكات، ئەو جۆرە فیقهە بەتەنها لە هەناوی كتێبەكان دیراسە ناكرێ، ئەو كەسـەی لە مەیـدانەكەیەو لەململانـێ دایە لەگەڵ هێـزە كوفرییەكـان زۆر جیاوازە لەگەڵ ئەو كەسەی تەنها لەسوچی ماڵەكەی لەسیاسەتی شەرعی دەكـۆڵێتەوە، پـێم وایە ئەو كەسـەی سیاسـەت ناكـا نـاپێكێ كاتێـك باسـی هەنگاوەكانی سیاسەتی شەرعی دەكات، بەتایبەت لەسەردەمێكی وەكو ئەو ڕۆمانـدا كە هەنگاوەكـان بـۆ گێـرانەوە خـیلافەت و دامەزرانـدنی حوكمێـك شەریعەت تێیـدا حـاكم بێت، ئەو هەنگـاوانە زۆر جیـاوازە لەگەڵ سـەردەمێك سیاسـەت و حـوكم ئیسـلامی بـوون، بەڵام زانایـان باسـی ئەخلاقـی سیاسـیان دەكردو بەدامو دەزگای دەوڵەتیـان دەگـوت كەسـی سیاسـی موسـڵمان دەبێت پابەنـدی ئەخلاقـی ئیسـلامی بێـت لەبەڕێـو بردنـی وڵات و حـوكم كـردن، ئەگەر یەڵـواج بەشـداری دەوڵەتەكەی جەنگیزخـانی نەكردبـا بـێ گومـان، كەسـێكی تـر دەچـوە شـوێنی ئەو وئەوەی بەئـاوەدانی مـاوە ئەویشـی كاوڵـدەكرد، بەشـداری كـردن لەچـوار چێـوەی سیسـتەمێكی نائیسـلامی كـوفری دەبێ لەگۆشـەیەكی تـرەوە دیراسـە بكرێ، بەشداری كـردنەكە نەك بەناوی پشتگیری كردنی كوفرو قەناعەت بێ بە گۆڕینی شـەریعەت پەنا بەخوا، بەڵكو لەو ڕوانگەیەوە بێ، ئەگەر كەسێك بتوانێ ڕۆڵێكی ئیجابی لەچوار چێوەی سیستەمێكی نائیسلامی ببینێ، ڕێگە پێدراوە خۆ ئەگەر

نەشتوانێ حوکم بەشەریعەتی خوا بکا دەتوانێ ستەم لەسەر ئەو خەڵکە کەم کاتەوە یان زەمینەیەکی ئاوا دادپەروەریانە بڕەخسێنێ، نەوەی ئاینده بتوانن ئیسلامییانە نەفەسێك هەڵمژن، دەوڵەتەکان ئەگەر ئیسلامی نەبوون و نەشتوانرا بەئیسلامی بکرێ، گرنگە هەولبدێ دەوڵەتێکی (نەجاشی)یانە بێ، پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیه وسلم) کەزانی ناتوانێ موسڵمانان لەستەمی قورەیش بپارێزێ، فەرموی لو خرجتم الى ارض الحبشة فان بها ملكا لايظلم عنده احد، وهي أرض صدق حتى يجعل الله لكم فرجا. سيرة ابن هشام (١/ ٣٢١)

ئەگەر ڕووبکەنە خاکی حەبەشە، مەلیکێك حوکمی دەکات کەس لای ئەو ستەمی لێناکرێ، ئەو خاکە خاکی ڕاستگۆییە واتە خیانەتی تێدا ناکرێ، بڕۆنە ئەوێ تاوەکو خوای گەورە دەروێکی ڕەحمەت دەکاتەوە، بۆیە لێرە زۆر گرنگە ئەوە بزانێن ئەگەر موسڵمانان نەتوانن حوکمێکی شەرعی بگێرنەوە، گرنگە لەهەوڵی زەمینە سازکردن بن بۆ ئەو هەدەفە، بە دروستکردنی یان پشتگیری کردنی دەوڵەتێك تێیدا عەدالەت پەیڕەو دەکرێ، هەر لەو بوارەوە مێژوو ئەزمونێکی ترمانی بۆ تۆمار کردوە کەزۆر گرنگە لێی بکۆڵینەوە.

سوڵتان (نورەدینی زەنکی) پەیوەندی هەبوو لەگەڵ کەسێکی نەسڕانی بەناوی (ملیح کوڕی لیونی ئەرمەنی) ئەو کەسە کەسێکی ناوداری نەسڕانی بوو، سوڵتان نورەدین توانی بەپارە ئەو کەسە بکڕێ و وەکو خزمەت کارێکی خۆی مامەڵەی لەگەڵ دەکرد، ئەو کەسە زۆر دوژمنی

بێزەنتی و ئەوروپییەکان بوو، سوڵتان نورەدین پشتگیری کرد لە ناوچەکانی (ئەدەنەو، مەصیصەو، تەرسوس) کەئێستا لەوڵاتی تورکیان و کاتی خۆی ئەو ناوچانە لەگەڵ چەند شارێکی تر ئەرمینیای بچوکیان پێك دەهێنا، مەلیحی کوڕی لیۆن توانی لەو ناوچانە ئیمارەتێك دروست بکات و خۆی تێیدا خاوەن دەسەڵات بێ، ئیمارەتەکە ئیسلامی نەبوو ئەو هێزەی سوڵتان نورەدین پشتگیری دەکرد ئەویش هێزێکی نەسرانی بوو، بەڵام سوڵتان نورددین دەیزانی ئەو ناوچەیە خۆی ناتوانێ بیپارێزی ئەگەر خزمەتکارەکەی نەیپارێزێ کە کابرایەکی نەسرانییە و هیچ هەڕەشە نییە بۆ سەر موسڵمانان، ئەوا ئەو کات هێزی خاچپەرستەکان و نەسرانییەکان ئەو ناوچەیە دەگرن و دەبنە هەڕەشەی ڕاستەو خۆ لەسەر ئەو موسڵمانانەی لەو سنورەدانە، ئینجا لەساڵی (٥٦٨) ڕۆمییەکان لە قوستەنتینییەوە هێزێکی گەورەی سەلیبییان نارد بۆ لەناو بردنی ئەو دەسەڵاتە نەسرانییەی کەهاوپەیمانە لەگەڵ موسڵمانان، بەڵام سوڵتان نورەدین سوپایەکی بۆنارد لەگەڵ سوپاکەی (ملیح کوڕی لیۆن) توانیان هێزی ڕۆمییەکان بشکێنن و زیانێکی گەورە بە نەسرانییەکان بگەیەنن، ئینجا ئەو کاتەی پرسیار لە سوڵتان نورەدین دەکرا، چۆن یارمەتی کەسێکی نەسرانی دەدەی و ئەو ناوچەیەی تەسلیم دەکەی کە نزیکە لەسنوری شاری (حەلەب) سوڵتان نورەددین دەیفەرموو: استعين به على قتال أهل ملته واريح طائفة من عسكري تكون بازائه لتمنه من الغارة على البلاد المجاورة له .... وكانت مدينة ادنة والمصيصة وطرسوس بيد ملك

الروم، صاحب القسطنطينية، فاخذها مليح منهم لانها تجاور بلادهم.[١]

واتە: سوڵتان نورەدین دەیفەرموو: ئەو کابرایە نەسرانییە بۆدژی خۆیان بەکاری دەهێنم ... ناوچەکانی (مەصیصەو، تەرسوس و، ئەددەنە لەدەست مەلیکی ڕۆم بوو، بەڵام ئەو پیاوە بەیارمەتی سولْتان نورەدین توانی لەدەست ئەوانی دەربێنێ و موسڵمانانیش لەو ناوچەیە حەسانەوە لەبەر ئەوەی هەڕەشەی ڕۆمییەکانیان لەسەر لاکەت، سوڵتان نورەدین بەئەزمونێکی زۆرەوە گەیشتۆتە ئەو جۆرە هەنگاوە لەبەر ئەوەی تەمەنی خۆی لە جیهادی سەلیبییەکان خەرجکرد، دورنییە ئێستا خەڵکێك هەبن ئەو ڕووداوە بخوێننەوە سوڵتان نورەدین کافر بکەن و بڵێن ئەوە وەلاو بەڕایە بۆکافرو نەسرانییەکان، بەڵام ئەوانە زیاتر دەرچوی فیقهێکی نەزەرین و لە واقیعدا کۆلەوارن، هەموو هەنگاوەکانیان بەبەرژەوەندی ئەهلی کوفر کۆتایی پێدێ، بەڵی سیاسەت کردن قورس ترین هەنگاوە لە سەردەمی ئەورۆمان، ئەگەر ئەو سیاسەتە حیکمەت و فیقهێکی مەقاصیدی لەگەڵ نەبێ دڵنیابن لەکاولکاری زیاتر هیچی تری لێنالوێ.[٢]

(١) الكامل في التاريخ (٩/ ٣٨٠).

(٢) بۆزیاتر زانینی ڕۆڵی محمود یەڵواج سەردانی ئەو سەرچاوانە بکەن (جامع التواريخ) ئەو بەشەی تایبەتە بە خەلیفەکانی جەنگیزخان. هەروەها کتێبی (تاريخ جهانكشاى) بەرگی دووەم وە کتێبی (تلفيق الاخبار و تلقيح الاثار في وقائع قزان و بلغار و ملوك التتار).

# سەرەتای دەسەڵاتی سوڵتان (سەیفەددین قەلاوون) کەنازناوی مەلیك مەنصوری پێدەدرێ

سەیفەددین قەلاوون دوای ئەوەی دەسەڵات لەکوڕەکەی زاهیر بێبرس دەسەنێتەوە، کێشەیەکی زۆر گەورەی هاتە پێش، ئەویش کێشەی (سنقر الاشقر)بوو، ئەو پیاوە سەرکردەیەکی ئازا بوو لەوڵاتی شام قبوڵی نەبوو قەلاوون سوڵتانی مەمامليك بێت، بۆیە وڵاتی شامی جودا کردەوە، کە ناچار سەیفەدین قەلاوون سوپایەکی گەورەی نارد و توانی شام بگێرێتەوە ژێر دەسەڵاتی خۆی، لەو کاتە ناسکە مەغۆلەکان بەدوو بەرەکی موسڵمانان دەزانن خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هێرشێکی زۆر گەورە بۆ سەر شام، بەڵام سەرکردە سەربازییەکانی شام و زاناو پیاو ماقوڵان دەکەونە نێوان (سنقر ئەشقەر و ناصرٍ قەلاوون)، دەتوانن صلح لەنێوان ئەو دوو سەرکردیە بکەن سنقر هەر لەشوێنی خۆی دەمێنێ و دان بەسوڵتان بوونی (ناصرٍ قەڵاوون) دەنێ، لەوکاتە هێزێکی مەغۆلەکان گەیشتبوونە نێو حەلەب و چەندین مزگەوتیان سوتاند و خەڵکێکی زۆری حەلەبیان کوشت، بەڵام سوپای موسڵمانان لەکاتی گونجاو دەگاتە سەر هێزەکەی مەغۆل دەتوانن زۆربەی ئەو مەغۆلانە بکوژن کە بەشداری ئەو هێرشەیان کردبوو زۆریش لەدیلەکان ڕزگار دەکەن، (ناصرٍ قەڵاوون) دەزانێ یەك ڕێزی مەغۆل و

نەسرانییەکان لەبەرژەوەندی موسڵمانان نییە بۆیە پەیمانێکی دە ساڵی لەگەڵ هێزە سەلیبییەکانی ناوچەکە واژۆ دەکات و دەستی بەتاڵ دەبێ بۆ مەغۆلەکان.

# جەنگی (حمص)
# ئەو کاتەی بەیعەت لەسەر مردن درا

دەوڵەتی مەمالیك كۆسپێكی زۆر گەورە بوون لەبەر دەم مەغۆل، چەند جارەكی شكەستی زۆر گەورەیان بەسەر مەغۆلەكان هێنابوو، لەساڵی (٦٨٠) كۆچی (منكوتمری) برای ئەبەقا كەهەردوكیان كوڕی هۆلاكۆن سوپایەكی گەورەی مەغۆل ئامادە دەكا، ژمارەكەی نزیكەی (١٠٠) هەزار كەس دەبێ، زۆربەی سوپاكەی پێك هاتبوون لە پیاوە ئازاو بەئەزمونەكانی مەغۆل، لەنزیك شاری (رستن)[١] دەكەونە بەرامبەر سوپای موسوڵمانان كە نزیكەی پەنجا هەزار كەس دەبوون بەسەرپەرشتی خودی سوڵتان (قەلاوون) زۆربەی سەركردە سەربازییەكان بەیعەت لەسەر مردن دەدەن و بەڵێن دەدەن پشت لەدوژمن نەكەن و گۆڕەپانی جەنگ بەجێ نەهێڵن، ئەو جەنگە یەكێكە لەجەنگە هەرە گەورەكان و هاوشێوەی عین جالوت و بێستان دەبێت ئیمام ابن كەسیر لەوەصفی ئەو جەنگە دەفەرمێ: جەنگێك بوو هاوشێوەی نەبوو، سەرەتا موسڵمانان دەكەونە ژێر هەڵمەتێكی زۆر توندی مەغۆلەكان و لای چەپی موسڵمانان دەشكێ و لای ڕاستی سوپای

(١) دەكەوێتە نێوان شاری (حەما) و (حمص) لەشاری (حمص) نزیكترە.

موسڵمانان بەتەواوی دەشڵەژێ، ئینجا فشاری مەغۆلەکان دەکەوێتە سەر ناوەڕاستی سوپاکە کە خودی سوڵتانی تێدابوو، ئەوەی خۆی ڕاگرت لەو شەڕە سەرەتا خودی سوڵتان بوو خۆی و تەنها هەزار کەس مانەوە و زۆربەی سوپاکە ڕایانکرد، ئاڵای موسڵمانان بەدەست چەند سوارچاکێکی زۆر ئازابوو لەپشتی سوڵتان وەستا بوون لەگەڵ چەندین کەس کە تەپڵی جەنگیان دەکوتاو دەنگی تەپڵەکان ئاماژە بوو بەوەی کەخودی سوڵتان سەلامەتەو سەنتەری ئەو سوپایە نەشکایە.

ئینجا سوڵتان لەگەڵ ئەو هەزار کەسەی لەگەڵی بوون، دەتوانن شکەستەکە بکەنە سەرکەوتن و هەڵمەتە گەورەکەی مەغۆل دەشکێنن، ئەو بەشەی سوپای موسڵمانان کەڕایان کردبوو بەشێکی زۆری مەغۆل سەریان لەدوو نابوون، موسڵمانان کەزانیان سەنتەری بڕیار نەکەوتوە و سوڵتان سەلامەتە زۆر بەیان گەڕانەوە، مەغۆلەکان ئەو جارەی کەوتنە نێوان دوو بەشی سوپای موسڵمانان کە بەماوەیەکی زۆر کەم توانیان ئەو بەشەی سوپای مەغۆل بەتەواوی بتوێننەوە.

## بریندار کردنی(منکوتمر) کوڕی هۆلاکۆ

یەکێك لەو پاڵەوانانەی لەگەڵ سوڵتان بوو، پیاوێکی زۆر ئازاو ڕەشید بوو بەناوی (حاجی عزالدین ئەزدەمور جەمەدار) ئەو پیاوە یەکێك بووە لەسەرکردە زۆر ئازاکان، ڕمەکەی سەراوژێر دەکات وەکو بڵێی هاتوە تەسلیم بەمەغۆلەکان بێت تاوەکو لە سەرکردەی مەغۆل (منکوتمر)تەواو نزیك

دەبێتەوە، ئینجا هێرش دەکاتە سەر (منکوتمر) دەتوانی بەسەختی بریندارى كـات، بەڵام دەوروبەرەكەی (منكـوتمر) هێرشـی دەكەنە سـەری و شـەهیدی دەكەن، بەبرینـــدار کردنـــی (منكـــوتمر) ســـوپای مەغۆلەكـــان بەتەواوی دەشـڵەژی و زۆری پینـاجێ مەغۆلەكـان دەشـكێن، بەڵام شـكانێكی زۆر گەورە نیـوەی سـوپاكە ڕادەكەن و ئەوەی تـر دەكـوژرێن، [1] شكەسـتەكەی مەغۆل ئەوەندە گەورەبوو كە هەواڵ دەگاتە ئەبەقا، ئەبەقا سەرهەڵدەگرێ و دەچێتە هەمەدان و زۆر نـیگەران دەبی بەو شكەسـتە گەورەیە، (منكـوتمر) یش بەبریندارى دەگەڕێتەوە جەزیرەی (بۆتان) لای دایكی بۆ چارەسەری برینەكەی، ئەو كات پیاوێكی لێبو بەناوی (قازی جمال الدین بن العجمیە) منكوتمر ژەهر خوارد دەكا و (منكوتمر) دەمرێ لەعنەتی خوای لەسەر بێ، بەڵام بەداخەوە كەسێك بەناوی (ابـن القرقـوی) بەوە دەزانـێ و هەواڵ دەداتە دایكی (منكوتمر) كەفڵانە كەس كوڕەكەی تۆی ژەهرخوارد كردوە، دایكی منكوتمر قازی جەمالەدین و منـاڵەكانی دەستگیر دەكاو بەدەستی خۆی گۆشـتاو گۆشـت سـەریان دەبـڕێ. (ولاحـول ولاقـوة الا باللـه العلـی العظیم). لەدوای مردنی (منكـوتمر) بەمـاوەیەكی كەم (ئەبەقـا)ش دەمـرێ لەعنەتی خوا لە خۆی و باوكی و باپیری بێت تاڕۆژی دوایی. [2]

---

(١) البداية والنهاية بەرگی ١٥ لاپەڕە ٤٩٤. كنز الدرر و جامع الغرر لاپەڕە ٢٤٤ بەرگی ٨.
(٢) كنز الدرر وجامع الغرر بەرگی ٨ لاپەڕە ٢٤٨.

سـولْتان (سـەیفەدین قەلاوون) شـێخەكی هەبـوو بەنـاوی (عبـدالرحمن) لەقسـەی شـێخەكەی دەرنەدەچـوو ئەوشـێخەش قوتـابی (موفـق الـدین الكواشی) بوو خاوەنی تەفسیری التلخیص فی تفسیر القران العظیم كە ناسراوە بەتەفسیری كەواشی، ئەو شیخە واتە شێخ عبدالرحمن چۆن جێی متمانەی سولْتان (سەیفەددین قلاوون) بوو لەهەمان كاتدا كاریگەرێكی زۆرچاكی بەسەر یەكێك لەخێزانەكانی هۆلاكۆ هەبوو كەدایكی (تەكودارە) دیارە ئەو كوڕەی هۆلاكۆ هەر كەبچوك بووە دەبێتە موسلْمان بۆیە لەدوای مردنی (ابقا و منكوتمر) ئەو دەبێتە سولْتانی ئیلیخانییەكان ناو لەخۆی دەنێ احمد .

## سوڵتان احمد تەكودار كوڕی هۆلاكۆ (٦٨١-٦٨٣) كۆچی

(ئەبەقاخان)ی كوڕی هۆلاكۆ نیازی وابوو كوڕەكەی (ارغون) لەدوای خۆی بچێتە سەر كورسی دەسەڵات، بەڵام ئەوە لەگەڵ یاسای جەنگیزخان نەدەگونجا لەبەر ئەوەی (تكودار)ی برای هێشتا لەسەر ژیان مابوو، سەركردە سەربازییەكانی مەغۆل دەسەڵات تەسلیم بە (تكودار) دەكەن، تەكودار بەرلەوەی ببێتە موسلْمان نەسڕانی بو لەبەرئەوەی دایكی واتە خێزانی هۆلاكۆ نەسڕانی بو، بەڵام دواتر دەكەوێتە ژێر كاریگەری شێخێكی صۆفی بەناوی كمال الدین عبدالرحمن الرافعی و واز لەنەسڕانییەت دێنێ و دەبێتە موسلْمان.

سـەرەتای کارەکـانی بەوە دەسـتپێدەکات وەفـدێك دەنێـرێ بـۆ سـوڵتان (قەلاوون) و پێـی دەڵـێ، کە مـن بەفەزڵـی خـوای گەورە زۆردەمـێکە موسـڵمان بـویمە حەز نـاکەم خـوێنی موسـڵمانان بـڕژێ، سـوڵتان قەلاوون داواکەی قبـوڵ دەکـاو دڵـی موسـڵمانان زۆر خـۆش دەبـێ بەموسـڵمان بـونی سـوڵتانی مەغـۆل و کۆتـایی ئەو جەنـگەی کە چەنـد سـاڵێکە بەردەوامە، سـوڵتان (احمـد) هەر لەسـەرتای دەسـەڵاتییەوە چەنـد هەنگـاوێکی نـا بـۆ بڵاوکـردنەوەی ئیسـلام لە نێـو مەغۆلەکـان بـۆ نمـونە کڵێسـەیەکی گەورەی نەسـڕانییەکانی ڕووخانـد لە تەبرێـز، فشـاری خسـتە سـەر نەسـڕانی و بوزییەکان و نامەی نارد بۆ بەغداو شوێنەکانی تر و داوای لێکردن ئیسلام بگێڕنەوە بۆ شوێنەکان.

سوڵتان احمد نیازی زۆر پاك بوو، بەڵام کەسەیری هەنگاوەکانی دەکەی پەلەکـردن و نـاحیکمەتییێکی پێـوە دیـار بـو بـۆ گەیشـتن بەئامانجەکـانی، بۆنمونە هێرش کردنە سەرشام بڕیاری (قوریلتای) لەسەر بوو بەڕەزامەندی (قوبلای خان) کە خانی گەورەی مەغۆل بوو، شکاندنی ئەو بڕیارە خراپ قـۆزرایەوە لەلایەن (ئەرەغـۆن)ی بـرازای، تاگەیشتە ئەو ڕادەیەی ئەرەغـۆن تـوانی سـوپایەکی گەورە ئامـادە بکـات و لەدەسـەڵاتی مـامی دەربچـێ و ڕایگەیانـد کە (تکـودار)ی مـامی بـۆتە موسـڵمان و بڕیـاری (قوریلتـا)و (خانی گەورە)ی شکاندوە و وەفدی ناردۆتە لای دوژمنێکی وەکو سوڵتان (قـلاوون) و داوای صـولحی لێکـردوون لەکاتێکـدا قەلاوون دەسـتی هەبـووە

لەکوشتنی هەزاران سەرباز و سەدان سەرکردەی مەغۆل، بەو قسانە زۆر لەسەرکردەکانی مەغۆل پشتگیری خۆیان دەڕبڕی دژ بە (سوڵتان احمد).

سوڵتان احمد کە بەوە دەزانێ، سوپایەك ئامادە دەکات و دەتوانن سوپاکەی (ئەرەغۆن) بشکێنن و خودی (ئەرەغۆن) یش دەستگیر بکەن، هەندێك لەپیاوە نزیکەکانی سوڵتان احمد داوایان کرد کە تازووە ئەرەغۆن بکوژێ لەبەرئەوەی دوژمنێکی گەورەیەو هێشتنەوەی هەڕەشەیەکی گەورەیە، بەڵام هەندێکی تر گوتیان برازای خۆتە و هەوڵبدە لەخۆتی نزیك بکەیتەوە، سوڵتان بەقسەیان دەکا و ئازادی دەکا.

(ئەرەغۆن) لەوماوەیە زۆر نزیك دەبێتەوە لەسەرکردە سەربازییەکان بەتایبەت ئەوانەی موسڵمان نەبوینە و پێیان دەڵێ ئەگەر سوڵتان احمد لەسەر حوکم بمێنێ دەبێتە هەڕەشە لەسەر خودی بنەماڵەی جەنگیزخان لەبەر ئەوەی، سوڵتان احمد خەریکە دەسەڵات تەسلیم بەموسڵمانان دەکا، بۆیە لەساڵی (٦٨٣) لەگەڵ چەند سەرکردەیەکی سەربازی هەڵدەکوتنە سەر سوڵتان احمد و دەیکوژن، ئینجا هەر ئەو سەرکردە سەربازییانە دەستدەکەن بەکوشتنی ئەوانەی لە سوڵتان احمد نزیکن و بەیعەت دەدەن بە (ئەرەغۆن).[1] سوڵتان احمد بە کودەتایەکی سەربازی لەناوچوو، بەڵێ گەیشتە لوتکەی دەسەڵات، بەڵام نەیتوانی حەکیمانە ئەو دەسەڵاتەی بەکاربێنێ سەرەتا بە لەناوبردنی ئەو سەرکردە سەربازیانەی دوژمنی

(١) کنز الدرر و جامع الغرر بەرگی ٨ لاپەڕە ٢٦٦.

موسڵمانان بون و هەڕەشە بوون بۆ خودی دەسەڵاتەکەی، ئەگەر بەراوردێك بکەیـن لەنێـوان سـوڵتان احمـد و بنەمـاڵەی محمـود یەڵـواج، ئەو کـات ڕونـدەبێتەوە کە سیاسـەت کـردن و حیکمەت لەهەنگاوەکـان چەنـدە گـرنگە، سوڵتان احمد لەماوەی سێ ساڵ کە سوڵتانی ئێلیخانییەکان بوە، بەهەندێ هەنگاو خەریك بووە، کە بەحیسابی خۆی بۆ خزمەتی ئیسلام بوە کەچی هەمـوو ئەو هەنگـاوانە بـۆتە هۆکـاری کۆبـونەوەی دوژمـنەکـانی، واتە ئەو مەبەسـتی خـزمەت کردنـی ئیسـلام بـوو، بەڵام هەنگاوەکـانی بـۆ ئەو خزمەتکردنە هەڵە بو، بۆیە کۆتایی بەوشێوەیە هات.

## (ئەرەغۆن)ی کوڕی ئەبەقا (٦٨٣-٦٩٠) کۆچی

ئەرەغۆن هەر لەسەرەتای دەستبەکاربونی کەوتە ستەمکردن لەموسڵمانان، سـەردەمی ئەرەغـۆن سـەردەمی پـڕ لەمیحـنەت بـوو بـۆ موسـڵمانان، سـێ هۆکار هەبوون هۆکاری دژایەتی کردنی ئەرەغۆن بوون بۆ موسڵمانان.

یەکەم: لەبەر ئەوەی ئەرەغۆن نەسڕانی بوو دژایەتـی موسـڵمانانی بەدیـن دەزانی.

دووەم: پێی وابوو موسڵمانان خۆیان بەخاوەنی (سـوڵتان احمـد)ی مـامی دەزانـن، چـاوەڕوانی هەلێـك دەکەن بـۆ ئەوەی تـۆڵەی (سـوڵتان تکـودار) بکەنەوە.

سـێیەم: کـاریگەری دکتـۆرێکی جـولەکەی بەسـەر بـوو، کەنـاوی (مردخای) بـوو ناسـراو بە(سعد الدولـة) خـاڵی یەکەم و دووەم ڕوونە، بەڵام

خاڵی سێیەم زۆر گرنگە تیشکی بخەینە سەر.

## دەرکەوتنی(سعد الدولة)

سەعد دەولە (مەردەخا)ی دکتۆرێکی زیرەکی جولەکە بوو، لەو لێژنەیە بوو کە سەرپەرشتی باری تەندروستی ئەرەغۆنی دەکرد، جارەکیان ئەرەغۆن نەخۆش دەبیٚ و لەدوو (مەردەخای) دەنێرن بۆ چارەسەری، ئەودکتۆرەش دەرمان لەگەڵ خۆی دەباو دەچێتە لای (ئەرەغۆن) و سوڵتان بەدەرمانەکان چاك دەبێتەوە، ئالەو کاتەدا پەیوەندێکی زۆر خۆش لەنێوان (ئەرەغۆن) و مەردەخای دروست دەبیٚ، تا دەگاتە ئەو ڕادەیەی ئەرەغۆن لەزۆر بەی کارەکانی پرس و ڕای پێدەکرد، ئەو جولەکەیە دەتوانیٚ زۆر حەکیمانە متمانەی (ئەرەغۆن) بەدەست بێنیٚ، بۆیە جارەکیان بەسوڵتان دەڵیٚ قوربان بیستومە گەندەڵیەکی یەکجار زۆر لەعێراق هەیەو پارەیەکی یەکجار زۆر دەدزریٚ و ناگاتە خەزێنەی دەوڵەت، ئەرەغۆن بڕیار دەدا و دەیکاتە بەرپرسی دارایی لەعێراق.

(سعد الدولة) بەپارەیەکی یەکجار زۆر دەگێریتەوە بۆ خەزێنەی دەوڵەت، ئەرەغۆن کە ئەو جیاوازیە دەبینیٚ لەو پارەیە، لەگەڵ ئەوپارانەی کەپێشتر بۆی دەهات، هەندەی تر متمانە بە (سعدالدولة) دەکات و دەیکاتە بەرپرسی عێراق و پێی ڕادەگەیەنیٚ کە دەستتکراوەیە لەو بڕیارانەی کە دەیدەی، (مەردەخای) سەرەتا نەخشەیەکی چاکسازی دەکێشیٚ کە تێدا داوای کردبوو ئەو هەنگاوانە جێبەجیٚ بکریٚ ئەو نەخشەیە وەکو

هەنگاویکی سەرەتای بوو ویستی لای ئەو خەڵکە خۆی خۆشەویست کا، نەخشەکە بریتی بوو لەو خاڵانە.

یەکەم: دەبێت کێشەکان بەپێی شەریعەتی ئیسلامی یەکلایی بکرێتەوە

دووەم: دەبێت دادوەری بەشێوەیەکی تەواو جێبەجێ بکرێ و کەس گەورەتر نییە لەدادوەری.

سێیەم: نەهێشتنی ستەم و گێڕانەوەی ئەو مافانەی کەخوراون.

چوارەم: کەس بێ بەش نەبێ لە بەخشین و صەدەقات.

بۆ ماوەیەکی کاتی ئەو خەڵکە هەستیان بەگۆڕانکارێکی زۆر چاککرد و جۆرێك لەئەمن و ئەمان ناوچەکانی گرتەوە، ئینجا (مەردەخای) دەستی کرد بە جێبەجێ کردنی پلانەکەی، سەرەتای پلانەکەی کەس و کارەکانی خۆی نزیك کردەوە لە سەنتەری بڕیار، بۆنمونە برایەکی هەبوو بەناوی (فخر الدولة) کردی بەوالی بەغداد، برایەکی تری هەبوو کردی بەحاکمی (دیاربکر و ڕەبیعە)، کەسێکی نزیکی خۆشی بەناوی (لەبید) کردە والی ئازەربایجان، وە کەسێکی تری نزیکی خۆی بەناوی (شمس الدین) کردە والی فارس، ئینجا دەستی کرد بەدەرکردنی هەموو ئەو موسڵمانانەی لە سەنتەری بڕیار نزیك بوون لەدەوڵەتی ئیلیخانی.

لەدوای ئەو هەنگاوە دەستی کرد بەپێشنیارە ترسناکەکەی ئەویش داگیر کردنی (کەعبەی پیرۆز) و کردنی بەپەرستگایەك بۆ بت(صەنەم) پەرستن، بۆئەوەی موسڵمانان لەپەرستنی خوای گەورە دوور بخاتەوە و ببن بە

بت(صەنەم) پەرست، ئینجا لیستێك بۆ زۆربەی ویلایەتەكان دەنێری كە ناوی دەیان زاناو كەسی دیاری موسڵمانی تێدا بوو بۆ كوشتن، داوای لە جولەكەكان كرد خۆیان ئامادەبكەن و بەشداری ئەو سوپایە بكەن كەبۆ داگیركردنی كەعبە دەكەوێتە ڕێ.

لەهەمان كاتدا زۆرێك لەومەغۆلانەشی لەسەنتەری بڕیار دورخستەوە كە لەگەڵ پلانەكەی ئەو نین بەم كارانەشی تەواوی موسڵمانان و زۆر لەسەركردە دور خراوەكانی مەغۆل بوون بەدوژمنی ئەو جولەكەیە.

لەو بەینە(ئەرەغۆن) نەخۆش دەكەوێ، زۆربەی دكتۆرەكان بێ ئومێد دەبن لەچارەسەری بۆیە هەندێك لەسەركردەكانی مەغۆل كە دەزانن ئەرەغۆن دەمرێ و بەر لەوەی سوڵتانێكی تر دیاری بكرێ، هەڵدەكوتنە سەر(سعدالدولة) و دەیكوژن، ئینجا ئەو كاتەی (ئەرەغۆن) لەسەر جێگا كەوتووەو چاوەڕوانی مردن دەكا پرسیار دەكا، كوا سعدالدولة؟ دەوروبەرەكەشی پێی دەڵێن بەچەند كارێك خەریكە ئەرەغۆن دەزانێ كە (سعدالدولة) كوژراوە، بەڵام هیچی پێناكرێ.

لێرەدا زۆر گرنگە لەو خاڵە ورد ببینەوە خۆ ئەگەر بكرێ و لەسەنتەری بڕیار نزیك ببیتەوە و بتوانی لەپێناو خواو خزمەتی شەریعەت بیقوزیەوە كارێكی زۆر پیرۆزە لەهەمان كاتدا چۆڵكردنی سەنتەری بڕیار بۆ خەڵكانیكی وەكو (سعدالدولة) چەندە زیان بەخشە.[1] بۆیە گرنگە

---

(١) لاپەڕە ٢٤٤ كتێبی تاريخ المغول العظام الاليخانيين.

خـوێنەری بەراوردێـك بكـات لەنێـوان هەوڵـی ئەو جـولەكەیەو هەوڵەكەی محمـود یەڵـواج ئینجـا دەزانـێ چـۆڵكردنی مەیـدانەكە لەو حاڵەتـانە چ زیانێكی گەورە بەموسڵمانان دەگەیەنێ.

## ئەرەغۆن و هەوڵەكانی بۆدروستكردنی بەرەیەكی نەسرانی مەغۆلی.

ئەرەغـۆن ڕقێكـی زۆری لەدڵ بـوو بەرامـبەر بە موسـڵمانان، لەهەمـان كاتیشدا دەیزانی ناتوانێ بەتەنها وەكو دەوڵەتی ئێلیخانی هێرش بكاتە سەر دەوڵەتی مەمالیك.

بۆیە هەوڵێكی زۆری دا بۆئەوەی نەسرانییەكانی خۆرئاوا بهێنێتە سەر خەت و بەرەیەكی (مەغۆلی نەسرانی) دروست بكات بۆ هێرش كردنە سەر دەوڵەتـی مەمالیـك، نەخشـەكەی ئەرەغـۆن بەو شـێوەیە بـوو، مەغۆلەكـان و نەسرانییەكان پێكەوە هێرش بكەنە سەر وڵاتی شام، مەغۆلەكان ڕاستەو خۆ بـۆ دیمەشـق بـكەونە ڕێ سـەلیبییەكانیش هێـرش بـكەنە سـەر (عەككـاو دومیـات)، بـۆ گەیشـتن بەو ئامـانجە چەنـد نـامەیەكی بـۆ پادشـاكانی ئەوروپـاو خـودی پاپـا نـارد، بۆنمـونە لەسـاڵی (٦٨٤) نـامەیەكی بـۆ پاپـا (هونوریـوس)ی چـوار ڕەوانەكـرد و هەمـان پێشـنیاری بـۆ كـرد، بەڵام لەبەر ئەوەی جیهـانی نەسـرانی بەچەنـد كێشـەیەكی نێـو خـۆیی خەریـك بـوون نەیانتوانی بەشداری ئەو نەخشەیەی (ئەرەغۆن) بكەن.

لەساڵی (٦٨٦) بۆ جارێکی تر ئەرەغۆن سەفیرێکی خۆی دەنێری بەناوی (رابان صوما) ئەو پیاو دەچێتە فەرەنساو زۆربەی دەوڵەتە ئەوڕوپییەکان دەکا، بەڵام بەبێ ئامانج دەگەڕێتەوە و ناتوانێ پشتیوانی پادشاکانی ئەوروپی بەدەست بێنێ و بیناهێنێتە نێو پیلانەکەی خۆی، لەبەر ئەوەی جیهانی نەسرانی بەچەند کێشەیەکی نێو خۆیی خەریك بوون.

# دەرکەوتنی دەوڵەتی عوسمانی

خــوای گەورە ئەگەر دەرگــایەك بەحــیکمەت دابخــا هەزاران دەرگــا بەڕەحمەت دەکاتەوە، هێرشی مەغۆل بۆ سەرجیهانی ئیسلامی ناخۆشترین و سەختترین قۆناغ بوو دوای وەفاتی پێغەمبەری خۆشەویست (صلی الله علیە و سلم) کەئەو ئوممەتە پێی تێپەڕی، ئەوەی ئاگاداری وردەکاری ئەو قۆناغەبێ بۆی ڕون دەبێتەوە کە خوای گەورە ئەو ئوممەتەی بە دوا ئوممەت هەڵبژاردوەو مەشیئەتی لەسەر مانەوەی ئەو ئوممەتە یەو هیچ هەوڵێك بۆ لەناو بردنی ئەو ئوممەتە سەرناگرێ، موسوڵمان بوونی زۆرێك لەمەغۆلەکان و شکەستی مەغۆل لە جەنگی (عەین جالوت) و لە (دایك بوونی دەوڵەتی عوسمانی) هەموو ئەوانە دەرگای ڕەحمەت بوون لەو کات و ساتە ئاڵۆزو پڕ لەمەینەتە بەڕووی ئەو ئوممەتە کرایەوە.

لەو قۆناغە جیهانی ئیسلامی پێویستی بەدەوڵەتێکی ئیسلامی بوو، لە قۆناغی خۆ پاراستن بەرەو قۆناغی جیهاد و هێرش کردنە سەر ناحەزانی بیبات، پێویستی بەڕۆحێکی تازە بوو بکرێتە جەستەی ئەو ئوممەتە شەکەت و ماندووە، میحنەتەکانی بیر باتەوەو دروشمی جیهادی بۆ بەرزبکاتەوە، دەوڵەتی مەمالیکەکان تاڕادەیەکی زۆر بەتایبەتی سەردەمی

(قوتزو بێبرس و قلاوون) توانیان شەوکەتی مەغۆل و خاچپەرستەکان بشکێنن، بەڵام ئەو دەوڵەتەش وەکو باقی دەوڵەتەکانی تر، بەکێشە ناوخۆییەکان دەینالاند.

لەسەرتای سەدەی حەوتی کۆچی و دەتوانین بڵێین لەساڵی (٦١٧) چەند هۆزو عەشیرەتێکی تورکە موسڵمانەکان لەترسی مەغۆلەکان شوێنی خۆیان بەجێهێشت کە ناوەڕاستی ئاسیا بوو ئێستا دەکەوێتە وڵاتانی (ئۆزباکستان و، تورکمانستان و، کازاخستان و، تاجیکستان و، قیرغیزستان) هاتن بەرەو کوردستانی باکور و ناوچەی ئەنادۆڵ، دوای ماوەیەك مانەوە لەو ناوچەیە زۆر لەو قەبیلەو هۆزە تورکیانە گەڕانەوە کەزانیان تۆزە ئەمانێك گەڕاوەتەوە مەملەکەتەکەیان، چەند هۆزێکیش بەسەرپەرشتی (ئۆرتوغرل کوڕی سلیمان) لەناوچەکە مانەوەو نەگەڕانەوە شوێنی خۆیان، ئەو کات ناوچەی کوردستانی باکور ئەنادۆڵ لەژێر دەسەڵاتی سەلجوقییەکان بوو، بەقەدەری خوای ڕۆژێکیان (ئۆرتوغرل) و چەند سوارچاکێکی هۆزەکەی لەناوچەکە دەسوڕانەوە بینیان دوو سوپا لەشەڕدان یەکیان سوپای سەلجوقییەکانە بەسەرپەرشتی خودی سوڵتانی سەلجوقی (علاءالدین)ی سەلجوقی ئەوەی تر سوپای بێزەنتییەکان بوو، ئۆرتوغرل و پیاوەکانی کەبینیان سوپای سەلجوقییەکان خەریکە بەرەو شکان دەڕوات هاتنە هانایان و چونە ڕیزی سەلجوقییەکان و کاریگەرێکی زۆر گەورەیان هەبوو لەشکاندنی هێزی بێزەنتییەکان، دوای شکانی هێزی بێزەنتییەکان

سولْتان (علاءالدين سەلجوقی) سوپاسی ئۆرتوغرل و پیاوەکانی کردو ناوچیەکی پێدان لە خۆرئاوای ئەنادۆڵ کە دەکەوتە سەرسنوری بێزەنتییەکان لەنزیك شاری (بروسە)ی ئەو کات کەئێستا پێی دەگوترێ (اسكی شهر) .

ئەوە بەسەرتای دروست بوونی دەوڵەتی عوسمانی هەژمار دەکرێ کە دواتر بەچەند قۆناغێك دەبێتە باوەشیکی گەرمی موسڵمانان و چەند گروپێکی چەکداری جیهادی پەیوەندی بەو دەوڵەتە دەکەن و وردە وردە بونی خۆی دەسەپێنێ.

لێرەوە دێینە کۆتایی ئەو بەشەو بەخوێنەری خۆشەویست ڕادەگەیەنین کەچەند خۆشەویستێك داوایان کردوە تەواوی مێژوو بنوسینەوە، پێشنیارەکەی ئەو برایانەمان قبوڵ کردو دەشزانم ئەوە پرۆژەیەکی زۆر گەورەیە، بەڵام ئەگەر عومری ئەمانەت باقی بێ و خوای گەورە بەرەکەت بخاتە کات و تەمەنمان دەتوانین ئەو پرۆژەیە تەواو بکەین، لەبەشی داهاتوو دەگەڕێینەوە سەر ژیاننامەی ئەبو بەکری صدیق ڕەزاو ڕەحمەتی خوای گەورەی لەسەربێ، لەو کاترا دەست دەکەیین بە نوسینەوەی مێژووی پڕ سەروەرییەکەی خیلافەی ڕاشیدە و دواتر دەوڵەتی ئومەوی و عەبباسی و بەو شێوەیە تا کاتی هێرشی مەغۆل ئینجا سەرەتای سەرهەڵدانی دەوڵەتی عوسمانی.

## نەخشەی ژمارە (١)




لەسەردەمی مەمالیکەکان بازرگانە تورك و ئەرمەنی و روسەکان بەو ڕێگایانە کۆیلەکانیان دەهێنایە میسر و لەوێ دەفرۆشران و ئینجا وەکو جەناگاوەر ئامادە دەکران بۆجەنگ بەتایەبەت جەنگی خاچپەرەستەکان

## نەخشەی ژمارە (٢)



نەخشەی ژمارە (٣)






نەخشەی ژمارە (٥)




نەخشەی ژمارە (٦)




نەخشەی ژمارە (٧)




نەخشەی ژمارە (٨)

نەخشەی ژمارە (٩)



## نەخشەی ژمارە (١٠)






نەخشەی ژمارە (١١)

## نەخشەی ژمارە (١٢)



## نەخشەی ژمارە (١٣)






نەخشەی ژمارە (١٤)

## نەخشەی ژمارە (١٥)



## نەخشەی ژمارە (١٦)






نەخشەی ژمارە (١٧)

## نەخشەی ژمارە (١٨)






نەخشەی ژمارە (١٩)



نەخشەی ژمارە (٢٠)


هێرشی مەغۆل بۆ سەر مەیافارقین و دیار بەکر
هولاكو ميافارقين أوائل سنة ٦٥٨ هـ بمساعدة
من الكرج والأرمن، والذين ساعدوه بالقيام بمذبحة
في السكان المسلمين.
آسيا الصغرى
سلاجقة الروم
ميافارقين
ديار بكر
( آمد )
ماردين
نصيبين
حران
الرها
حلب
الأيوبيون
الموصل
أربيل
ملاذكرد
وان

مەیا فارقین

## مەنگۆلیا


Polen
Weißrussland
Ukraine
Moskau
Москва
Österreich
Tschechien
Ungarn
Serbien
Bulgarien
Griechenland
Istanbul
Schwarzes Meer
Türkei
Georgien
Aserbaidschan
Syrien
Israel
Jordanien
Irak
Ägypten
Sudan
Eritrea
Rotes Meer
Saudi-Arabien
Jemen
Arabischer Golf
Vereinigte Arabische Emirate
Oman
Iran
Turkmenistan
Usbekistan
Kasachstan
Astana
Астана
Afghanistan
Tadschikistan
Kirgisistan
Pakistan
Mumbai
Neu-Delhi
Indien
Nepal
Bhutan
Bangladesch
Myanmar (Birma)
Laos
Thailand
Kambodscha
Vietnam
Andaman-See
Golf von Thailand
Nowosibirsk
Новосибирск
Krasnojarsk
Красноярск
Mongolei
China
Peking
北京

هێرشی مەغۆل بۆ سەر جیهانی ئیسلامی



هێرشی مەغۆل بۆ سەر شاری بەغدا



شاری بوخارا


Usbekistan
Turkmenistan
Kirgisistan
Tadschikistan
XINJIANG
Taschkent
Samarkand
Buxoro
Navoiy
Qarshi
Türkmenabat
Duschanbe
Bischkek
Almaty
Aşgabat
Maschhad
Kabul
Herat
Nukus
Urganch
Xiva
Mary
Termiz
Kunduz
Osch
Andijon
Schymkent
Taras
Kaxgar
Aksu
Qysylorda

# سەرچاوەکان

١- قورئانی پیرۆز
٢- فتح البارى بشرح صحيح البخارى
٣- الاعلاق الخطيرة في ذكر امراء الشام والجزيرة، محمد بن علي ابن شداد
٤- الانوار النعمانية نعمة الله الجزائري
٥- المختصر في اخبار البشر، عمادالدين اسماعيل ابي الفداء
٦- النجوم الزاهرة في ملوك مصر والقاهرة، يوسف بن تغري بردي
٧- تاريخ ابن فرات، ناصرٍ الدين محمد بن عبدالرحيم بن الفرات
٨- تاريخ ابن الوردي، زين الدين عمر بن مظفر
٩- تاريخ الاسلام، محمود شاكر
١٠-تاريخ الاسلام ووفيات المشاهير والاعلام، شمس الدين محمد بن احمد بن عثمان الذهبي
١١-تاريخ الخميس في احوال انفس نفيس، حسين بن محمد بن الحسن الدياربكري
١٢- جامع التواريخ، رشيدالدين فضل الله الهمذاني
١٣- شذرات الذهب في أخبار من ذهب، ابن العماد الحنبلي الدمشقي
١٤- صبح الاعشى، ابي العباس احمد القلقشندي
١٥- طبقات ناصرٍي، القاضي منهاج السراج الجوزجاني
١٦- عقد الجمان في تاريخ اهل الزمان، بدرالدين محمود العيني

١٧- فوات الوفيات والذيل عليها، محمود بن شاكر الكتبي
١٨- تاريخ الادب العربي، كارل بروكلمان
١٩- بلدان الخلافة الشرقية، كي لسترنج
٢٠- كنز الدرر وجماع الغرر، ابو بكر عبدالله بن ايبك الدواداري
٢١- مجالس المؤمنين، نورالله المرعشي التستري
٢٢- مجمع الاداب في معجم الالقاب، ابن الفوطي الشيباني
٢٣- مراة الجنان وعبرة اليقظان، ابو محمد علي بن سليمان اليافعي
٢٤- مفرج الكروب في اخبار بني أيوب، جمال الدين محمد بن سالم بن واصل
٢٥- نهاية الارب في فنون الادب، شهاب الدين احمد بن عبدالوهاب النويري
٢٦- الحوادث الجامعة والتجارب النافعة في الماءة السابعة، ابن الفوطي الشيباني
٢٧- العسجد المسبوك، الملك الاشرف الغساني
٢٨- الفخري في الاداب السلطانية والدول الاسلامية، محمد بن علي بن طباطبا المعروف بابن الطقطقا.
٢٩- المغول في التاريخ، فؤاد عبدالمعطي الصياد.
٣٠- بلاد الترك في العصور الوسطى، الدكتورة زبيدة عطا
٣١- تاريخ الحملات الصليبية، ستيفن رانسيمان
٣٢- تاريخ مجموع النوادر مما جرى للاوائل والاواخر، شهاب الدين قرطاى الخزندارى.
٣٣- خلاصة الذهب المسبوك مختصر من سير الملوك، عبدالرحمن سنبط قنيتوا الاربلى
٣٤- زبدة الفكرة فى تاريخ الهجرة، ركن الدين بيّبرس المنصورى الدوادار.

٣٥- سيرة جلال الدين منكبرتي، محمد بن احمد النسوى

٣٦- جنكيز خان فاتح العالم، الصاوى محمد الصاوى

٣٧- مختصر التاريخ، ابن الكازروني

٣٨- تاريخ المغول منذ حملة جنكيز خان حتى قيام الدولة التيمورية، عباس اقبال

٣٩- الكامل في التاريخ، عز الدين ابن الأثير.

٤٠- البداية والنهاية، أبو الفداء إسماعيل بن عمر بن كثير

٤١- المواعظ والاعتبار بذكر الخطط والآثار، أحمد بن علي بن عبد القادر، أبو العباس الحسيني العبيدي، تقي الدين المقريزي.

٤٢- قصة الحضارة ول ديورانت .

٤٣- الاسلام منذ نشوئه حتى ظهور السلطنة العثمانية، كلود كاهن

٤٤- ئەمانەو چەندین سەرچاوەی ترکە لە شوێنی خۆی ئاماژەمان پێکردوە.

# ناوەڕۆك